نووسینی : د . مایکل هارت





وەرگێرانی :

ئەسعەد قەرەداغی

له بلاوكراوەكانی پرۆژەی هاوسەر (٤٨)

**نووسینی: دكتۆر «مایكڵ هارت»**

**وەرگێڕانی :**

**ئەسعەد قەرەداغی**



**پیاچوونەوەی : ئەحمەد قەرەداغی**

چاپی دووەم ١٩٩٠

... «بەناوی خوای بەخشندەومیهرەبان» ...

## – بەربورە –

**خوێنەری هێژا :**

دەمێکە ئەم قسەم بیستوە... خوێندومەتەوە کە دەڵێت: زۆر کەس کە پەڕاو دادەنێن یان وەریـدەگێڕن کارێکی گرانە، بەڵام بەربورە نووسینی گرانترە. جا منیش لێرەدا هەندێك قسەم هەیە پێشەکی بیکەم بەر لە خوێندنەوەی ناوەڕۆکی ئەم پەڕاوە بە ئومێدم کە سەرکەوتووبم‌و توانیبێتم لەم ڕۆژنەوە مافی خۆی بدەمێ.

ئەوەی مەردوم‌و بیرمەندانی لە ژیاندا هاژو سەرسام کردبێت هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستاو لەمەودوایش... مرۆڤ خۆیەتی، هەروەکو فیزیکزانەکان کە بە دەست (ماددەووزە)ەوە هەر لە مێژەوە تا ئەمڕۆ گیرۆدەبوون‌و دەڵێن هێشتا لە کوێانەو ڕێگە فراوان‌و بەرینە هەتاهەتایە بۆ دۆزینەوەی لێکۆڵینەوەی مەزنتر.. ئاوایش مرۆڤ مادەی ڕەبازو لێکۆڵینەوەیە. زانستی مێژووو دەروون‌ناسی‌و کۆمەڵایەتی‌و فەلسەفە لە کۆن‌و نوێدا نەگەیشتونەتە ئەوەی بە – تەواوی – پەی بە مرۆڤ بەرن‌و سنورێك دیاری‌بکەن بۆ هەڵسوکەوت‌و ڕەوشتەکانی. کە دەیشڵێم – بەتەواوی‌نا – مانای ئەوەیش نیە کە هەنگاوی گەورە گەورە لەم بوارەدا نەنرابێت.

سەمەرەیە...!! مروڤێك بە تێكڕای تەمەنێكی كورتی (٧٠ – ٨٠) ساڵە بە بارستاییەكی (٥٠ – ٨٠) كیلۆگرام ئەو كردارەی لیَ ی دەوەشێتەوەو ئەو بیرانەی دەریدەبڕێت لە هەڵوێستی ڕۆژانەیدا ئەگەر بە هەر پێوەرێك چاك ناوببرێن یان خراپ لەم پەڕی دنیادا بێت یان لەوپەری... گوندەكی بێت یان شاری... خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار... لەم هۆزە بێت یان لەو نەتەوە... لەم تیرەو خێڵە بێت یان لەو گەلەو بەهەر زمانو ئاخاوتنێك بدوێت، پلەو پایەو جیاوازی لە هەر باریكدا... هەموو ئەمانە سروشتی مروڤ دەگرنەوە لە بارێكی پانوپۆڕو بەریندا‌و زاناكان تێروتەسەل ئەم سروشتە یان بۆ ناهۆنرێتەوە.

لەمێژە... بناغەیەك دانراوە بۆ پەیڕەوی مروڤایەتیو لەم سەدەی بیستەمەیشدا كراوە بە یاسا لە جیهاندا بە تایبەتی گەلە چەوساوەكان دەیڵێنو دەیڵێنەوە، بەڵام وولاتە ئیمپریالیستەكانو ڕژێمە چەوسێنەرەكانو دەزگا توقێنەرەكانیان كاتێك بۆ مرۆڤایەتی دەكروزێنەوە كە بۆنی ئەوە بكەن لە بەرژەوەندیان بدرێتو بۆ مەبەستی گڵاوی خۆیان جار بە جارێك دەنگیان بۆ مافی مرۆڤ بەرز دەبێتەوە. بە پێوەری ئەو بناغە هەموو كەس مافی ژیانی هەیەو نابێت بچەوسێنرێتەوە هەڵگری هەر باوەڕێك یان ئایینێك بێتو لە هەر گەلێك بێت. ئەم پێوەرە ئاواتی هەموو دڵچاكو خێر خوایەكە لە هەموو سەر ڕووی زەوی، وەنەبێت ئەم قسە قسەی ئەمڕۆیش بێت بەڵكو لە گزنگی مێژووەوە چەكەرەی ئەم بیرانە خێزاون.

كیَ هەیە؟ – با بە دەم گەزافی تر لیَ بدات – دڵی دانەخورپابێتو دەروونی گەشو ڕووناك نەبێتەوە كاتێك فەرموودەكانی حەزرەتی

پێغەمەر موحەممەد (د. خ) و (عیسا) و (موسا)و پێغەمەرانی تر درودی خوایان لێ بێت بەرگوێ دەکەوێت... کێ هەیە پیاوخاسانی وەك لوقانی حەکیم و کۆنفۆشیۆس و زانایانی وەك نیوتن و گالیلۆو ئەنشتاین لە ناخی دڵیدا جێگەی ڕێزو پایەی بڵندی نەبێت. بەرامبەر بەمانەیش هیچ خێرخوایەك نیە ئەمڕۆ لە کردارەکانی فرانسیسکۆ پیزارۆو هێتلەرو مانەندیان قێزنەکاتەوەو دڵی تێکەڵ نەبەت. وا دیارە هەتاهەتایە خاسەو خراپە هەر لە ستێزەو زۆران بازیدان، تاوێك ئەم زاڵەو تاوێك ئەو... دەمێك ئەمیان پێ شێلەو ئەویان سەرکەوتوو... کەسیش نازانێت لە ئەنجامدا چارەنووس چۆن دەبێت .

خوێنەری شیرینم :

نووسەری ئەم پەڕاوە - دکتۆر مایکڵ هارت - ە کە زاناو ڕۆشنبیرێکی ئەمەریکاییە نووسینەکانی فراوانە بەڵام خوێندنەوەو ڕەدوی زانین کەوتنی گەلێك فراوانترە، لە بیری خۆیدا چارچێوەیەکی داناوە کە چۆن ئەم سەد کەسەی گوڵبژێر کردووەو هی تری دوورخستۆتەوە .

ئەوەی لە سروشتی مرۆڤ دیارە ئەوەیە کە سادەو ئاڵۆزە، نەترس و ترسنۆکە، خۆپەرست و خەڵك پەرستە... گەلێك هاودژی تری تێدا کۆیە، بەڵام هەر هەموویشیان زاناو خاوەن بیرن مەگەر شێت و لێوەکانی نەبێت، وە هەر هەموویشیان حەز بە ژیانێکی دوورو درێژو پڕڕۆزی و خۆشی دەکەن ئەوانەی لێ دەرچێت کە خۆیان دەکوژن،

ڕەنگە ئەم خۆکوشندەیەیش کە جاربەجارێك ڕووئەوات هەر لەبەر خاتری ژیان بێت با ژیانیشیان کۆتایی پێ بێت .

دەڵێن گەردوون بەرینە، خێرایی ڕۆشنایی گەورەیە (۳۰۰٬۰۰۰کم / چر) کەپسولە ئاسمانیەکان بە چەند ڕۆژێکی کەم دەگەنە مانگ، بارام (مەریخ) وهەسارەکانی تر... بەڵام با ئەوە بزانین کە بیری مرۆڤ زۆر بەرینترو تیژڕەوترە لەوانە هەموو. مرۆڤ هەر لە چاوترووکاندنێکدا گەشتێك دەکات بە سەر زەمین و گەردووندا — بەخەیاڵ و ئەندێشە — بێ ئەوەی لە شوێنی خۆی بترازێت .

هەر کەڵەپیاوێك کە دەردەکەوێت و ناودەردەکات هەر خۆی خۆی دروست نەکردووە بەڵکو نوێنەرێکی سروشتی ئەو کۆمەڵەیە کە تیایدا ژیاوە یان هەر نەبێت نوێنەری بەشێکی گەورەو بەرینە لەو کۆمەڵەیە. ئەمە بێجگە لە چەندین ڕەشەباو کاریگەر کە بەم لاو بەولادا بردویەی گەیاندویەتیە ئەم بەرەنجام و کاروانسەرایەی. بۆ نموونە ئەگەر کۆمەڵگایەك چەکەرەی هاندانی زانست و زانیاری تیادا سەر دەرنەهێنێت پیاوی زاناو هۆزانی تیادا هەڵناکەوێت، ئەگەر مقۆمقۆی ڕەگەزپەرستی پێشەکی بەناو ئەڵەمانیەکاندا بڵاونەبایەتەوە هێتلەر دروست نەدەبوو... بە کورتی بڵێین هەر بەندوباوێك، هەر بیروڕایەك کە دەکەوێتە ناوناوانەوەو لە مێشکدا جێی خۆی دەکاتەوە لە شوێنێکدا دەبینێت لوتکەیەك یان چەند لوتکەیەك پەیدادەبێت کە ئەو پێشەواو زاناو کەڵەپیاوانە دەگرێتەوە... جاسەیرنیە ئەگەر ژیانی هەر کامێك لەو کەلانە وەربگرین دەگەڕێن بە دوای کۆمەڵەکەیدا

چۆن بووەو ئێستا چۆنە لە هەموو بارەو لایەکی ژیانەوە پێش ئەوەی ژیانی خۆی وەربگرین، ڕەنگە بەم بۆچوونە هەندێك بەرەو مەبەست بگەین و بچینە ناخی سروشتی مرۆڤ و مرۆڤایەتییەوە. بەلاّم گرنگترینیان ئەوەیە کە دەڵێت بە دوای ئەوانەدا گەڕاوم کە پتر لە هەموو کەس کاریگەر تر بوون لە سەر مەردوم لە دوای خۆیان ئیتر ئەم ناودارانە باش بن یان باش نەبن ئەوەشتێکی ترە. ئەم بیرەیش لە فەلسەفەی — پراگماتیزم Pragmatism — ەوە هاتووە کە لەوە دەچێت نووسەر لەسەر ئەو ڕێگەیە ئەوەندەی بایەخ بە ئەنجامی شت — هەرشتێك — دەدات ئەوەندە بایەخ بە چەمکی نادات.

وەرگێڕاوی ئەم پەڕاوە لەسەر چاپی دووەمی عەرەبیەکەی ساڵی ١٩٨٠زیە، زۆر هەوڵمدا دەقی ئینگلیزییەکەیم دەسکەوێت، دەستم نەکەوت بۆ مەبەستی بەراوورد. دووکەس مامۆستا (خالد اسعد عیسی)و پارێزەر (احمد غسان سبانو) لەگەڵ وەرگێڕانەکەیدا چەند سەرنجێکی ڕەخنەییان هەیە لە هەشت خاڵدا، ئەگەر چی هەندێکیان ڕەنگە بەجێ بێت بەلاّم وامان بەچاك زانی چاوپۆشییان لێبکەین بە — ئەمانەت — بەرهەمەکەی د. مایکڵ هارت هەر ناوەرۆك بێت.

هەموو مەبەستێکم لە وەرگێڕانی ئەم پەڕاوە دەوڵەمەند کردنی سیپارەخانەی کوردییە، پێشکەشی هاوزمانمی بکەم تا پەندێك وەربگرن لە ژیانی ئەم سەدکەسە و بۆ پاشەڕۆژ بە هەموو گێژاوێکیەوە خۆیان ئامادە بکەن، نەزان و گێل ئەمرۆ ژیانی نیە، زانین چرای ژیانەو

بێ ئەو چرایە بەرەو کەندەلاَنێکی هەزار بە هەزار نوچ دەبەین، هەر خوا دەزانێت لە کوێ دەگیرسێینەوە.

خوێنەری بەڕێز:

ئەگەر لەم وەرگێڕانەمدا سەرکەوتوبم ئەوا خۆم زۆر بە شادو بەختیار دادەنێم بەوەی کە خزمەتێکم کردبێت، خۆ ئەگەر وایش نیە ئامادەی وەرگرتنی هەموو سەرنجێکم، بەلاَم با دووربین لە توانجو شەرە دەنووك - کە ئەمرۆ بووە بە باو -، ڕێگای زانیاری بۆ ڕەخنە چاکترین ڕێگایە. خوابکات نووسەران بەرهەم لەمە چاکترو بە پێزتر بخەنە بەردەم خوێنەرانی هێژاو بەڕێز.

- وەرگێڕ -

●

## - پێشەکی -

ڤۆلتێر لە نووسینێکیدا بە ناوی (چەند نامەیەك لە ئینگلیزەوە) لە کاتی مانەوەیدا لە ئینگلتەرە سالی ١٧٢٦ز. دەگێڕێتەوە کە چەند زانایەك مشتو مڕیان بوو لەسەر پرسیارێك ئاڕاستەی یەکتریان دەکرد. پرسیارەکەیش ئەوەبوو :... ئاخۆ مەزنترین کەس کێ بێت؟ تۆ بڵێیت یۆلیۆس قەیسەر بێت...؟ ئەسکەندەر بێت...، تەیموری لەنگ یان کرۆموێڵ بێت...؟. یەکێکیان هەڵیدایەو بە بێگومانو دوو دڵییەوە ووتی لای من (ئیسحاق نیوتن)ە. ڤۆلتێر ئەمەی زۆر لاپەسەندبوو.

ئەگەر بە قسەی ڤولتێر بێت ئەوا ئێمە زۆر قەرزارباری ڕێزو فرایستەی[1] ئەو پیاوەین چونکە بە هێزی ژیریو ڕاستی توانی زاڵ بێت بە سەر ئاوەزماندا نەك بە هێزی درەندەیی و بێبەزەیی یانە. جا ڤۆلتێر پەی بردبێت بە مەزنی نیوتن... یانە!!! ئەم پرسیارە گرنگییەکمان بۆدەخاتە ڕوو ئەویش

ملیۆنان کەس گۆڕانکاری دەکەن لەم هەسارەماندا، ئەبێت ئەو کەسانە کێ بن کە فرەکاریگەر بووبن لە مێژوودا، ئەم پەڕاوە وەڵامی ئەم پرسیارە ئەداتەوەو دەیخاتەڕوو...

ئەم لیستەیەی کە دامناوە بریتی یە لەو کەسانەی کە چوستو کاریگەر بوون لە پساتدا(٢) نەك گرنگترین کەس. چەند کەسانێکم تیادا داناوە کە ناودار بوون بە درەندەیی و بێبەزەیی وەك هێتلەر، یان مێژووی ژیانمانیان پێکهێناوە ئیتر ئەو کەسە بە ناوبانگ بوبێت... جەربەزەو گورد بوبێت یان هۆگر....

باشتروایە یەکالای لیستەکەم بکەمەوە کە لەسەر چ بنچینەیەك بەریز دامناوە؟ ئەو مەردانەی کە شایانی ڕێزو هێژاو بلندبین لەو سنوورە دەرچووە کە دابنرێن بە ئەفسانە وەك هۆمیرۆس، ئیزۆپ، یان لاوتزۆی چینی...، ئەمە بێجگە لەوانەی کە نەناسراوبوونو لەگەڵ ئەوەیشدا شایستەی گەورەیی و ڕێزلێگرتنن وەك داهێنەرانی نووسینو پەڕپەڕەو(٣) بەو کەسانەی تریشەوە کە نەناسراوبوون وخزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە .

گوێم نەداوەتە تەنها ناوبانگی هەروەك چۆن گرنگیم داوە بە چوستو کاریگەری... وەك ناوبانگی بنیامین فرانکلین، مارتن لۆثەر کنگ، بیبەرت، لیۆنارد دافنشی ...

ئەو کەسانەی سیاسی بوونو ڕۆلێکی ناوخۆییان هەبووە پشتگوێم خستوون، وەیان ئەوانەی کاریان کردۆتە سەر مەردوم لەم سەردەمەی ئێستادا. خۆ ئەوانەی کە کاریگەر بوون بۆ سەر نەوەی ڕابووردووو بۆ سەر پاشەڕۆژیش ناتوانین چ کەسێك دەسنیشان بکەین. بەلام لەو باوەڕەدام کە چاوەڕوان دەکرێت لەو کەسانەی کاریگەر دەبن بۆسەر

پاشەڕۆژ.. وەك فەرەدای، ماكسوێل، لەوانەیە كارەبا پتر لە ٥٠٠ ساڵی تریش كاری هەمیشەی خۆی بكاتو هەموو كونجو كەلەبەرێكی جیهان بگرێتەوە.

هەروەها گرنگیو بایەخم داوە بەو بزوتنەوە مێژووییانەی كەمەردوم دامەزرێنەرو هاوبەش بووە تیایدا، نەوەك بزوتنەوەیەك بوو بێتو سەری تیادا هەڵدابێت.

بایەخم داوە بەو مەردانەی كە بە تەنهاو كارامانە توانیویانە كارو دوخێكی زۆر باڵاو گرنگ بگێڕن، بە گوێرەی ئەو ڕووداوو بزووتنەوە گرنگانەی كە پۆلاندومە یەكێك تیایدا سەركاری كردووە كە زۆر پایەدارو پێشەنگتر بووە لە یەكێكی تر وەك موحەممەد (د. خ) كە زۆر لە عیسا لەپێشترە لە چەند ڕوویەكەوە. بە بڕوای من موحەممەد تاكرەوییەكی زۆر بە پیتو گوشاوی تیا بەدی دەكرێت لە دارشتنی ئایینی ئیسلام زیاتر لە عیسا لە دارشتنی ئایینی دیان[٤]

هەندێك هەن گەلە گۆڕانكارییەكیان تیا بەدی دەكرێت واتە زۆر كەس تیادا بەشداریان كردووەو بە ئەنجامیان داوە، ئەمانە بە كومەڵ ناوم نەهێناون وەك تەقەمەنیو چەكی ئاگرین، سەربەستی ئافرەت. هەیش بووە هاوبەشی دووكەسی پێوە دیاربووە وەك برایانی ئۆرڤیل رایتو وڵبەر ڕایت لە فڕۆكەسازیدا، یان كارڵ ماركسو فرێدریك ئەنجلز، لەمەیاندا ناوی هەردوكیانم بردووە.

كەسانی تر هەن بە دەگمەن هەڵكەوتوو ولێپرساوبوون لەو ڕووداوە

گرنگانە بە رادەیەك کە ئەگەر ئەوانە نەبوونایە هەرگیز ئەو ڕووداوانە نەدەبوون وەك جەنگیزخان، بێتهۆفن، ولیەمی زالّ.

ملیۆنان کەس هەیە لەسەر ئەم زەمینەدا ناویان هاتووە بەڵام بەتێکرا کەمتر لەیەك لە ملیۆنێکدا جێیان بۆتەوە لە فەرهەنگە بایۆلۆجی‌یەکاندا، جا لە بیست هەزار کەسی ناوبراو لەو فەرهەنگەدا نزیکەی نیوەی لیستە... ئەمانەم تیا گوڵبژێر کردووە، بەڕای من هەر یەکێ لەم لیستەیەدا یەکێکە لەو پێشەنگانە لە مێژوودا.

دەوری ئافرەت لە مێژوودا زۆر لەبەر چاوەو شایستەی تێڕوانینە لەگەڵ ئەوەشدا تەنها ناوی دوانم خستۆتە ناوناوانەوە.

هەر وەکو ووتم‌و دەیڵێمەوە... چوست‌و کاریگەری مەرد بنچینەی پۆلاندنە لەم لیستەیەدا، جا لەوانەیە لیستەی تر بکرێت لەسەر بنچینەی ناوبانگی‌و فرەبەهرەیی‌و فرەڕەوشت بەرزی.

شیرازەی ئەم پەڕاوە بەم شێوەیە... وای لێرادەبینم کە بە چێژو سەیرو خۆشخوان بێت، لە هەمان کاتیشدا لە خوێنەری بەرێز رادەپەرمووم کە هەست بە خۆشمەندی بکات لە کۆکردنەوەی چەندین لیستەی‌تر گەر بیەوێت‌و ئارەزووی لێبێت. پێویست‌و مەرجیش نیە ئەو ناوانەی کە دەیخاتە ڕوو بگونجێت لەگەڵ ئەوانەی کە لەم لیستەدا هەیە.

— دانەر —

(١) فرایستە : شایستە .
(٢) پسات: بەشەریەت.
(٣) پەرپەرە : دۆڵاب .
(٤) دیان : مەسیح .

# موحەممەد (د. خ)....

Muhammad

دامەزرێنەرو بڵاوکەرەوەی یەکێ لە هەرە مەزنترین ئایینی سەرزەمینە، دادەنرێت بە یەکێ لە هەرە سیاسییە مەزنەکانی جیهان... تائێستاش. لەپاش تێپەربوونی ١٣ سەدە بەسەر کۆچی دواییدا ناوی هەر کاریگەرو بەهێزو زوڵاڵە لە نێو مەردومدا. زوربەی ئەو مەردانەی کە رووبەرووی خوێنەر دەبێتەوە پلەو پایەیەکی بڵندیان هەبووە بەوەی کە لەنێوەندێکی ژیاردا لەدایکبوون،.. گۆش کراون و پەروەردەبوون لەنێو ئەو گەل و نەتەوانەی کە ئاستی رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتیان تا رادەیەك بووە کە شایانی باس بووە.

بەڵام موحەممەد (د. خ) کە لە ساڵی ٥٧٠ز لە شاری مەککە (کە کەوتۆتە باشوری نیمچە دورگەی عەرەبی) لەدایك بووە، شوێنێکی تا بڵێیت دوور لە ژیارو هەموو مەڵبەندێکی بژێوی وەك بازرگانی و هونەری و زانستی جیهان.

له تەمەنی شەش ساڵاندا بووە کە تاڵی هەتیوی چەشتووە. لە چێوەیەندێکی پارێزراوو سەرنەوادا بە نەخوێنەواری پەروەردەبووە، تەمەنی گەیشتۆتە ٢٥ ساڵی بێوەژنێکی دەوڵەمەندی هێناوەو بۆتە مایەی خۆشگوزەرانی ژیانی ئابووری.

لەو سەردەمەدا زوربەی عەرەب لە فرەبت پەرستیدا بوون، ئاشوبو ئاژاوە هەمیشە لەنێوانیاندا بووە، زیندەبەچاڵی ئاکاریان بووە، لەنێو ئەم هەموو تەمو مژەو گێرمەو کێشەیەدا دەنگی موحەممەد بلّند بووەوەو بانگەوازیدا بە بوونی خوای تاکو تەنهاو کردگارو دەسەڵاتدار بەسەر هەموو سەرانسەری گەردوندا .... لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا سروشی خوایی بۆهات، پیی ڕاگەیەنرا کە خوا هەڵیبژاردووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام.

لە ماوەی سێ ساڵدا دوستانو کەسانی پەیتاپەیتا نزیك کردەوە لە ئیسلام، لە نزیکەی ساڵی ٦١٣ زدابوو کە ئیتر بانگی ئیسلامەتی بە ئاشکرا درا، دەسبەجێ یاوەرانو پەیڕەوانی زۆر بوو تاوای لێهات خێڵەکانی قورەیش هەستیان بە سامو مەترسی دەکرد لێی، لەوە دەترسان ڕێو جێیان پێ شلۆق بکاتو ڕیزەکانیان بشێوێنێت.

لەبەرئەوە ناچارکرا کە ساڵی ٦٢٢ ز کۆچ بکات لە مەککەوە بۆ مەدینە (٢٠٠ میل لە سەروومەککەوەیە)، لەوێ دانیشتوان پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لێ کردووو بوونە هاوبیرو پاڵپشت بۆی، بەرەبەرە نێوەندێکی سیاسی پەیدا کرد.

ئەم کۆچ کردنەی بە سەرەتای ڕاپەڕاندن دادەنرێت لە ژیانی موحەممەد (د. خ)دا. پەیڕەوانی لە مەککە کەم هەبوو بەڵام لە مەدینە هەر لە گەشەو زۆر بووندابوو تا گەیشتە ئەوەی کە ببێتە پێشەواو فەرمانڕانییان بکات. هەر لەچەند ساڵێکی کەمڕا لە کاتێکدا دەسەڵاتی موحەممە (د. خ) لە پەرەسەندندا بوو چەند جەنگێك بەرپابوو لە نێوان مەککەو مەدینە کە بە برەوی‌و سەرکەوتنی موحەممەد (د. خ) کۆتایی پێ‌هات، لەساڵی ٦٣٠ زیشدا توانی مەککە ئازاد بکات‌و بگەڕێتەوە ناوی.

دووساڵ‌و نیوی لە ژیانیدا مابوو ژمارەیەکی یەجگار زۆر لە خێڵ‌و تیرەکانی عەرەب دەستە دەستە دەهاتنە ژێر ئاڵای ئایینی نوێیەوە. تا ئەو کاتەی کۆچی دوایشی کرد کە ساڵی ٦٣٢ز دەکات تا کە فەرمانڕەوای سەرانسەر نیمچە دورگەی عەرەبی بوو.

هەر لە دێرەوە خێڵە عەرەبیەکانی دورگە ناسراوبوون بە جەنگاوەرو شارەزا لە تاکتیکی جەنگدا. هەرچەندە ژمارەیان کەم بوو، فرەبەرەکی‌و شەڕە خێڵەکیش یەکتریانی تەواو دوور خستبووەوە. لەبەرئەوە زۆر ستەم‌بوو سوپایەکی لی‌ڕێك بخرێت‌و هاودەمی هێزەکانی باکووربێت کە لە ناوچە کشتوکاڵیەکاندا جێگیر بووبوون. هەر کە یەکانگیر بوون لە ژێر ئاڵای موحەممەد (د.خ) بۆ یەکەم جار لە مێژوودا بوونە هەوێنی پێویستیەکانی ئایینی نوێ‌و وورەو باوەڕیان بەتەنهایی خوا پتەوتر دەبوو.

به پێکهێنانی سوپایەکی بچووکی خاوەن باوەڕ توانیان زنجیرە جەنگێکی سەرکەوتووانە بە ئەنجام بهێنن کە هاوتای نیە لە مێژووی بەشەریەتدا. گەر سەرنجێك بدەین دەبینین باکووری وڵات ئیمپراتۆریێتی نویێ‌ساسانیەکان بوو. باکووری ڕۆژاوایی ئیمپراتۆریێتی بیزەنتی‌و ڕۆمانی خاوەری بوو کە کۆستانتینە (قسطنطينە) پایتەختی‌بوو.

جا ئەگەر بەگوێرەی ژمارەیان بەراوورد بکرێن لەگەڵ ئەو ئیمپراتۆریەتانە.. ئیسلامەکان لەو ئاستە پێویستەدا نەبوون کە بتوانن هیچ بەرەنگارییەك بکەن، بەڵام ئەو دلێرە خاون باوەڕانە توانیان بەخێرایی ناوچەی مياندواوو فەلەستین و سوریا ئازادبکەن، ساڵی ٦٤٢ ز توانیان سوپاکانی فارسی بڕمێنن لە قادسیەو نەینەوا دا، وە توانیان میسریش دابڕن لە ئیمپراتۆریێتی بیزەنتی لە هەمان ساڵدا. ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی دوای خۆی لەسەر دەستی جێگرانی کە ئەبوبەکرو وعومەری کوڕی خەتاب بوون‌و یاوەرانی دڵسوزی بەئەنجام هات. وەنەبێت کۆتایی پیێ‌هاتبێت، بەڵکو ساڵی ٧١١ ز سوپای ئیسلام بە تەواوی سەرانسەری باکووری ئەفەریقایان کەوتەدەست تا گەیشتنە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی‌و لەوێشەوە بەرەو باکوور پاش ئەوەی بە گەرووی چیای تاریقدا پەڕینەوەو زاڵ بوون بەسەر پاشانشینی (قوت) لە ئەسپانیادا.

هەر سەردەمێکی دوور نەبوو کە بەرەو هەموو ئەوروپای دیان کشان، بەڵام لە ساڵی ٧٣٢ زدا لە کارزاری (تورز)دا سوپای ئیسلام بەرامبەر بەسوپای فرنجە نوشوستی هێنا پاش ئەوەی کە پێشرەوییان

بەدەست هێنا تا گەیشتنە ناوەڕاستی وولاتی فەرەنسا.

لە جەنگی سەدەیەکدا ئەم خێڵە بیابانیانە بە پەیڕەوو ئامۆژگاری موحەممەد (د. خ) توانیان ئیمپراتوریەتێك دابمەزرێنن لە سنووری هیندەوە درێژ بێتەوە تا ئۆقیانوسی ئەتلەسی کە ئەمەیش بە مەزنترین ئیمپراتۆرێتی ئەو سەردەمەی جیهان دادەنرێت. روویان کردبایە هەر شوێنێك‌و ئازادیان کردبایە ژمارەیەکی یەجگار زۆر باوەڕیان پێ‌دەهێنان‌و دەهاتنە ئامێزی ئایینی نوێ‌وە، بەڵام ئەم یەکانگیرییە جوگرافیەیان ئەوەندەی نەبرد کە فارسەکان هەر چەندە بە دڵسوزی بۆ ئایینی ئیسلام مانەوە سەربەخۆیی خۆیان سەندەوە. ئەسپانیەکانیش پاش جەنگێکی حەوت سەدە توانیان ئایینی دیان بگەڕێننەوە. بەڵام ناوچەی میاندواو و میسر کە دوو سەرچاوەی ژیاری هەرەدێرین بوون بە ئیسلامی مانەوە، هەروەهایش ڕۆخی باکووری ئەفەریقا بە عەرەبی ئیسلامی مایەوە. لە سەدەکانی دواییندا ئاینی نوێ پەیتا پەیتا لەگەشەو پەرەپێداندا بوو بەرادەیەك کە ئێستا ئاسیای ناوەڕاست و بە زۆری پاکستان و ئەندەنوسیا و باکووری هیندی گرتۆتەوە.

لە ئەندەنوسیادا باوەڕی ئیسلامی بووە کاریگەرێکی سەرەکی بۆ یەکگرێنیان، بەڵام لە نیمچە کیشوەری هیندیدا کێشەی نێوان موسوڵمان‌و هیندۆسەکان بووە کۆسپێك لەڕێی یەکگرتنیان.

کەواتە چۆن دەتوانین کاریگەری موحەممەد (د.خ) بسەنگێنین بۆ سەر مێژووی بەشەریەت؟ هەروەك ئاینەکانی‌تر ئیسلام دەروویەکی ڕۆشن‌بوو بۆ سەر نەرێت‌و ژیانی پەیڕەوانی. هەر لە بەر ئەم هۆیەشە کە

خوێنەر ناوی دامەزرێنەرانی زۆربەی ئایینەکان دەبینێتەوە لەم پەراوەدا. لەبەر ئەوەی دیانەکان چەند ئەوەندەی ژمارەی موسلمانەکانن لە جیهاندا لەوانەیە بۆ خوێنەر سەیر بێت کە موحەممەد (د. خ) پۆلێنراوە لە ئاستێکی بەرزتر لە عیسا. بەڵام دوو هۆی سەرەکی ئەم بڕیارە ئەدات، یەکەمیان ئەوەیە کە موحەممەد (د. خ) کارێکی گێڕا لە پەرەسەندی ئیسلام کە گرنگترە لەوەی عیسا گێڕاویتی لەپەرەسەندنی دیاندا.

لەگەل ئەو لێپرسراوییەی کە عیسا هەیبووە لەبنەڕەتەکانی ڕەفتارو خورەوشتی ئایینی دیاندا «لەو لایەنە بنەڕەتیانەی کە جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئایینی جوولەکەدا» کەچی قەشە پۆڵس دادەندرێت بە پەرەپێدەری سەرەکی لە لاهوتی دیاندا... بە ڕابەری سەرەکی باوەڕەکانی دیانو بە دانەری نوێشکێکی مەزن لەچەرخی نوێی تەوراتدا.

دووەمیان ئەوەیە کە موحەممەد (د. خ) هەر بە خۆی لێپرسراوی ئایینی ئیسلامو بوو لە باوەڕە سەرەکییەکانی ڕەفتارو خورەوشت دا، هەر بە خۆیشی پێشەوایەتیو ڕابەرێتی ئایینی نوێی دەکرد، دانەری ئەرکە ئایینیەکانی بوو. هەر ئەو بوو کە ڕاستەوخۆ بەسرۆشی خوایی قورئانی بۆ هاتەخوارەوە «سیپارەی پیرۆزی ئیسلام کە بریتییە لە کۆمەڵە ئایەتێکی بەپێزو دوورین». زوربەی ئەو فەرمایشتانە نووسرایەوە، پاشان ئەوانەیتریش کۆکرایەوە بە شێوەیەکی ڕاپەرموونو باوەڕپێکراو لە دوای کۆچی دوایی بە ماوەیەکی کەم.

ئەو سروشە خواییەیش کە قورئانە بریتی‌یە لەو فەرمایشت‌و ئامۆژگاریانەی کە موحەممەد (د. خ) رایدەگاند بە پەیرەوکەانی بەڵام عیسا دەقێکی راستەوخۆی نەماوە وەك قورئان کە مافی خودی ئاوەها پێوەمابێت ئەگەرچی کاری قورئان بۆ سەر موسڵمانان وەك کاری سپارەی پیرۆز وایە بۆسەر دیانان.

بیرو یادی موحەممەد (د. خ) لە قورئاننەوەرا مەزن‌و بێ‌هاوتا بووە، دەبێت کاریگەرشی بۆ سەر ئیسلام زۆر گوشادتر بووبێت لە کاریگەری دووقۆڵی عیساو قەشە پۆڵس بۆسەر دیان، جا لەبەر ئەوە لە تێروانینێکی ئایینی ووردو تیژەوە بێت وا دەردەکەوێت کە موحەممەد (د. خ) وەکو عیسا کاریگەر بووە بۆ سەر مەردوم لە سەرانسەری مێژوودا. لەم هۆیانە زیاتریش کە موحەممەد (د. خ) لە عیسا جیادەکاتەوە ئەوەیە کە موحەممەد (د. خ) چەنێ پێشەوایەکی ئایینی بووە ئەوەندەیش پێشەوایەکی جیهانی بووە، ئەو هێزە پاڵدەرانەی دوای دەسەلأتگیری ئیسلامەکان بەلگەیەکن بۆ ئەم راستییە. لێرەدا ئەگە زۆر بەووردیو چاوێکی بایەخ‌پێدانەوەیش سەرنج بدرێت دەردەکەوێت کە موحەممەد (د. خ) بە مەزنترین پێشەوای سیاسی دادەنرێت هەتا هەتایە...

رووداوی مێژوویی گرنگ هەبووە کە لەوانەیە مرۆڤ بلێت هەردەبوو، لەوانەیش‌بوو ببوایە گەر مەردێك نەبوایە پێشەوایەتی بکات، بۆ نموونە زەویە زەوت‌کراوەکانی ئەمریکای باشوور هەر سەربەخۆیی دەسەند گەر سیمۆن بۆلیڤاریش نەبایە، بەڵام ئەمە نابێت

بەرانبەری دەسەڵاتداری ئیسلامەکان ڕابگرین چونکە هیچ جۆرە ڕووداو وشتێك ناگات بەم کارە نەبووەی پێش موحەممەد (د. خ)، هیچ هۆیەکیش نیە بمانبەستێتەوە بەو باوەڕەی کە دەڵێت ئەو ڕووداوە هەر دەبوو بەبێ ئەو (واتە موحەممەد). ئەو داگیرکردنە ویەکچوونانەی کە لە مێژووی مەردومدا بووە وەك داگیرکردنەکانی مەغۆلەکانی سەدەی سیانزەم کە ئەویش بە شێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ جەوهەری جەنگیزخان، جا هەرچەندە دەسەڵاتیان فراوانترو بەرینتریش بووە بەڵام زۆر پتەوو ڕاگیر نەبووە. ئەو ناوچانەی ئێستای مەغۆلەکان هەر هەمان ناوچەن کە کاتی خۆی جەنگیزخان نیشتەجێ بووە تێیدا.

لێرەدا جیاوازییەکی تەواو هەیە سەبارەت بەدەسەڵاتگیری ئیسلام، هەر لەعێراقەوە بیگرە تامەڕاکیش پەیوەستیانو یەکانگیرییان پێوە دیارە نەك هەر تەنها لە ڕووی ئایینی ئیسلامەوە بەڵکو زمانی عەرەبیو مێژووو هاوڕوشنبیریشیان. خۆ قورئانیش کە سەرچاوەی ئایینی ئیسلامییە نووسراوەتەوە بە زمانی عەرەبی... کارێکی زۆرگرنگی کردۆتە سەر عەرەبی یەکگرتووو شێواندنی ئەو زارە عەرەبیانەی کە تێگەیشتنیان بوو بووە کێشەیەك.

ئەم ڕووداوانە نەدەبوو گەر قورئان نەبایە (کە سیانزەسەدەی بە سەردا هاتووە). هەرچەندە ئەو جیاوازی وبەش‌کراوییەی لە وولاتە عەرەبیەکاندا هەیە، بایەخپێدانێکی تایبەتیشی هەیە، بەڵام ئەم بەش بوونەیان وەنەبێت بتوانێت ئەو خاڵە سەرەکیانە بشارێتەوە کە بونەتە هۆی یەکانگیری سەدەهای ساڵیان، بۆ نموونە ئێرانو ئەندەنوسیا کە

دوو ووڵاتی پەترۆڵین هەردوکیشیان موسوڵمانن، بە جووتە بوونە پاڵپشتو هاودەنگی ووڵاتە عەرەبیەکان لەراگرتنی پەترۆڵ ناردن لەزستانی ١٩٧٣ – ١٩٧٤ز، بێگومان ئەمەیش وەنەبێت کارێکی رێکەوت بووبێت کە لایەنگری ووڵاتە عەرەبیەکانیانی کرد بۆ بەرەنگاری ئەو هەڵوێستە، ئالێرەیشەوە دەبینین کە لە سەدەی حەوتەمەوە کشانی سوپای ئیسلام بۆ ووڵاتانی ترکۆتایی پێهات بەڵام هەرگرنگیو سەرپشتەیی خست گەر لە مێژووی بەشەریەتدا هەتاکو ئێستایش. بێگومان ئەم یەکانگیرییە بێنموونەو هاوتایە بەوپەری گەشبیرییەوە خۆی دەسەپێنێت لە کاریگەی ئایینی و جیهانیدا کە موحەممەد (د. خ) دابنرێت بە هەرە مەزنترین تاکە مەردێکی چوستو کاریگەر لە مێژووی پساتدا.

○

## ٧- ئیسحاق نیوتن.....



Isaac Newton

١٦٤٣ز - ١٧٢٧ز

ئیسحاق نیوتن... دادەنرێت بەمەزنترین زانایەکی کاریگەر کە ژیابێت لەسەر ڕووی ئەم زەویەدا، لەدایك بوونی و مردنی گالیلۆی زانا لە هەمان ڕوژدا بووە، پێش ئەوەی بێتە جیهانیشەوە مردنی باوکی بەسەرداهات. هەرچەندە منداڵێکی هۆشمەند بوو بەڵام ئەوەند سەرنجڕاکێش نەبوو لای مامۆستاکانی. هەر لە تەمەنی هەرزەکاریدا دایکی لە خوێندگا دەری هێنا بەهیوای ئەوەی کشتیارێکی باشی لێ دەرچێت، بەڵام لە خۆشبەختی نیوتن دایکی هاتە سەر ئەوەی بیربکاتەوە کە کشتیاری‌ی هیچ بەهرەیەکی سەرەکی لێ دەرناخات،

لەبەرئەوە لە تەمەنی ١٨ساڵیدا ناردیە زانکۆی کامبرج. هەر لەماوەیەکی کەمدا بەزرنگی ی و توانایی خۆی شارەزاییەکی تەواوی پەیدا کرد لەو زانستانەی ئەو سەردەمە... زانستەکانی بیرکاریی و سروشت، لە دواییدا بەخۆی کەوتە زانستگەری تایبەتیەکانی. هەر لەنێوان تەمەنی ٢١ ساڵی و ٢٧ ساڵیدا بوو کە بنەرەتی هەندێ لە بیرکارە زانستەکانی دانا کە لە دواییدا بووە بزوێنەری شۆرشێکی زانستی ی لە جیهاندا. یەکەم دۆزینەوەی زانستی ی کە بڵاوی کردەوە بریتی بوو لەو کارە مەزنەی کە جیهانی زانستەکانی هاژاند ئەویش (سروشتی رۆشنایی)ە. بەرەچە تاقیکارییەکی زەبرو بێووچان بۆی دەرکەوت کە رۆشنایی سپی سادە بریتی بە لە رەنگەکانی پەلکەزێرێنە.

لە دواییشدا تەلەسکۆپێکی ستێرناسی ی ئاوێنەداری دروست کرد پاش رەباز و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر قووڵ لەزانینی نهێنیەکانی رۆشنایی. تا ئێستایش ئەم جۆرە تەلەسکۆپە لە روانگەستێرناسەکاندا کاری پێدەکرێت. بەڵام مەزنترین زانستگەری لە داهێنانی (کاڵکلۆس) دابوو لە بیرکاریدا. جا ئەگەر نیوتن لە نێوان زانستەکانی تردا تەنها ئەم زانستەی داهێنابایە ئەوا، هەر ئەم کارە مەزنەی بەس بوو بۆ ئەوەی کە پلەیەکی بەرزو پێشەنگ بگرێت لەم لیستەیەدا.

لەراستیشدا، مەزنترین دۆزینەوەی نیوتن لەبواری میکانیکدا زیاتر بەدی دەکرێت، لەم زانستەدا سنوورێك بۆ جوڵانەوەی تەنەکان دانراوە. گالیلۆیش یەکەم قانونەکانی جوڵانەوەی دۆزییەوە (بەڵام تەنها بەتاقیکاری) کە دەسەپێت بەسەر ئەو تەنانەی هێزی دەرەکی

بەسەرەوە نیە، هەرچەندە هەموو تەنێکیش لەژێر هێزی دەرەکی دایە. جا گرنگترین پرسیاریش لە زانستی میکانیکدا ئەوەیە کە چۆن تەنەکان دەجولێن لەژێر ئەم بارو مەرجانەدا، نیوتن توانی چارەسەری ئەم کێشەیە بکات، لە قانونە بەناوبانگەکەی (قانونی دووەمی جولانەوە) کە بە ڕاستی دادەنرێت بەگرنگترین قانونە سەرەکییەکان لەفیزیای کلاسیکدا. هەر بەم هاوکیشە بیرکارییەیش دەریخست کە:

هێز = بارستە × پەلە

دەق قانونەکە پیشانی دەدات کە پەلەی تەن (واتە گۆڕینباری پەلەپی تەن) یەکسانە بەهێزی کاریگەر بۆسەر تەن دابەشکراوە بەسەر بارستاییدا. پاشان قانونی سێهەمی داهێنا، دایڕشت و خستیە پاڵ قانونە مەزنەکانی تری کە دەقەکەی ئەمەیە: «هەر کارێك کاردانەوەیەکی هەیە یەکسانە لە بڕداو پێچەوانەیە لە ئاڕاستەدا». دوابەدوای ئامانەیش قانونی چوارەمی دانا بەناوی قانونی گشتی یەکترڕاکێشان کە دەقەکەی بەم شێوەیە: «دوو تەن یەکتر ڕادەکێشن بەهێزێك کە یەکسانە بە چەندجارەی لێکدراوی بارستەیان و دابەشکراوە بەسەر دووجاری دووری نێوانیان».

دەق ئەو قانونانەی خرایە کایەوەو سەپێنرا بەسەر پرسیارەکانی زانست و میکانیکدا. هەر لەژیانیدا مەزنترین قانونە درامییەکانی لەبواری ستێرناسیشدا خرایەگەڕ. لەو پەڕاوەی «بنەرەتە بیرکارییەکانی فەلسەفەی گەردوون»دا قانونی یەکترڕاکیشان و قانونەکانی جوڵانەوە پێشکەشدەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن بەم قانونانە بەووردی

سەرنجێ دەدرێت لە جوڵانەوەی ئەستێرەکان بەدەوری خۆردا. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لەم مەیانەیشدا نیوتن مەزنترین زانای ستێرناسی‌ی بووە.

ئێستایش رەنگە خوێنەر بپرسێت کە بۆچی نیوتن پۆلێنراوە لە پلەو ئاستێکی بڵندتر لەو مەردە سیاسیانەی وەك ئەسکەندەری گەورە و جۆرج واشتۆن، یان لەو مەردە ئایینیانەی وەك عیساو گۆتاما بوزا..؟

لەوەڵامدا دەڵێین هەرچەند گۆڕانە سیاسییەکان گرنگی هەیە بەڵام دەبێت ئەوەیش بخەنیەروو کە زۆربەی دانیشتوانی جیهان نزیکەی ٥٠٠ ساڵ پاش ئەسکەندەر چۆن ژیاون ئاوەهایش پێشینانیان بەدرێژایی پێنج سەدەی پێشتر گوزەرانیان کردووە. هەروەها سەربارەت بەچالاکی مرۆڤ، زۆربەیان چۆن گوزەرانیان کردووە لە ساڵی ١٥٠٠ ز ئاوەهایش بەهەمان رێگەی ساڵانی پێش ١٥٠٠

گورەرانیان کردووە، جا ئەگەر بێتو ئاوڕێك لەبەری پێنج سەدەیەك بدەینەوە. ئەو سەردەمە دەکات کە زانستە نوێکان هێشتا لە چەکەرەدا بوون، دەبینین ژیانی رۆژانەی مرۆڤ شۆرشێکی تیادا بەرپابوو. خۆ ئەگەر ئێمە خۆراكو پۆشاكو کارە جیاوازەکانمان گۆڕابێت ئەوا پشووی ژیانیشمان کە چۆن دەیبەینە سەر زۆر جیاوازە لە پشووی ژیانی ئەو کەسانەی ساڵانی ١٥٠٠ ز. کەواتە دۆزینەوەی زانستەکان

نەك هەر تەنها شۆڕشێك بوو لە تەكنۆلۆجی و ئابووریدا، بەڵكو كارێكی ڕاستەوخۆو سەرانسەریشی بووە لە سیاسەت وبیركردنەوەی ئایینی و هونەرو فەلسەفەدا. هەر ئەم هۆیەیش ڕامان دەكێشێت كەزۆربەی زانایانو داهێنەران دابنرێن لەم لیستەدا.

نیوتنیش لە نێوانیاندا نەك هەر تەنها بە دیارترین زانا دادەنرێت بەڵكو زۆر لەپێش ئەو زانایانەیشەوە دادەنرێت كە كاریان كردۆتە سەرگۆڕانكاری بیردۆزە زانستەكان. جا لە بەر ئەوە شایستەی ئەوەیە كە جێی لە نزیك سەرەتای ئەم لیستەدا بێت.

---

(١) پەلە: یان تاودان... لە پەڕاوەكانی خوێندگاكاندا دیارە.

# عیسای دیان |خ. ر|.....

**٦ پ ز - ٣٠ ز**

**Jesus Christ**

کاریگەری و رازە دڵگیرەکانی عیسای دیان بۆسەر مێژووی مەردوم ئاشکرایە، چەند کەسێکی کەم نەبێت نارازین بەدانانی لەنزیك بڵندییەوە لەلیستەکەدا، بەڵام هەر ئەو پرسیارە دیسان خۆی دەسەپێنێتەوە کە بۆچی دانەنراوە لە سەرووی هەمووانەوە؟!

گومانی تێدانیە کە عیسا بیروباوەڕی ڕەفتارو خۆرەوشت بەرزێتی و پاکێتی دارشت لە ئایینی دیاندا سەرەڕای ئەو تێروانینە سەرەکییە گوشادیانەو بیرانەی کە تایبەتن بە ڕەفتاری مەردومەوە. بەڵام دەبێت ئەوەیش لەیادنەکەین کە لاهوتزانیی دیان قەرزارباری قەشە پۆڵسە لە تێکوشانیدا بۆ دامەزراندنی.

بەڵێ.. عیسا پەیامێکی یەزدانی پێشکەش کرد بەڵام قەشە پۆڵس بەشێکی گەورەی خستە سەرو چەرخێکی نوێی پێکهێنا لە سیپارەی

پیرۆزدا، هەر ئەویش بانگدەرو هێزی کاریگەربوو لە بڵاوکردنەوەی ئایینی دیاندا لەساڵەکانی سەدەی یەکەمی زایینیەوە.

عیسا لەتەمەنێکی کورتدا کۆچی دوایی کرد[1] (بەپێچەوانەی موحەممەد (د.خ)و بوزا . لەدوای خۆی ژمارەیەکی لە یاوەرانی بەجێهێشت، هەر لەناو خۆیاندا لەسەرەتادا پاش کۆچی دوایی عیسا دەستەیەکی بچووکیان دامەزراند. بەڵام بە فرایستەیی نووسراوەکانو کۆششی قەشە پۆڵس (کە هێشتا ئایینی دیان ئەوەندە برەوی نەبوو) وای لەم دەستەیەکرد کە ببێتە بزوتنەوەیەكو بگاتە نێوجوولەکەکانو کەسانی‌تر بگاتە ئەو رادەیەی کە رەگی داکوتیو بەرە بەرە گەشەبکاتو ببێتە یەکێ لە ئایینە مەزنەکانی جیهان.

بێگومان عیسای پێغەمبەر خاوەنی بیرو خوورەوشتێکی زۆر بەرزو نەژاد بووە وەك لە فەرمایشتێکیدا دەریدەخات: (پێتان ووتراوە کە هاوسێیانتان خۆشبوێتو دوژمنانتان خۆشنەوێت) بەڵام من پێتان دەڵێم: (دوژمنانتان خۆشبوێت و بەزەییتان پیایاندا بێتەوە، چاکە بکەن لەگەڵ ئەوانەی کینەیان لێتانەو نوێژبکەنو بپارێنەوە لە خودا بۆ ئەوانەی زۆردارو چەوسێنەرن)، پاشان دەفەرموێت: (بەرهەڵستی شەڕ مەکەن، بەڵکو کەسێك دای بەڕوومەتی ڕاستدا، روومەتی چەپیشی بۆ وەرگێرە). هەرچەندە ئەم بیرانە دادەنرێت بە بیرە نموونەییە هەرە بەرزو بێهاوتاکان کە مەردوم زانیویەتی، کەچی کەسێکیش نیە پەیرەوی بکات، گەر هەموو کەس پەیڕەوی بکردایە، ئەوا بێدوودڵی دەخرایە ئاستێکی زۆر بەرزو پلەی یەکەم لەلیستەکەدا.

ئەم بیرانە وەنەبێت لەکاردابێت‌و خرابێتەگەر بەشێوەیەکی فراوان بەڵکو تەنانەت پەسەندیش‌نیە. دیانەکان باوەڕیان وایە کە ئەم ئامۆژگاری‌و نەریتانەی زۆر نموونەییەو ناپۆرێت ڕانمایی مەردومی ئەم زەمینەی پی‌بکرێت. کە خۆمان پەیڕەوو ڕەفتاری پی‌نەکەین لە کەسیش چاوەڕوان ناکرێت پەیڕەوو ڕەفتاری پی‌بکات تەنانەت ئامادەیش‌نین منداڵانمان فێربکەین، ئەو نەریت‌و پەیڕەوانەی عیسا تەنها بە نەریت‌و ئاکارێکی بەندکراو دەمێنێتەوە بەڵام لەخۆیدا چەند پێشنیازێکی تاقینەکراوەیە لە ژیانی پسات‌دا.

بەسەرهاتی ژیانی عیسا لای زۆربەی خوێنەران دیارو ئاشکرایە ئیتر پێویست بەگێڕانەوەی ناکات بەڵام هەندێك خاڵی سەرەکی هەیە شایستەی یادکردنە:

یەکەمیان ئەوەیە کەزوربەی ئەو زانراوانەی دەربارەی عیسا نادیارو جی‌ی‌باوەڕنین، تەنانەت ساڵی لەدایك‌بوون‌و کۆچی دوایی نازانرێت، کە دەبوایە یاوەران‌و شاگردەکانی بیانزانیایە، ئەو ساڵەیش تائێستا بەشێوەیەکی چەسپاو نازانرێت.

ئەم نەزانینانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیەی کە عیسا هیچ پاشماوەیەکی دەسنووسی لی‌بەجی‌نەماوە، ئەو هەموو شتانەیش دەربارەی ژیانی کەدەزانرێت هەموو لە چەرخی نوی‌یەوە ڕاهاتووە.

بەداخەوە ئەو ئینجیلانەی کە هەیە هەریەکە کەمو کووڕی ئەوی‌تر دەردەخات لە هەندێ خاڵی جیاوازدا، بۆ نموونە ماثیۆس‌و لۆقا دەقی جیاوازیان هەیە لەدوا فەرموودەکانی عیسادا.

لەسەردەمی ژیانیداو سەدەی پاش خۆیشی هیچ چوست‌و کاریگەر نەبووە لەگۆڕانگاریە سیاسیەکاندا، بەڵام لەوە دەکات تەنها وەك پێشەوایەکی یەزدی[2] خورەوشتی بووبێت‌و کاری کردبێتە سەرژیانی خورەوشت‌و یەزدی مەردوم.

---

بەلأم لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (وقولهم انا قتلنا المسيح عيسى ابن مريم رسول الله وماقتلوه وما صلبوه ولكن شبه لهم.. تاكو.. بل رفعه الله اليه وكان الله عزيزا حكيما..) «سوورەتی نیساء». وەگێر.

یەزد: گیان، روح.


Buddha

# بوزا.....

۸٤٣ پ.ز - ٥٦٣ پ.ز

گۆتاما بوزا - ناوەڕاستیەکەی شازادە سیدهارتا - بە دامەزرێنەری ئایینی بوزی‌یە کە یەکێکە لە ئایینە مەزنەکانی جیهان، کوڕی پاشایەك بوو فەرمانڕانی هەرێمێکی دەکرد لە باکوری هیندستاندا نزیك سنوری نیپالْ. لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا کچێکی هاوتەمەنی خۆی کە ئامۆزای بوو خواستی‌و بووە هاوسەری. شازادە سیدهارتا لە کۆشك‌و تەلارێکدا بەخێوکرا هەمووی مشەو خۆشبەختی بوو. بەلأم ئەم ژیانە ناسکەی بەدلاً نەدەچوو چونکە دەیبینی کە زوربەی پسات کلۆڵ‌و هەژارن، تاڵی‌و نەبوونی دەچێژن. دیسان

سەرنجی دا کە دەوڵەمەندەکانیش هەر کامەرانو شادنین، ئەوانیش لەژیاندا هەر دەگلێنو دەنەون. دەیشی بینی کە نەخۆشی هەر دەبێت دووچاری مرۆڤ بێتو دواجار بەمردنیش خۆی بسپێرێت .

سیدها بیری دەکردەوە کە دەبێت لەم ژیانەدا شتێکی تر هەبێت بێجگە لە تامو خۆشیی بەباچوو کە مردنو ئازار زووبەزوو هەمووی دەسڕێتەوە. کە گەیشتە تەمەنی ٢٩ ساڵو کاتێك یەکەم کوڕی لەدایك بوو، گۆتاما بڕیاری دا واز لەو ژیانە بهێنێ کە تیایدابوو، بەهەموو هەستیکیەوە خۆی تەرخان کرد بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیدا. کۆشکی بەجێ هێشتو ژنو منداڵە شیرەخۆرەکەی خستەلاوە. لە ماڵی دنیا هیچی بۆخۆی هەڵنەگرتو بووە گەریدەیەکی نابووتو قەلەندەر .

لەپاشدا خۆی تەرخان کردو لێبڕا بۆ خوێندن لەسەر دەستی چەند پیاوچاکێکی شارەکە... بەڵام پاش ماوەیەك بۆی ئاشکرابوو کە پەیڕەویی ئەم پیاوچاکانە چارەسەری کێشو تەنگی مروڤایەتیو باری ژیانیان ناکات. لەو دەمەدا بڕواوابوو کە تەرساییو خۆڕاگرتن تاکە ڕێگەیەکی ژیرانەوڕاستە، لەبەرئەوە گۆتاما هەوڵیدا ببێتە پارساو(١) خۆی بۆ چەند ساڵێك خجڵ کرد بە ڕۆژووی سەختو پاکیی لاشە، بەخۆ دوورخستنەوە لەخۆشیو بەخۆئازارادان .

دوایی پەی بەوەبرد کە خۆئازاردان هیچی تیابەسەرنیە کوشتنو لاوازکردنی هۆش نەبێتو هیچ لەڕاستیو پەندی نزیك ناخاتەوە. لەبە ئەوە هاتەوە سەرخواردنی سروشتیو دەستی لە پارساییو خۆڕاگرتن هەڵگرت .

جارێك له خه‌ڵوه‌تدابوو ده‌یویست بچێته ناخی بوونی مه‌ردومه‌وه، له ژێردار هه‌نجیرێکدابوو، له‌پڕ هوشیارییه‌که‌ی ئه‌و مه‌ته‌ڵه‌ی هه‌ڵهێنا که چه‌ند ساڵه ووری کردبوو. به‌درێژایی ئه‌وشه‌وه له‌ئه‌ند یشه‌به‌کی بێ‌بن‌و تێڕامانێکی قووڵدابوو، هه‌رکه‌زانی گه‌یشته ئه‌نجام‌و گوشاد. ئیتر بوو به «بوزا» واته (پیاوی بیرۆشن).

ده‌توانین په‌یره‌وو ئاموزگاریه‌کانی به‌کورتی باس‌بکه‌ین به‌وه‌ی که بوزیه‌کان پیی ده‌ڵێن (چوار ڕاستی‌یه پیرۆزه‌که) که ئه‌مانه‌ن :

یه‌که‌م : ژیانی مه‌ردوم دووره له‌کامه‌رانی به‌مانای ته‌واو .

دووه‌م : هۆی ئه‌م‌ناکامه‌رانیه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ خۆپه‌رستی (منانی)و چێژبازی (٢) .

سیهه‌م : ئه‌م خۆپه‌رستی‌و چێژپه‌رستیه‌یش به‌وه له‌کۆڵیان ده‌بێته‌وه که بگه‌ینه ڕاده‌ی نیرڤانا (واته ته‌قینه‌وه) .

چواره‌م : ڕێگه‌ی خۆرزگارکردن له خۆپه‌رستی‌و چێژبازی که پیی ده‌ڵێن (هه‌شت‌ڕێیانه‌که)، ئه‌م هه‌شت ڕێ‌یه‌یش ئه‌مانه‌ن :

خاس‌بینی – خاس‌بیری – خاسگۆیی – خاس‌کرداری – خاسگوزه‌رانی – خاس‌ڕه‌نجی – خاس‌تێگه‌یشتن – خاس‌تێڕامان .

ئه‌وه‌یش بابڵێین که بوزایی ده‌رووی له‌سه‌رپشته بۆ هه‌مووان، به‌پێچه‌وانه‌ی هیندوسایه‌تی جیاوازی چین‌و ڕه‌گه‌زی لانیه .

---

(١) پارسا: ئه‌و که‌سه‌ی پرسی ڕاستی ده‌کات‌و له‌دوای ده‌گه‌ڕێت.

٢) چێژبازی: شهوات.



١

# كۆنفۆشیۆس

٥٥١ پ‌ز - ٤٧٩ پ ز

Confucius

فەیلەسوفی مەزنی چینی كۆنفۆشیۆس... بەدامەزرێنەری ئەو (رژێمە هۆزاكیانە)(١) دادەنرێت كە بیركردنەوەی سەرانسەری گەلانی چینی هاژاندبوو، فەلسەفەكەی دامەزراوە لەسەر خورەوشتی مەردایەتی‌و لەسەر ئەو چەمكەی كەدەبێت میری‌ی بەوپەڕی رێكوپێكیەوە لە خزمەتگوزاری گەلدابێت .

ئابەم شێوەو رێبازە دەسەڵاتی كێشابووە سەر ناخی ژیان‌و رۆشنبیرانی چینەوە بەدرێژایی دوو هەزار ساڵێك، تەنانەت ئەو ماوەیە كارێكی گەورەیشی كردبووە سەر بەشێكی فراوان لە دانیشتوانی جیهان .

کۆنفۆشیۆس نزیکەی ٥٥١ پ ز لە میرنشینێکی بچووکدا کە پی'ی دەوترا (لۆ) لەدایك بووە کە ئێستا هەرێمێکی سەر بە (شانتانگا)یە لە باکووری چیندا .

بەمندالی باوکی مردووەئیتر دایکی بە کوڵەمەرگی ژیانویەتی، کە گەیشتۆتە تەمەنی لاوێتی بۆتە فەرمانبەرێکی بچوك لە دەوڵەتدا بەلام پاش ماوەیەك وازی لە فەرمانبەرێتیش هێناوەو کەوتۆتە بلاوکردنەوەی ئاموژگاریەکانی بۆ ماوەی ١٦ ساڵ، لەو ماوەیەدا زۆر لەشاگردانو یارانی لێکۆبووەوە، لە تەمەنی ٥٠ ساڵیدا دەوڵەت زۆر رێزی لێگرت، لەپاداشتی ئەو خزمەتەیدا خرایە پلەو ئاستێکی بەرز لەلایەن دەوڵەتی (لۆ)وە .

بەلام چوار ساڵ زیاتری نەخایاند کە ناحەزانی کۆشك کەوتنە گزیریو پیلانگێران لێی تا بوونە هۆی دەرکردنیو دوورخستنەوەی لەدەوڵەت. لەنزیکەی ١٣ ساڵی دواییدا وەك مامۆستایەك گەروکانە دەیبردەسەر. بەلام لە ٥ ساڵی دوازیانیدا گەرایەوە وولاتەکەیو لە ساڵی ٤٧٩ پ ز دا مرد. کۆنفۆشیۆس لەرووالەتدا بەدانەرێکی ئایینی دادەنرێت بەلام بەم پەسنو لێووردبونەوەیە لەوەدەکات کە دووربێت لەوەی کە بەرێبازگەیەکی ئایینی دابنرێت، چونکە نەبەکەم وەنەبەزۆر ئەوەندە ناوی خواوەند نابات نەیشی ویستووە لەو ژیانی دوامەرگیدا (دواجیهانی) بدوێتو تەنانەت دووریش بووە لە هەموو تێرامانێکی میتافیزیکەوە، لەبەرئەوە زیاتر وەك فەیلەسوفێکی جیهانی دەناسرێت کە بایەخی دابێت بەخوورەوشتی مەردومو سیاسەتو خۆش رەفتاریی.

دوو زانست نەریت‌و گرنگن لای کۆنفۆشیۆس ئەویش (جن) و (لی) یە. جا ژیانی مەردومی نموونەیی پەیوەست‌و سەروومری ئەم دووانەیە. (جن) ناسراوە بە میهرەبان‌و خۆشەویستی‌ی واتە خەمخواری میهرەبانی لەنێو برایانی مەردومدا، بەڵام (لی) ناسراوە بە نەریت‌و رەوشت‌و ئەتەکیەت‌و شۆخ‌وشەنگی‌و ناوبانگی. لە ئامۆژگاریەکانیدا زۆر بایەخی‌داوە بەژیانی خێزانداری‌و ریزگرتنی دایك‌و باوك، هەروەها پەیرەوی‌و سەرنەوایی ژن بۆ میردەکەی، گەل بۆ فەرمانرەوایانی. لەگەڵ ئەمانەیشدا زۆر سەرنج پەرێزیش بووە، لەو بروایەدا بوو کە چەرخی زێرین زۆر دەمیکە رابووردووە. هانی دەسەڵاتدارن‌و گەلی دەدا کە بگەرێنەوە سەر هەڵسەنگاندنە دێرینەکان دەربارەی خۆرەوشت.

کاتی خۆی لەسەردەمی پاشایەتی بنەماڵەی (هان)دا فەرمانبەرانی دەوڵەت هەڵدەبژێران بەتاقیکردنەوە، جا بەشێکی زۆر لەو پرسیارانەی کە لەو کەسانە دەکران بریتی بوون لە ئامۆژگاریەکانی کۆنفۆشیۆس، بەڵام لەم دواییەدا پلەو ناوازی هاتە خوارەوە چونکە چینی کۆمۆنیست شاڵاوێکی توندی کردەسەر کۆنفۆشیۆس‌و پەیرەوانی، لەوانەیشە هەر ستارەیێ گەشی زیاتر بەرەو کزی بروات کە لە دەمێکشدابوو تەواو رەگی خۆی داکوتابوو. زۆر سەیریش نیە چاوەڕوان بکرێت پاش ٥٠ ساڵ یان ١٠٠ ساڵی تر فەیلەسوفێکی وەها هەڵبکەوێت‌و یەکانگیرییەك بسازێنێت لەنیوان ئامۆژگاریەکانی کۆنفۆشیۆس‌و ماوتسی تۆنگ‌دا.

---

(١) دانشت، دانا.



# قەشە پۆلس

٤ پ‌ز - ٦٤ز

St. Paul

قەشە پۆلس... هاوچەرخی عیسا (د. خ)و بەتەمەنیش لەو بچوکتر. مەزنترین پشتگیری ئاینی دیانی‌نویێ بووە. ئەو دەسەڵات‌و کاریگەرییەی کە بووەیەتی،... بۆ سەر لاهوتی دیان بەمەزنترین‌و ناوبانگترین کەس دادەنرێت لە نێو دیاناندا.

پۆلێ یان (سۆلێ) لە شاری تەرسوس - کلیکیا هاتۆتە جیهانەوە، هەرچەندە بە هاووڵاتیەکی ڕۆمان دەناسرا بەڵام هەر لە منداڵیەوە بە باوەڕی جوولەکە گۆشکرا و بە دەمیشیەوە فێری دەوارچنی بوو.

له پاش مردنی عیسا دیانە پێشینەکان تووشی ئازارو لێدانێکی زۆر دەبوون، بە خوانەناس‌و نەفرەت لێکراو دادەنران، پۆڵسیش بەشداری لەو زۆرداریەدا دەکرد بەڵام لە گەشتێکیدا بۆ دیمەشق عیسای لە خەودا بینی‌و کەوتە ئاخاوتن لە گەڵیادا. پاش ئەو گەشتەی ئیتر ڕێبازی گۆڕاو چووە سەر ئاینی نوێ،ئەم گۆڕانەیش بە سەرەتای ڕاپەڕینی دەژمێررێت لە ژیانی تایبەتیدا. ئەو مەردەی کە لە پێشدا زۆرداری دیانان بوو، بووە یەکێ لە پاڵپشتە پۆڵایین‌و کاریگەرە مەزنەکانی دیان.

پۆڵس ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ بیر کردنەوە و نووسین‌و موچیاری بۆ ڕاکێشانی مەردوم بۆ سەر ئاینی نوێ. زۆر شوێن لە ئاسیای ناوەڕاست‌و یۆنان‌و فەڵەستین گەڕا بۆ بانگەوازی ئاینی نوێی دیان. هەر چەندە ئەنجامێکی زۆر چاکی بە دەست هێنا بەڵام نەیتوانی کار بکاتە سەر جوولەکەکان. جاروباریش بە هۆی ڕەوانبێژی‌و موچیارییەوە تووشی گێچەڵ‌و ئازاردان دەبوو، ژیانی دەکەوتە مەترسییەوە لە چەندین بۆنەو کۆڕدا.

وەك سەرنج دەدرێت کاری بۆسەر پسات زۆر سەرکەوتوو بووە جگە لە جوولەکە لەبەر ئەوە هیچ مەردێك وەك ئەم کارێکی وەها فراوان‌و بە پێزی نەگێراوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی دیان.

پاش سێ گەشتی دوورو درێژی، گەڕایەوە بۆ قودس بەڵام لەوێ بە دەسگیرکراوی نێررا بۆ ڕۆما تاکو لە دادگای ڕۆمادا سزا بدرێت. جا نازانرێت چۆن...؟ کەی..؟ ئەو دادگەریە کراوە (لەوانەیە نزیکەی

ساڵی ٦٤ ز ڕوویدابێت) تەنها ئەوی کە دەزانرێت ئەوەیە کە لەنزیك ڕۆمادا لە سێدارە دراو ژیانی کۆتایی پێهات.

پوختەی کارنامەکانی پۆلس بۆسەر گۆڕانکاری دیان لە سێ خاڵی گرنگدا دەردەکەوێت.

١- وەك نەویدەدەرێکی دیانی سەرکەوتنێکی مەزنی بە ئاکام هێنا.
٢ - لە نووسینەکانیدا کە بەشێکی زۆر لە سەردەمی نوێ پێك دێنێت لە دیاندا.
٣ - کاری لە گۆڕانکاری لاهوتزانیی دیاندا.

هەر لە ٢٧ ڕاستکردنەوەی سەردەمی نوێ نزیکەی چواردەیان نیشانەی پۆلسی پێوەیە. بیرکردنەوەیشی سەبارەت بە دیان بەم چەشنە بووە:

عیسا نەك تەنها هەر فروستادەیەکی هەڵکەوتوو بووە بەڵکو کردەیەکی خوایی بووە، بووە قوربانی گوناهەکانمان... هەر ئەو ئازارانەشی فریامان دەکەوێتو سەرفەرازمان دەکات.

بە هیچ جۆرێك مەردوم لە گوناە ڕزگاری نابێت گەر تەنها خۆی بە فەرمانەکانی کەنشتەوە ببەستێتەوە بەڵکو بە دیان گرتنە دڵو دەروون. جا ئەگەر ئەوکەسە دڵیو دەروونی لەگەڵ دیاندا نەبوو وە نەچووە ڕازو نهێنیەکانیەوە ئەوا هەرگیز لە گوناهی نابەخشرێت. زۆر لە دیانە پێشینەکان لە هەندێك پەیڕەوو بیروڕادا لەگەڵ پۆلسدا ناکۆك بوون.

خۆ ئەگەر بیروڕای ئەوان سەربکەوتایە ئەوا باوەڕی دیانی لەوانەبوو لە گوماندا بێت بەو خێرایی‌یە بڵاوببێتەوە هەروەك چۆن ڕوویدا لە ئیمپراتۆرێتی ڕۆمانیدا.

پۆڵس سەرناسەر ژیانی بە ڕەبەنی بردەسەر، تیرڕوانیشی سەبارەت بە هاوسەری و ئافرەت هۆیەك بوو بۆ دەرخستنی چەند هەڵوێستێکی. هەروەکو دەیگوت «بەو کەسانە دەڵێم کە ڕەبەن‌و بێوەپیاون... باشتر وایە هەروەك پێشوویان گوزەران بکەن، گەر نەیشیان توانی ئارام بگرن!! ئەوا با هاوسەری ژیانی خۆیان بدۆزنەوە چونکە چاکترە لەوەی کە سیوایان بیێتەوە»

بیرنامەکانی پۆڵس زۆر کاریگەرو بوێر بووە لە دانانی ئاستی ئافرەتدا هەروەکو دەیگوت «با ئافرەت بە ڕام‌و بێدەنگیەوە فێربێت... بەڵام نابوورێم لەوانەی کە پیاو فێردەکەن یان دەسەڵاتی پیاو زەوت دەکەن، جا کەواتە با بە بێدەنگی کاروباری خۆی هەڵسوڕێنێت چونکە (ئادەم) بەر لە (حەوا) هاتووە».

پۆڵس بە پاڵهێزو لێپرساوی یەکەم دادەنرێت لە گۆڕانی ئایینی دیاندا... گۆڕانی لە گرۆهێکی جوولەکەیی بچوکەوە بۆ ئایینێکی جیهانی. زۆر لە زانایانی لاهوت لە دیاندا خۆیان بە پەیرەوی پۆڵس دادەنێن وەك ئۆگەستین، ئاکۆنیاس، لۆثەر، کاڵڤن..

O

# تسايلون.....

Ts Ai Lun

## نزيكەی ساڵی ١٠٥ زايينيدا ژياوە

تسايلون... داهێنەری كاغەز (پەرە)، ناوێكی زۆر باو نیە لە نێو زوربەی خوێنەواراندا. لەبەر گرنگی داهێنانەكەی‌و بایەخ پێدانی ڕۆژاواییەكان... بابەتە بەوپەڕی گرنگییەوە ئاورێك لەم مەردە نەناسراوە بدەینەوە لەبەر ئەوەی كە نەفەرهەنگێكی زانیاری‌و، وەنە نووسراوە مێژووییەكان تەنانەت ووتارێكیان دەربارەی نەنووسیوە.

تسايلون فەرمانبەرێك بووە لە كۆشكی پاشای چین، ساڵی ١٠٥ ز چەند نموونەیەكی لە كاغەز پێش‌كەش بە (هوت) ی ئیمپراتۆر كردووە.

مێژووی چین لە بارەی داهێنانەكەی تسايلونەوە (كە لە مێژووی بنەماڵەی هان‌دا دەردەكەوێت) بە پاكی‌و ڕاسترەوی ناوی ئەبات كە كارەكەی دوور بووە لە نیشانەیەكی ئەفسونی یان جادوگەری‌یەوە.

ئەوەندە دەربارەی ژیانی تایبەتی نازانرێت بەڵام لە نووسراوو دۆسیەکانی چیندا بە کابرایەکی خەسێنراو ناودەبرێت، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە ئیمپراتۆری چینی زۆر شادمان بووە بەو داهێنانەی تسایلون، لە یاداشتی ئەو داهێنانەی پلەیەکی بەرزو نازناوێکی ئەرەستۆکراتی پێ‌دەبەخشێت بەمکارەی دەوڵەمەند دەبێت، بەڵام بە پیلانو گێچەڵێکی کوشکەوە تووش دەبێتو دەبێتە هۆی داکەوتنی. سەرچاوە چینی‌یەکان باسی ئەوەی دەکەن کە خۆی لەبەرچاو دەکەوێتو زۆر بە رسوایی‌و بێ ئابڕوویی سەیری خۆی دەکرد، جارێك دێ بەسەریادا خۆی دەشواتو بەرگێکی نایاب دەپۆشێ ئینجا خۆی دەرمان خوارد دەکاتو دەمرێت.

بەکارهێنانی کاغەز لەسەدەی دووەمی زایینیدا بڵاوبووەوە لە چین. هەر لە ماوەی چەند سەدەیەکدا کەوتنە دروستکردنی کاغەزو ناردنی بۆ دەرەوەی وڵات (شوێنەکانی تری ئاسیا)، بەڵام نهێنی دروستکردنی هەروا مایەوە و نەیاندرکان تا ساڵی ٧٥١ ز، کاتێك کە ئیسلامەکان گەیشتنە سنووری چین چەند کەسێکیان بە دیل گرت، ئیتر ئەوەندەی پێ‌نەچوو پیشەسازی کاغەز لە سەمەرقەندو بەغدادا بڵاوبووەوە.

ئابەم جۆرە پیشەسازی کاغەز بە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووەوە، لە سەدەی دوانزەهەمیشدا تەواو فێری ئەم پیشەسازییە بوون. گۆتنبێرگی داهێنەریش لە ڕۆژاوادا هەڵکەوتو چاپەمەنی نوێ‌ی داهێنا. کاغەزیش لە بری کلێشە هاتەکایەوە و بووە کەرەسەیەکی گرنگو سەرەکی لە نووسیندا. لەم ڕۆژانە پشماندا ئەوەندەی کە کاغەز

باوه... ئەوەندە زیاتر گرانە بیریکرێتەوە لەوەی کە دەبێت باری جیهان چۆن بێت بە بێ کاغەز!!!

پێش‌هاتنی تسایلون لە چیندا، زوربەی ئەو نوسینانەی سازدەکران لە دارحەیزەران بوو کە زۆر سەنگینو ناپەرداخو نارێك‌وپێك بوو. هەندێك نوسینیان لەسەر ئاوریشمی زۆر گران بەها بوو، لە رۆژاوا پێستی مەرو گۆلك یان دەکردە کلێشە، بەڵام لە دواییدا پاپیرۆس (گەڵاپیزڵ) یان لەباتی پێست بەکاردەهێنا، ئەم جۆرەیان لای رۆمانو یۆنانو میسریەکان زۆر گەوارو باو بوو. جا وەنەبێت گەڵاپیزڵو کلێشە بە دەگمەن دەست دەکەوت بەڵکو کارو ئەرکێکی گرانی دەویستو زۆریشی تێدەچوو.

نوسینی ئەم رۆژگارەیش بە شێوەیەکی یەجگار زۆر دەگەڕێتەوە بۆ کاغەز کە هۆو ترنگەیەکی [1] سەرەکییە. ئاشکرایشە کە ئەوەندە گرنگی نەدەدرا بە کاغەز گەر داهێنانی ئامێری چاپ نەبووایە. هەروەها ئامێری چاپیش ئەو بایەخەی نەدەدرایە گەر مادەیەکی زۆر هەرزانی وەك کاغەز نەبوایە چاپی لەسەر بکرێت.

---

(١) ترنگە: عامل: Factor.

# جۆن گۆتنبرگ.....

Johann Gotenberg

**١٤٠٠ز - ١٤٦٨ ز**

جۆن گۆتنبێرگ... بە داهێنەری چاپەمەنی دەناسرێت بەڵام پیشەی بریتی بووە لە پەرەپێدانی ڕێگەی سەرەتایی لە خستنەکاری پیتە بزوێنەکان و ئامێری چاپ بە ڕێگەیەك کە فرەجۆر نووسراوی چاپ ئاسان کرد بە خێرایی‌و بە ووردی.

ئاشکراو دیارە کە هیچ داهێنانێك بە تاکە کەسێك قەوارەی خۆی ناگرێت، ئەمە... بەسەر چاپەمەنیشدا دەچەسپێت.

مۆر هەڵکەندن‌و ئیمزای گەورە لەسەر هەمان ڕێگەی چاپەمەنی کە دەکرا لە لایەن چینەکانەوە بە چەندین سەدەیەکیش پێش گۆتنبێرگ دەزانرا. نووسراوێکی چاپکراو دۆزراوەتەوە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٨٦٨ز. هەروەها لە ڕۆژاوایشدا چاپەمەنی پێش گۆتنبێرگ دەزانرا. چاپەمەنی ئەو کاتەیش بەهۆی تەختەدار و تاشەبەردەوە بووە کە توانراوە چەند نووسینێکی لێ‌بگیرێتەوە بەڵام ئەم

کاره لە زیان بەولاوە هیچ سوودێکی ئەوتۆی نەبووە، چونکە دەبوایە بۆ هەر نووسینێکی نوێ تەختەدارو تاشەبەرد ببڕایە ڕێکوپێك بکرایە. لەبەرئەوە ئەم ڕێگەیە لەبارو بەکار نەبوو بۆ بەرهەمهێنانی فرەجۆر لە نووسینی جیاجیادا.

هەندێ جار دەڵێن هاوبەشی گۆتنبێرگ لەم بوارەدا بریتیبووە لە داهێنانی پیتە بزوێنەکان، بەڵام تەنانەت ئەمەیش هەر لە چیندا لە نزیکەی سەدەی دوانزەمدا داهێنراوە لەسەر دەستی کابرایەك بە ناوی (بای شنگ). ئەو پیتانەی کە بەکاری دەهێنان دروستکرابوون لە جۆرە قوڕێك کە ئەوەندە خۆی نەدەگرت بەڵام پیاوانی چینیو کۆریاییەکان چەند دەسکارییەکی باشیان تیادا کرد. کۆرییەکان پێش گوتنبێرگیش پیتی میتاڵیان بەکار دەهێنا، دەوڵەتی کۆریا هانو پاڵپشتی دەزگای پیتسازی چاپەمەنی ئەدا لەسەرەتاکانی سەدەی پانزەیەمدا.

بەم هەموو بەڵگانەوە دەتوانین بڵێین هەڵەیە گەر بیربکەینەوە لە (بای شنگ) و دابیبنێین بە کاریگەرێك لەم بوارەدا. لە ڕاستیشدا ئەوروپا هیچ شتێکی دەربارەی پیتە بزوێنەکانی نەزانیوە وەك لە چیندا بەکار دەهێزا بەڵام سەربەخۆیانە گۆڕانکارییان تیادا کردووە. سەیر ئەوەیشە کاتێك ئەوروپاییەکان پێشکەوتوانە دەستیان کردە چاپەمەنی لە چیندا هێشتا ئەوەندە باونەبوو.

لێرەدا چوار کەرەسەی سەرەکی گرنگ هەیە لە چاپەمەنیدا:

یەکەم: پیتە بزوێنەکانو دانانی لە جێگەی خۆیدا.

دووەم: ئامێری چاپ.

سیهەم: جۆرێکی گونجاو لەو ئاوێتە کیمیاییانەی بەکار دەهێنرێن.
چوارەم: دۆزینەوەی مادەیەکی شیاو (واتە کاغەز) کە لە سەری چاپ بکرێت. زرنگی‌و هونەری گۆتنبێرگ لە چاپەمەنیدا دەگەرێتەوە بۆ چۆنیەتی کۆکردنەوەی ئەو کەرەسەو پێویستیە گرنگانەی کە لە سەری دواین‌و دانانی لە رژێمێکی بەکارو هەرزان بەهاو هەمیشە بەرهەمدا. گوتنبێرگ ئەو بەرهەمە کاریگەرەی بە کردار پێش‌کەش بە جیهان کرد کە ئەمەیش یەکێکە لەو دیمەنە ژیاریانەی نوێ‌ی پسات.

دەربارەی ژیانی گوتنبێرگ ئەوەندە نازانرێت بەڵام ئەوەی کە دیارە ئەوەیە نزیکەی ساڵی ١٤٠٠ز لە شاری (مینز)ی سەر بە ئەڵەمانیا لە دایك بووە. لە ناوەراستی سەدەی چواردەمدا دەستی داوەتە چاپەمەنی، باشترین پەراو کە چاپی‌کردووە ناسراوە بە (تەوراتی گۆتنبێرگ). پێوەی دیار نەبووە کە کارمەندێکی سەرکەوتوو بوو بێت لە ژیانیدا، تەنانەت نەیشیتوانیوە بە هۆی داهێنانەکەیەوە دەوڵەمەند بێت.

دەڵێن گوایە بە هۆی هەراو ناکۆکییەکەوە راپێچی دەکەن بۆ دادگا، یەکێ لەو سزایانەی دادگا... زەوت کردنی ئامێری چاپەکەی دەبێت‌و دەدرێت بە هاوکارەکەی کە ناوی (یۆهان فاست) بووە.

گۆتنبێرگ لە ساڵی ١٤٦٨ ز دا دەمرێت‌و ئەو داهێنانە مەزنەی لە پاش خۆی بەجێ دەهێڵێت.



# کریستۆفەر کۆلمبس.....

١٤٥١ ز - ١٥٠٦ ز

**Christopher Columbus**

کۆلۆمبس بە گەڕانو هەوڵدانێکی بێ‌ووچان بە دوای ڕێگەیەك بەرەو ڕۆژاوا لە ئەورووپاوە توانی زەوییەکانی ئەمەریکا بدۆزێتەوەو ناوبانگو دەسەڵاتێکی بێ‌هاوتا پەیدا بکات لە مێژووی جیهاندا بە ڕادەیەك کە هیچ بە هۆشیدا نەدەهات. دەرووی دوو کیشوەری بۆ گەلانی ئەورووپا کردەوە، پەیتا پەیتا بێ‌شمارانە لەگشت وولاتێکەوە سەریان تێ‌دەکردو جێنشین دەبوون تا وای لێهات ئەو کیشوەرە نوێیە بووە سەرچاوەیەکی گرنگی کانو کەرەسە خاوەکان بە ڕادەیەك باری ئابووری ئەورووپای سەرتاپا گۆڕی. ئەم دۆزینەوە بووە هۆی لە ناوبردنی

شارستانی‌ی هیندیە ئەمەریکاییەکانو پێکهێنانی کۆمەڵێك لە گەلانی نوێ لەسەر ئەم دوو کیشوەری سەرزەمینە کە بە تەوازی جیاوازن لە گەلانی هیندە جێنشین بووەکانی ئەو ناوچانەو کاریان بۆ سەر گەلانی جیهانی نوێ.

ژیانی کۆلۆمبس تا رادەیەك لای هەموان ناسراوە، ساڵی ١٤٥١ز لە شاری جەنەوا – ئیتالیا لە دایك بووە، لە لاوێتیدا بووە سەروانی کەشتی‌و دەریاوانێکی کارای لێهاتوو، پاش ماوەیەك کەڵکەڵەی ئەوە کەوتە سەری کە دەبێت پەی بە رێگەیەك بەرێت‌و خۆی بگەیەنێتە رۆژهەلاتی ئاسیا بەڵام دەبێت لە رۆژاوا وە دەست پێبکات وە لە رێگای دەریاوە یەکسەر بە ئۆقیانوسی ئەتڵەسیدا.

زۆر بە سەرگەرمی‌و سەهەندیەوە بیری لەو گەشتە دەکردەوە تاکو خاتو ئیزابێلا شای رازی کرد (پاشای کەشتالەی ئەسپانیا) و وای لێکرد کە دارندەو هەمەرایی ئەو گەشتەی بکات.

لە ٣ ی ئابی ١٤٩٢ زدا کەشتیەکانی کۆلۆمبس ئەسپانیایان بەجێهێشت، یەکەم شوێن کە تیایدا راوەستان لەندەکانی [1] کەناری بوو کە دەکەونە لای رۆخەکانی ئەفەریقاوە، پاشان یەکسەر بەرەو رۆژاوا رێیان گرتەبەر، لەبەر ئەوەی گەشتەکە زۆر درێژەی کێشا ناچار دەریاوانەکان ترس‌و سامیان لێنیشت‌و نیازی ئەوەیان بوو کە بگەرێنەوە. بەڵام بێباکی‌و جەربەزەیی کۆلۆمبس کۆڵی پێدانو پەشیمان بوونەوە لەو پاشگەزییەیان. ئەوەبوو لە ١٢ی تشرینی ١٤٩٣ زدا ووشکانییان لێوە دەرکەوت.

مانگی ئازاری سالّی دوایین کۆلۆمبس گەڕایەوە بۆ ئەسپانیا، پێشوازییەکی یەجگار گەرمیان لێ کردو رێزیان لێگرت، بە قارەمان ناوی دەرچوو. جا چونکە هەر لەسەر ئەو بیرو خولیایەدا بوو کە چۆن بتوانێت بگاتە ئاسیای خۆرەڵات، خەڵکیش لەولاوە هەر لەو باوەڕەیاندا بوون کە سەرکەوتوو نابێت لەو کارەیدا.. ئەوە بوو پاش ئەو گەشتەی کە بۆ ئەمەریکا کردی سێ گەشتی تری یەك لە دوای یەك سازکرد هەر لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسییەوە بە ئومێدی ئەوەی راستەخۆ بگاتە چین‌و یابان... بەڵام ئەو ئومێدەی نەهاتە دی..!!!

خاتو ئیزابێلا لە پاداشتی ئەو کارە مەزنەی بڕیاریدا بە دانانی بە فەرمانڕەوای زەویە دۆزراوەکان بەڵام بە هۆی چەند کارێکی نارەوای لە کاریان خست‌و هێنایانە خوارەوە، هەر بە کۆتکراویش گەڕانیانەوە بۆ ئەسپانیا ئینجا لەوێ بەرەڵایان کرد. لەدوای ئەوەوە ئیتر هیچ کارێکی میرییان نەدایە. ئەو دەنگەی کە باوەو باسی دەکەن ئەوەیە کە گوایە بە هەژاری سەریناوەتەوە.. بەڵام راست نیە چونکە کاتێك کە مرد لە سالّی ١٥٠٦ ز دا لەوپەڕی زەنگینیدا بوو.

زۆر روون‌و ئاشکرایە کە کۆلۆمبس لەو گەشتەیدا بۆ ئەمەریکا کارێکی شۆڕشگێڕانەی کردە سەر مێژووی ئەوروپا. تەنانەت ئەو مێژووەی کە لەبەر دەستی خوێندکاراندایە یەکسەر سالّی ١٩٤٢ ز یان دێتەوە یاد، بەڵام هەندێك گازندە هەیە لەسەر پۆلاندنی کۆلۆمبس لە نێو ئەم لیستەدا.

یەکێ لەوانە ئەوەیە کە کۆلۆمبس بە یەکەم کەسێکی ئەوروپایی

دانانرێت له دۆزینەوەی جیهانی نوێدا، بەڵکو (ئەمریکۆ ڤیسپوشیۆ) یە[٢]،... ئەو دەریاوانە باکورریە کە گەیشتە ئەمەریکا بەر لە کۆڵۆمبس بە چەند سەدەیەك. لەوانەیشە زۆر لە ئەورووپیە ئارییەکان چەندین جار ئۆقیانووسی ئەتڵەسیان بری بێت‌و گەیشتبنە ئەمەریکا لەو سەردەمەی نێوان ئەمریکۆو کۆڵۆمبس.

بەڵام لە تێروانینی مێژوویەوە ئەمریکۆ دانانرێت بە کەسێکی گرنگ وەك کۆڵۆمبس کە ناوبانگی ئاسۆی بەرینی گشت ئەورووپای گرتەوە. یەکێ لە ئاکامی گەشتەکەی کۆڵۆمبس دەست پێکردنی پەلامارو هێرشی ئیمپرایالی نوێ بوو بۆ ئەمەریکا بە نیازی سامانێکی چاوەڕوانکراوی دەسکەوتوو.

هەروەکو زوربەی ناودارانی ئەم پەڕاوە سەرنجیان بۆ ئەوە دەڕوات کە ئەو کارەی کۆڵۆمبس چاوەڕوان دەکرا کە کەسێکی تر پێی هەڵ-ستابایە چونکە ئەورووپای ئەو سەردەمە لە بارێکی ووروژان‌و هەڵچووندا بوو، بزوتنەوەیەکی بەجگار فراوانی هەبوو لە بازرگانییدا بەرادەیەك کە ئەو دۆزینگەریە چاوەڕوان دەکراو دەبووایە ڕووی بدابایە.

کۆڵۆمبس هەرچەندە مەردێکی خۆشەویست‌و خوێن شیرین بووە بەڵام ڕژدو پولەکیش بووە. لێی دەگێرنەوە کە بێبەزەییانە ڕەفتاری لەگەڵ سوورەهیندیەکان دەکرد، جا ئەگەر ئەم لیستەیە تەنها هەر بۆ کەسانی ڕەوشت بەرزان تەرخان بکرابایەو ئەوانەی تیادا نەبایە کە کاریگەربوون لە مێژوودا... ئەوا کۆڵۆمبس ناوی خۆی نەدەدیەوە لەم پەڕاوەدا.

(١) لەندە: جزیرە. (٢) (Americo Vespucio) ١٤٥١ز – ١٥١٢ز



# ئەلبێرت ئەنشتاین...

١٨٧٩ز - ١٩٥٥ز

Albert Einstein

بە مەزنترین زانا ی زانایانی سەدەی بیستەم دادەنرێت، بە خاوەن مێشکێکی هەڵکەوتوی هەموو چەرخێك دەدرێتە قەڵەم. ناوەکەی بە بیردۆزەی خزمایەتی[١] Relativity ئاوێزاوەو تێکەڵ بووە. ئەم بیردۆزە دوو بیردۆزە دەگرێتەوە: یەکەمیان بیردۆزەی خزمایەتی تایبەتی یەکە لە ساڵی ١٩٠٥ زدا دایڕشتو ئەویتر بیردۆزەی خزمایەتی گشتی یە کە داڕشتنەکەی ساڵی ١٩١٥ بوو کە چاك وایە ناوبنرێت بە - بیردۆزەی ئەنیشتاین لەسەر ڕاکێشان - هەردوو بیردۆزەکە لەوپەڕی ئاڵۆزیدان، لێرەدا هەوڵی ئەوە نادەین ڕاڤەی هیچیان بکەین بەڵکو دەمانەوێ دەمەتەقێیەك لەسەر - خزمایەتی ی تایبەتی - بکەین بەڵام بەکورتی.

قسەو باسێك لە ناو خەڵكا باو و ئاشنایە کە دەڵێت هەموو شتێك بۆ یەکتر خزمە (یان «نیسبی» یە) واتە هەر شتە بە پیێی خۆیو لە چاوخۆیدا، بیردۆزەی ئەنیشتاین وەنەبێت ووتنەرەو دووپاتکردنەوەی ئەم قسە هیچە بێت بەڵکو قاڵبێکی بیرکارانەیە بەرێگەیەك کە پێوانی زانسنیانە بە خزم واتە یەکێك لە چاو ئەوی تردا نیشان دەدات.

ئاشکرایە کە هەستو نەستی مرۆڤ خۆی بۆ تێگەیشتن لە بۆشاییو کات لەسەر ئەو کەسە وەستاوە کە سەرنج دەدات. پێش ئەنیشتاین زۆر کەس باوەڕیان وابوو ئەگەر لەم بوارە وا بدوێن ئەوا – هەروەك پێوانی سەر زەوی – و بە خەیاڵ دووریيەکی ڕاستیو کاتێکی ڕەبەق (ڕەها) Absolute هەیەو ئامێری پێوەری وورد دەتوانێت بە کارامەیی بیپێوێت.

بەڵام بیردۆزەکەی ئەنیشتاین شۆڕشێکی بەرپا کرد لە بیرکردنەوەی زانستیدا، ووتی کە کاتی ڕەبەق هەرنیە، ئەم نموونەیەیشی کە لە خوارەوە یەکاڵای دەکەینەوە بیرکردنەوەی ئێمەی ڕاست کردۆتەوە لە بارەی کاتو بۆشاییيەوە.

وا دابنێ کەشتییەکی ئاسمانی هەیە – با ناوی کەشتی X بێت – بە خێرایی ١٠٠٠٠٠ کم / چرکە لە زەوی دوور دەکەوێتەوە، هەر کەسێك لەسەر کەشتی بێت یان سەر زەوی ئەگەر خێرایی بپێوێت ئەوا یەك ئەنجام ئەپێون بێ کەمو زۆر. هەر لەم هەنگامەدا گریمان کەشتیەکی

تر – با ناوی بنێین y – به هه‌مان ئاراسته‌ی که‌شتی یه‌که‌م x بۆی ده‌رچوو به‌ڵام به خێراییه‌کی زۆرتر. ئێستا ئه‌گه‌ر یه‌کێك له‌سه‌ر زه‌وی بیه‌وێت خێرایی که‌شتی y بپێوێت ئه‌وا ده‌بینین که y به‌خێرایی ١٨٠٫٠٠٠ کم / چرکه له زه‌وی دوور ده‌که‌وێته‌وه، خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌وانه‌ی سه‌رکه‌شتی y یش خێرایی بپێون ئه‌وا هه‌ر هه‌مان ژماره‌یان چنگ ده‌که‌وێت.

ئێستا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که هه‌ردوو که‌شتیه‌که به هه‌مان ئاراسته ده‌ڕۆن، ئه‌وا وا ده‌رده‌که‌وێت که جیاوازی نێوان خێراییه‌کانیان – ٨٠٫٠٠٠ کم / چرکه – یه‌که وکه‌شتیه خێراتره‌که له که‌شتیه‌که‌ی تر به تێکرایی ٨٠٫٠٠٠ کم / چرکه له یه‌کتر دووررده‌بن. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یشدا بیردۆزه‌ی ئه‌نیشتاین پێشبینی ئه‌وه ده‌کات که ئه‌گه‌ر ڕوانکاره‌کانی سه‌ر هه‌ردوو که‌شتیه‌که پێوه‌رکاری بکه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه ڕێك ده‌بن که ماوه‌ی نێوان هه‌ردوو که شتیه‌که به‌ره‌به‌ره به خێرایی ١٠٠٫٠٠٠ کم / چرکه یه‌کدا پتر ده‌کات نه‌ك به ٨٠٫٠٠٠ کم / چرکه.

له ڕواڵه‌تدا ئه‌م ئه‌نجامه له‌وانه‌یه گاڵته‌ی پێبکرێت، وه له‌وانه‌یشه گه‌لێك وابزانن که لێره‌دا مه‌ته‌ڵێکی زارشتی یان فێڵێکی ووشه‌وانی هه‌یه، یان چه‌ند درێژییه‌ك به بابه‌ته‌که نه‌درابێ بۆ ڕێ‌گومکێ. به‌ڵام ڕاستیه‌که‌ی ئه‌مه نه‌فێڵه‌و نه‌ڕێ‌گومکێ‌ی ووشه‌وانیه‌و به هیچ جۆرێك چه‌شنی دروستکردنی که‌شتیه‌که‌و ئه‌و هێزه‌ی پێ‌ی ده‌هاوێژرێت نیه‌و... هیچ هه‌ڵه‌یه‌کیش له ڕوانکاره‌کانه‌وه نیه... به‌ڵکو هه‌ر ئه‌و قسه ڕاسته‌و ئه‌نجامێکی سروشتی‌ی‌و بنه‌ڕه‌تی‌ی کات‌و بۆشایی‌یه.

ڕەنگە وا دەرکەوێت کە هەرچیەکیان ووتبێت قسەیەکی بیردۆزانەی سەمەرەبێت. چەند ساڵێکیشی بەسەرا ڕۆیشت خەڵك هەروای دەزانی کە بیردۆزەی خزمایەتی گریمانەو خۆی هەڵداوە لەسەر قوڵلەیەکی بەرزو بڵنداو هیچ بەڵگەیەکی زانستیانە پشتی ناگرێت، بەڵام پاش ئەوەی ساڵی ١٩٤٥ز بۆمبای ئەتۆمی درا بەسەر هیرۆشیماو ناگازاکی‌دا تێڕوانینی خەڵکیش گۆڕرا، چونکە یەکێك لە دەرەنجامەکانی بیردۆزەی خزمایەتی ئەوەیە کە ماددەو ووزە تارادەیەکی زۆر هاوشانی یەکترن‌و پەیوەندیەکەیان بەم هاوکێشەیە دەدرێت :

$$و = ب \times خ^{2}$$

و = ووزە ب = بارستە خ = خێرایی ڕووناکی

جا کە (خ) یەکسان بێت بە ١٨٦,٠٠٠ میل/چرکە = ٣٠٠,٠٠٠ کم/چرکە، وەك دیارە ژمارەیەکی زۆر گەورەیە، ئەو $خ^{2}$ ژمارەیەکی یەجگار فرەگەورەیە، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر بڕێکی زۆر بچوکی مادە بگوررێت بۆ ووزە، ئەوا ئەو ووزە بڕێکی یەجگار فرەگەورە دەبێت .

مرۆڤ ناتوانێت بۆمبای ئەتۆمی یان کارلێگای ئەتۆمی[٢] لە هاوکێشەی $و = ب\ خ^{2}$ دروست بکات، ئەوەیش پێویستە بزانین کە زۆر لە زانایانی تر هەبوون دۆخێکی گەورەیان دیوە لە پەرەپێدانی ووزەی ئەتۆمیدا، بەڵام بەشداری ئەنیشتاین ناتوانرێت گرنگیەکەی ئاستن بکرێت. سەرەڕای ئەمانەیش ئەو نامەی ئەنیشتاین کە ناردی بۆ سەرۆك ڕۆزفلت ساڵی ١٩٣٩ز نیشانی دەدات کە لە توانادا هەیە

چەکی ئەتۆمی پەرەی پێبسەنرێت، گرنگی رۆڵی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەردەخات لە پەرەپێدانو هێنانەکایەوەی، هەر بەو پرۆژەیەش یەکەم بۆمبای ئەتۆمی دروستکرا .

خزمایەتی تایبەتی بووە هۆی مشتو مڕێکی توندو تیژ، ئەم بیردۆزە بە مۆتەکەیەك دادەنرا بۆ سەر هۆشی مرۆڤ، بەلآم هەر قسەو پەسنێك بەم جۆرە هەڵەیە چونکە بیردۆزەی ئەنیشتاین پێشەکیەکی زارشتانەی هەیە. ئەنجامی ڕاکێشان هۆکەی ناگەڕێتەوە بۆ چەند هێزێکی فیزیکی بەو جۆرەی تا ئێستا لێی تێگەیشتوین بەڵکو بە هۆی کووری یان قۆقزی بۆشایی خۆیەوەیە، کە ئەمەیش بەڕاستی شتێکە سەرسامان دەکات .

مرۆڤ چۆن دەتوانێت لە بیری کووری بۆشاییدا بێت؟ مانای چیە کە بۆشایی کوورە (قۆقزە)؟ ئەنیشتاین تەنیا بیردۆزەکەی نەهێناوەو بەس بەڵکو بیردۆزەکەی لە قالبێکی بیرکاریانەی ڕووندا داڕێژراوە بە ڕەنگێك گریمانەکانی بیردۆزەکە بۆمان دەردەکەوێت ڕاستە .

گەلێك سەرنجو تاقیگەری – لەم دواییەدا – لای ئەوەی گرت کە بیردۆزەکەی ئەنیشتاین ڕاستە، نەخوازە ئەو سەرنجانەی کە لە خۆرگیرانی تەواودا دەدرا، ئەو سەرنجانە بە هەمیشە ڕاستیی هاوکێشە بیرکاریەکانی ئەنیشتاینی دەسەلماند .

ئەنیشتاین ساڵی ١٨٧٩ز لە شاری ئۆڵم – ئەڵەمانیا لە دایك بووە لە خوێندگا بالآکانی سویسرە خوێندویەتی، لە ساڵی ١٩٠٥ز بۆتە

هاوولاتیەکی سویسری، هەر لەو ساڵەدا بیردۆزەی خزمایەتیەکەی بلاو کردۆتەوەو ناوبانگی پێ دەرکردووە.

بەلام بیردۆزەکانی زۆر جێی مشتو مڕ بوونو هیچ بیردۆزەیەك - بێجگەلە داروین - ئەوەندە دوو چاری ئەم مشتو مڕە نەبووە.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەنیشتاین لە زانکۆی بەرلین ساڵی ١٩١٣ز دا بە ئوستاد دامەزرا، لە هەمان ساڵدا بوو بە بەڕێوەبەری زانستگای فیزیکی قەیسەر ولیەمو ئەندام لە ئەکادیمی زانستەکانی پرووسیایی، ئەمە هەلێك بوو بۆ ئەو کە چۆنی بوێت خۆی تەرخان بکات بۆ لێکۆڵینەوەو زانستگەریی. لەساڵی ١٩٢١ز دا خەلاتی نۆبڵی وەرگرت، بەلام کاتێك هێتلەر فەرمانڕەوایی ئەڵەمانیای گرتە دەست، ئەنیشتاین چوو بۆ شاری نیوجێرسی لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چونکە جوولەکە بوو. لە ساڵی ١٩٥٥ زدا کۆچی دوایی کرد.

---

(١) خزمایەتی : وا بزانم خزمایەتی پڕ بە پێستێتی، هەمان مانایش لە زمانی عەرەبی (نسبية)و ئینگلیزیو فەرەنسی دەگرێتەوە چونکە بریتی یە لە پەیوەندیەك (یان خزمایەتیەك) لە نێوان، کات شوێن، بارستە.
- وەرگێر -

(٢) کارێگای ئەتۆمی : ATomie reactor.



# کارڵ مارکس

١٨١٨ز - ١٨٨٣ز

Karl Marx

کارڵ مارکس... دامەزرێنەری ڕێبازگەی سۆشیالیزمی زانستیی سالّی ١٨١٨ز لە شاری تریر - ئەڵەمانیا لە دایك بووە. باوکی پارێزەر بووە. لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا چۆتە زانکۆی (بۆن) بۆ خوێندنی قانون، پاشان چووەتە زانکۆی بەرلین، بڕوا نامەی دکتۆرای فەلسەفەی لە زانکۆی (یینا) وەرگرتووە .

لە دواییدا رووی کردە ڕۆژنامەگەری و پاش ماوەیەکیش بووە سەرنوسیاری ڕۆژنامەی (ڕێنیش زیتنگ) لە شاری کولۆن بەلاّم لەبەر تێڕوانینە شۆڕشگێڕیە ڕادیکاڵیەکانی تەنگی پێ‌هەڵچنرا و چووە

پاریس، لەوێ ئاشنایەتی پەیدا کرد لەگەڵ «فریدریك ئەنجلز» و بوونە دۆستو هاوڕێی یەکتر بە درێژی ژیانیان.

زۆری پێنەچوو لە فەڕەنسایش دەرکراو ڕوویکردە شاری برۆکسل لەوێ یەکەمین کارنامەی خۆی بلاوکردەوە بە ناوی (نائومێدی فەلسەفە)، لە ساڵی دواینیدا لەگەڵ ئەنجلز یەکەم نووسراوێکیان پێکەوە دەرکرد لەسەر خواستی کۆمەڵەی کۆمۆنیستان بەناوی «بانگەوازی کۆمۆنیزم». لە کۆتایی ئەو ساڵەدا مارکس گەڕایەوە بۆ شاری کۆلۆن بەلام چەند مانگێکی نەبرد کە دیسان دەرکرایەوە. ئەمیش ناچار چوو بۆ لەندەن، ئیتر تا دوا ژیانی لەوێ مایەوە، زوربەی کاتیشی لە لەندەن بە نووسینو لێکۆڵینەوەی ڕامیاریو ئابووری دەبردەسەر و خۆیشی پێ دەژیان، هەر لەو ساڵانەیشیڕا ئەنجلزی دۆستی دارایی خێزانەکەی دەکرد، یەکەم بەرگی لە نووسینە گرنگەکەی بە ناوی (سەرمایە) لە ساڵی ١٨٦٧ز وەدەرکەوت، بەلام ساڵی ١٨٨٣ز مردو نەیتوانی دوو بەرگەکەی تری بە ئەنجام بدات، ئەنجلز ئەو کارەی گرتە ئەستۆی خۆیو هەرچیشی پێویستبوو لەو سەرنجو نەخشانەی کە مارکس بەجێی هێشتبوو بە ئەنجامی گەیاند. نووسینەکانی مارکس بنچینەی کۆمۆنیزم پێکدەهێنێت، جا لەبەر بایەخ پێدانێکی زۆر بە بزوتنەوەی کۆمۆنیستی لە سەدەی بیستەمدا دەبێت شایانی پلەو ئاستێکی بەرز بێت لەم لیستەدا.

لەم سەردەمەداو ڕابووردنی سەد ساڵ بەسەر مردنی مارکسدا ژمارەی ئەو کەسانەی کە مارکس باوەڕن خۆی ئەدات لە نزیکەی

۱٫۳ بلیۆن کەس، ئەم ژمارەیە زۆر لە ژمارەی ئەو کەسانە زۆرترە کە ڕێبازی تریان گرتۆتە بەر لە مێژووی مەردومدا .

کۆمۆنیزمی ئێستا کیْ بەندە لەسەر چوار بیری سەرەکی : —

١. زەنگینەکان کەمن و لەوپەری خۆشی و شادیشدا دەژین بەلام کرێکاران لەوپەری هەژاری کوڵەمەرگیدا دەژین .

٢. تاکە ڕێبازێك بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم ناهەموارییە دانانی ڕژێمێکی سۆشیالیستی یە، واتە ڕژێمێك کە گەل خاوەنی ئامرازە بەرهەم هێنەرەکان بێت نەوەك چەند بۆرە کەسانێك دەستی بەسەرا بکێشن .

٣. لە زۆر جارو باردا... شۆڕشی سۆشیالیستی تاکە ڕێبازێکە بۆ ڕامالێنی ڕژێمی سەرمایەداری .

٤. بۆ پاراستنی ئەم شۆڕشە سۆشیالستیە پێویستە دیکتاتۆری چینی کرێکاران بپارێزرێت بۆ سەردەمێکی گونجاو و لەبار .

لێرەدا گرنگی فەیلەسوف تەنها لە فەلسەفەکەیدا خۆی نانوێنێت بەڵکو لە کاریگەری و بزواندنی مرۆڤدا بۆ کارپێکردنی. جا ئەگەر لەم ڕۆژنەوە مارکس بسەنگێنین ئەوا گرنگییەکی گەورەی تیادا بەدی دەکرێت .

○



# لویس پاستۆر...

۱۸۲۲ز - ۱۸۹۵ز

**Louis Pasteur**

کیمیاگەرو زیندەناسی فەرەنسایی لویس پاستۆر... بەیەکێ لە گرنگترین و کاریگەرترین کەسێك دادەنرێت لە مێژووی پزیشگەریدا. لە زۆر ڕشتەزانستەکانی تردا دەستێکی بالأی هەبووە، بەلأم زیاتر بەوە ناسراوە کە بەرگری لە بیردۆزەی میکرۆبە نەخۆشیەکان کردووەو بۆتە پالپشتێك بۆی، هەروەها گۆڕانکار بووە لە تەکنیکی کوتانی خۆپاراستن Prophylactic Vaccination.

پاستۆر ساڵی ١٨٢٢ز لە شاری (دۆڵ)ی فەرەنسادا لە دایك بووە، خوێندنی زانكۆی تەواو كردووە بەڵام بلیمەتی زۆر درەنگ لێ‌ی دەركەوتووە، بەوەی كە كاتێك خوێندكار بووە مامۆستاكەی لەسەری نووسیوە كە خوێندكارێكی ئەوتۆ نیە سەرنج ڕاكێش بێت، بەڵام پاش ئەوەی پلەی دكتۆرای وەرگرت لە ساڵی ١٨٤٧ز دا... دەركەوت كە مامۆستاكەی بە هەڵەدا چووە.

هێشتا لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا بوو كە زانستگەری‌و لێكۆڵینەوەكانی دەربارەی (ترشی تارتاریك) وای لێكرد ببێتە كیمیاگەرێكی فرەزان‌و ناودار. پاش ئەوە... چالاكی خۆی تەرخان كرد بۆ زانین‌و ڕەبازكاری هەوێنەكان Fermentation. پاستۆر سەلماندی كە هەوێن لە ئەنجامكاری جۆرێكی تایبەتە لەو زیندە میكرۆبانەی كە زۆر درشتن، هەروەها سەلماندی كە بوونی چەندین جۆری تر لەو زیندە میكرۆبانە ئەنجامێكی ناپەسەند دەدەن وەك دیارە لە خواردنەوە ترشاوەكاندا.

ئەم كارانە وای لێكرد بیگەیەنێتە ئەو بیرەی كە چەندین جۆر هەیە لە زیندەمیكرۆبەكان دەبنە هۆی كارێكی ناپەسەند بۆ سەر مەردوم‌و گیانەوەرانی تر.

پاستۆر وەنەبێت یەكەم كەسێك بووبێت ئەم ڕشتەیە ئاشكرا بكات بەڵكو زۆر كەسانی تریش هەمان بیركردنەوەیان هەبووە پێش پاستۆر وەك (جیرۆ لامۆفرا كاستۆر) و (هەنلی) و چەند كەسی‌تر، بەڵام چوست‌و سووربوونی پاستۆر لەوەدا دەردەكەوێت كە لەسەر ئەو بیرو گریمانانەی مایەوەو پاڵپشتی ئەو بیردۆزەی دەربارەی میكرۆبەكان

دەکرد، بە تاقیکاری جۆرانجۆر بەڵگەی دەهێنایەوە. هەر بەم کارە مەزنەی توانی ڕاستی بیردۆزەکەی بە کۆمەڵی زانستان ڕابگەیەنێت‌و باوەڕیشی پی‌بهێنن.

ئەگەر نەخۆشی‌ی هۆیەکەی میکرۆب بێت ئەوا بەرهەڵستی لی‌ی‌و نەهێشتنی بچێتە نێو لەشی مرۆڤەوە دوورمان دەخاتەوە لە نەخۆشی. هەر لەبەر ئەمەیش پاستۆر زۆر توندڕەو بوو لە ئاگادار کردنی پزیشکان بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی ڕێخاوێنی. هەر ئەم ئاگاداریەیشی کارێکی سەرەکی بوو بۆ سەر (دکتۆر جۆزیف لیستەر) لە بەکارهێنانی ڕێخاوێنی لە تەکنیکی نەژداری‌ی‌و پێش‌کەشکردنی بۆ پسات.

ئەو بەکتریا زیاندەرانە دەچنە نێو لەشی مرۆڤەوە بەهۆی خۆراك‌و خواردنەوە. جا بۆ ئەم مەبەستە پاستۆر ڕێیەکی پەرەپێدا کە پی‌ی دەوترێت پاستۆرێن Pasteurization بۆ لەناوبردنی میکرۆب لە خواردنەوەکاندا بەم ڕێگەیەی پیشانی‌دا کە شیری میکرۆباوی سەرچاوەیەکە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی‌ی.

پاستۆر تەمەنی لە نێوەندی پەنجاکاندا بوو زۆر سەرنج‌و بایەخی دەدا بە شێرپەنجە[١] Anthrax کە دەردێکی درمە ئاژەڵ‌و چەندین تەبا[٢] تووشی دەبێت، تەنانەت مرۆڤیش.

لەمەوە پاستۆر دەریخست کە جۆرە بەکتریایەکی تایبەتی هەیە دەبێتە هۆی ئەم دەردە. ئەویش بە بەکارهێنانی زیجکاوێکی لاواز لە ژاژیلەکانی[٣] bacillaceae بەکتریای شێرپەنجەو گیانەوەرێکی پی‌کوتا. پاش ماوەیەك سەرنجی‌دا ئەم زیجکاوە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی

شێوەیەکی سووك لە شێوەکانی ئەو نەخۆشییە بەڵام کوشندە نیە بەڵکو یارمەتی ئاژەڵ دەدات تاکو بەرگری پەیدا بکات acquired immunity لەو شێوە سووکەی.

ئەم ڕێگەیەی دڵی زۆر خەڵکی پێ خۆش کرد بە ئومێدی ئەوەی بەکاربهێنرێت و بخرێتەگەڕ لە دژی زۆر لەو نەخۆشییانەی کە بلاودەبێتەوە . بەلام بۆ مرۆڤ ڕێگەیەکی گەوارترو ڕێکوپێك تری هێنایە کایەوە بۆ کوتان لە دژی نەخۆشی هاری کە سەگ تووشی دەبێت. ئەمە بووە دەروویەك بۆ زانایانی تریش کە هەمان ڕێکار بجەنە گەر بۆ کوتانی چەند نەخۆشی ترسناك وەك: تیفۆس (ڕەشە گرانەتا) Typhus ، پەنکی منداڵ[4] Infantle Paralysis.

هەروەها توانی دیاردەی بێ هەوایی anerobe بدۆزێتەوە کە توانای ژیانی هەندێك گیانەوەرانە بە بێ ئۆکسجین یان بە بێ هەوا .

کارە مەزنەکانی لە نەهێشتنی ئەو نەخۆشییانەی کە کرمی ئاوریشم تووشی دەبێت سوودێکی یەجگار گەورەی گەیاند لە بازرگانیدا .

لەو دەسکەوتە مەزنانەی تریشی گۆڕانکارییە لە کوتانی مریشك (مامر) لە دژی نەخۆشی کۆلێرا کە زوربەی باڵندە کەوییەکان[5] تووشی دەبن .

پاش ئەو کارە مەزنانەی کە بۆ پساتی بەجێ هێشت لە ساڵی ١٨٩٥زدا ماڵاوایی کردو کۆچی دوایی کرد .

---

(١) شێرپەنجە: ڕەژوەك.
(٢) ئەبا : حیوان : ئەرش.
(٣) زازیلە : عصبات .
(٤) پەتك : شلل .
(٥) کەوی : مالی



# گالیلۆ
# گالیلــی...

١٥٦٤ز - ١٦٤٢ز

Galileo Galilei

زانای ئیتالیایی گالیلۆگالیلی... به یه‌کێك له په‌ره‌پێده‌ری رێکاری زانستی داده‌نرێت زیاتر له که‌سێکی‌ترله‌م بواره‌دا. ساڵی ١٥٦٤ز له شاری (بیزا)ی ئیتالیا له‌دایك بووه. له ته‌مه‌نی لاوێتیدا چۆته زانکۆی بیزا به‌ڵام له‌به‌ر ده‌ستکورتی وازی له خوێندنی زانکۆ هێنا .

له ساڵی ١٥٨٩زدا له هه‌مان زانکۆ پله‌ی ئوستادی پێ‌درا ، پاش چه‌ند ساڵێکی که‌م خرایه ریزی ده‌سته‌ی مامۆستایانی زانکۆی (پادوڤا)وه ، تاکو ساڵی ١٦١٠ز له‌وێ مایه‌وه ، هه‌ر له‌و ماوه‌یه‌یشدا زوربه‌ی نهێنیه زانسته‌کانی دۆزییه‌وه‌و یه‌کالای کرده‌وه .

یەکەم هاوبەشی زانستی لە بواری میکانیکدا بوو، کاتی خۆیشی ئەرەستۆ پەی بەو زانستە بردبوو کە دەڵێت تەنە قورسەکان زووترو بە گوڕتر دەکەونە خوارەوە لە تەنە سووکەکان .

ئەم پەی بردنەی ئەرەستۆ بیرکردنەوەی زۆر لە زانایانی نەوەی دوای خۆی گۆش‌کرد بەڵام گالیلۆ بڕیاریدا ئەم بڕوایە بسەلمێنێت، پاش چەند تاقیکارییەکی یەك لە دوای یەك بۆی دەرکەوت کە ئەرەستۆ بە هەڵەدا چووە، چونکە لە ڕاستیدا تەنە قورسەکان‌و سووکەکان بە خێراییەکی یەکسان دەکەونە خوارەوە گەر لێخشاندنی هەوا بەرەنگاری تەنەکان نەبێت، (دەگێڕنەوە گوایە گالیلۆ چەند تاقیکارییەکی بە ئەنجامدا بە خستنە خوارەوەی تەنەکان لە کەڵووە لارەکەی بیزاوە... ئەم گێڕانەوەیە لەوەناکات ڕاستی تیادابێت) .

گالیلۆ کارێکی گرنگی تری بە ئەنجامدا ئەویش دۆزینەوەی (قانونی پشو) بوو. جاران خەڵك لەو بڕوایەدا بوون کە تەنی جوڵاوە دەوەزێتە[1] هێواشی‌و پاشان رادەوەستێت گەر هێزێکی‌تر نەیخاتە جوڵانەوە. بەڵام تاقیگەریەکانی گالیلۆ ئەو بڕوا باوەی بە هەڵەدا بردو سەلماندنی کە ئەگەر هەرچی کۆسپ‌و تەگەرەیەکی وەك لێکخشاند Friction دوور بخرێتەوە ئەوا ئەو تەنە هەرگیز لە خلۆری خۆی ناکەوێت . هەر ئەم بنەڕەتە گرنگە بوو کە نیوتن سەر لەنوێ ڕوون‌و ئاشکرای کردەوەو بە یەکەم قانونی دانا لە قانونەکانی جوڵانەوە کە یەکێکە لە بنەڕەتە بژێوەکانی فیزیکزانی ی .

بەناوبانگترین شاکاری گالیلۆ لە بارەی گەردوونەوەبوو، لە

سەرەتاکانی سەدەی هەڤدەمدا بیردۆزە گەردونیەکان لەبارێکی پەشێودا بوون، مشت‌ومرێکی توندو تیژ هەبوو لە نیوان پەرەی ئەو بیردۆزەی کە دەڵێت خۆر چەق گەردوونە، ئەمەیان ناسراو بوو بە بیردۆزەی کۆپەرنیکۆس بەرەیەکی تر بەرگرییان لەو بیردۆزە دەکرد کە دەڵێت زەوی چەق گەردوونە، لە نێوان ئەم دوو بەرەیەدا گالیلۆ لە ساڵی ١٦٠٤ زدا راستی بیردۆزەکەی کۆپەرنیکۆسی ئاشکرا کرد، بەڵام ئەو دەمە رێگەیەکی وا چنگ نەدەکەوت کە ئەو بیردۆزەیە بسەلمێنێت کە خۆر چەق گەردوونە .

ساڵی ١٦٠٩ ز بیستی لە هۆڵەندە تەلەسکۆپێکی ستێرناسی‌ی Astronomical Telescope داهێنراوە. هەر چەندە شارەزاییەکی ئەوتۆی نەبوو لەم بارەیەوە، ئەوەیشی کە بیستبووی تەنها شێوەیەکی ساکارانە بوو لەو تەلەسکۆپە، کەچی بەزرنگی‌و بلیمەتی توانی تەلەسکۆپێکی ستێرناسی‌ی گەورەترو چاکتر لەو تەلەسکۆپەی هۆڵەندە ساز بکات .
بەم ئامرازە نوێیەو بەهرەیەی کە تەرخانی کردبوو لەم بوارەدا توانی سەرنج بداتە ئاسمان، هەر لەماوەی ساڵێکدا ڕەچەکارێکی تەواوی لە دۆزنیگەری بە ئەنجامدا .

گالیلۆ روانیە مانگ، بینی گۆیەکی لووس نیە بەڵکو بریتی‌یە لە دەمە گرکانیەکان‌و دۆڵ‌و چیای بەرز، لەمەوە بۆی دەرکەوت کە تەنە ئاسمانیەکانی تریش وەنەبێت سەرتاپا لووس بن بەڵکو هەروەك زەوی چاڵ‌و چۆڵیان تیدایە .

ڕوانیە کەهکەشان Galaxy، دەریخست کە تەنێکی پڕ لە تەمومژ نیە بەڵکو پێکهاتووە لە ژمارەیەکی یەجگار زۆر لە ئەستێرە، ئەوەندە دوورن گەر بە چاو سەیربکرێن وا دەزانرێن کە نووساون بەیەکەوە. سەرنجی دایە ئەستێرەی کەیوان Saturn کە چەند بازنەیەك خولی داوە، هەروەها سەرنجی دا کە چەند پەڵەیەك Sunspots لەسەر ڕووی خۆردا هەیە.

گالیلۆ شەش ساڵی بردە سەر بە دانانی گرنگترین کارنامەی بەناوی (ووتوویژێك دەربارەی دوو ڕژێمی سەرەکی لە پساتدا). ئەم پەڕاوە ڕاسترەوی بیردۆزەکەی کۆپەرنیکۆس دەخاتە ڕوو بەڵام دەسەڵاتدارانی کەنشتە بە نیازی سزادانی کەوتنە پرو بیانوو گرتن لی یَ لەسەر ئەو بیروڕایانەی‌و هەڵوێستی ڕاستی دەربارەی بیردۆزکەی کۆپەرنیکۆس پاش بگرەو بەردەیەکی زۆری دادگا سزادرا بەوەی کە دەبێت لەپێش خەڵکێکی زۆر تێروانین‌و بڕواکانی بە درۆبخاتەوە کە ئەویش خولانەوەی زەوییە بە دەوری خۆردا.

ئەم داناپیرە لە تەمەنی ٦٩ ساڵیدا ناچارکرا کە هەستێت‌و لە پێش خەڵکێکی زۆر خۆی بە درۆبخاتەوە بەڵام هەروەك دەگێرنەوە سەیرێکی زەوی دەکات‌و بە زەردەخەنەیەکەوە دەڵێت (بەڵام... هێشتا هەر دەخولێتەوە..).

گالیلۆ لە شاری (ئەرکتیری) دا خۆی خەریك کردبوو بە نووسینەکانی لە زانستی میکانیکدا تا لە ساڵی ١٦٤٢ زدا کۆچی دوایی کرد .

گالیلۆ بە یەکەم لێپرسراوێك دادەنرێت لە هەڵوێستی تاقیکاری زانستگەریدا هیچ بایەخو گوێی نەدەدایە ئەو بیرەزانستانەی کە نەدەخرانە ژێر باری تاقیکارییەوە، هەتاوەکو ئەوانەیش کە لە کەنشتەوە دەردەچوو وەیان لە ئەرەستۆوە دەرچووبوو .

---

(١) دەوازێت : دەچێتە بارێکی ترەوە .

O



# ئەرەستۆ...

یان ئەرەستۆتالیس

٣٢٢ پ.ز - ٣٨٤ پ.ز

Aristotle

ئەرەستۆ بە مەزنترین زانای چەرخی دێرین و دامەزرێنەری (لێکۆڵینەوەی زارشتی ی)[١] دادەنرێت پێزو گەشەی داوەبە هەر لقێك لە لقەکانی فەلسەفە جگە لەوەی کە چەندین یافتی[٢] هەبووە لە زانستەکانیشدا .

هەر چەندە ئێستا زۆر لەو بیرانەی کۆن و بێچەمن[٣] بەلاّم ئەوەی کە زۆر گرنگە لە بیردۆزە تاکیەکانیدا ئەو ڕێبازە ژیرانەیەتی کە تین و هێزی داوەتە کارنامەکانی. سارای[٤] نووسینەکانی دەچێتە هەڵوێستی

واوه كه هەر دیاردەیەك لە دیاردەكانی ژیانی مرۆڤایەتیو كۆمەلأیەتی جیٚی تیٚرامانو شیكاری بیٚت .

تیٚروانینی ئەرەستۆ ئەوەیە كە سیابەختیی و ئەفسونو گیرۆدە بە خواوەندانەوە زالّ نابیٚت بەسەر پساتدا بەڵكو رەفتاری... كەلە ژیٚر باری چەند قانونیٚكی بەجیٚی گەواردایە، باشتر وایە كە مرۆڤ نائومیٚدیو بیٚوورەیی پیشان نەدات بەرامبەر بە هەر دیاردەیەك لە دیاردە سروشتەكانی جیهان، باوەڕی پتەوو چەسپاو ئەوەیە كە سوود لەو تیٚبینییانە وەربگریٚت كە لە ئەنجامی تاقیكردنەوەو ئاخاوتنی ژیرانەدا دەردەكەویٚت .

ئەرەستۆ توانی ئەم كۆمەڵە چەرەن[٥] و ئاكارە لاساییانەو نەریٚتە نهیٚنیانە بەرپەرچ بداتەوە كە بە چەشنیٚكی لاسارو نارەوا كاریانكردبوە سەر ژیاری رۆژاوا .

ئەرەستۆ ساڵی ٣٨٤ پ ز لە شاری (ستاجیرا)ی مەكدۆنیا – یۆنان لەدایك بووە. باوكی پزیشكیٚكی لیٚهاتوو بووە، لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا چوو بۆ ئەثیناو خۆی گەیاندە ئاكادیمیای ئیفلاتون بۆ خویٚندن. لەویٚ بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ مایەوە هەتاوەكو پاش مردنی ئیفلاتونیش بە ماوەیەكی كەم. رەنگە ئەرەستۆ بایەخدانی بە زانستی ژیانو زانستە تاقیگەرییەكانی لە باوكییەوە وەرگرتبیٚت و لە ئیفلاتونیشەوە بایەخدان بە تیٚرامانی فەلسەفە .

ساڵی ٣٤٢ پ ز گەڕایەوە مەکدۆنیا تاکو ببێتە مامۆستایەکی تایبەتی لاوێکی شازادەو بزەڵەی سیانزە بەهار، ئەو لاوە لە لاپەڕەکانی مێژوودا ناوی دەرکرد بە ئەسکەندەری گەورە... بۆ چەندین ساڵ سەرپەرشتی یاددانی ئەسکەندەری دەکرد .

ساڵی ٣٣٥ پ ز، پاش ئەوەی ئەسکەندەر هاتە سەر ئەورەنگ[٦] ، ئەرەستۆ گەڕایەوە ئەثینا، لەوێ خوێندگایەکی تایبەتی کردەوە بەناوی (لیسیۆم)، دوانزە ساڵی دواییی لە ئەثینا بردە سەر کە نزیکەی هەمان سەردەمە ئەسکەندەر بە ڕێکخستنی سوپاو هێرشەکانیەوە خەریك بوو. لەوە دەکات کەئەسکەندەر بەئامۆژگاری ئوستادەکەی ڕەفتاری نەدەکرد بەڵام دارندەی دەکرد بۆ ئەوەی بە لێکوڵینەوەکانیەوە خەریك ببێت. ئەم کارەیش بە یەکەمین شاباشێك دادەنرێت لە مێژوودا کە بدرێت بە زانایەك لەلایەن دەوڵەتەوە. ڕەنگ بێت ئەمەیش بەخششێکی بەرەودوا بوبێت لەو ساڵانەی دواییندا .

لەگەڵ ئەوەیشدا دۆستایەتی ئەرەستۆو ئەسکەندەر هەر لە مەترسیو گێرمەو کێشەدا بوو چونکە ئەرەستۆ سەرزەنشتی دەکردو بێزاری دەردەبری بەرامبەر بەو شێوازە دیکتاتۆرییەی کە ئەسکەندەر دەینواند. جا کاتێك کە ئەسکەندەر برازاکەی ئەرەستۆی لە سێدارەدا بە تاوانی خراپەو ناپاکی. ئەرەستۆ زۆر پیێی ناخۆش بوو وایدەزانی خۆی لە سێدارە دراوە بەڵام ئەم کارو ڕەفتارانەی ئەسکەندەر نەبووە هۆی تێکچوونی پەیوەندی بەتینیان. ئەم پەیوەندییەی لەگەڵ

ئەسکەندەردا رکوکینەی ئەثینای هەستاند. جا کاتێك کە ئەسکەندەر مرد لە ساڵی ٣٢٣ پ ز دا، بەرەی دژوارانی مەکدۆنیا دەسەڵاتیان گرتە دەست لە ئەثیناو ئەرستۆیشیان دانا بەوەی کە کابرایەکی ڕاڕاو بێئارمەندە[٧]. ئەرەستۆ بەم تاوانەی کە خرایە پاڵی... چارەنووسی بەر لە ٧٦ ساڵەی سوکراتی هاتەوە یاد.

لەبەر ئەوە لەشار هەڵهات بە بیانووی ئەوەی کە دەرفەتێکی تر نەدات بە ئەثینایيەکان تاوانێکی تر دووپات بکەنەوە دژ بە فەلسەفە. پاش چەند مانگێك لە ساڵی ٣٢٢ پ‌ز لە ئەفەروزگادا[٨] لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

ئەو کارنامە مەزنانەی کە ئەرەستۆ بە جیهانی خەمڵان جێی هاژو سەرنج ڕاکێشانە. ئەوانەی کە ماونەتەوە نزیکەی ٤٧ نووسراوەیە، دەڵێن گوایە زیاتر لە ١٧٠ نووسراوی هەبووە، بەڵام ژمارەی نووسراوەکانی وەنەبێت لە نیگاو خرۆشیەوەی بێت بەڵکو لە فرەزانی‌و زرنگییەوەی کە جێی سەرسوڕمانە، کارەزانستەکانی فەرهەنگێکی زانیاری بووە لەو دەمەدا دەربارەی گەردوون، زانستی زیندەناسی‌و زماکزانی، جوگرافیاو جیۆلۆجیا، فیزیکزانی‌ی‌و توێکاری‌ی‌و فسیۆلۆجیاو چەندین رشتەو بابەتی تری زانیاری، لە هەمان کاتیشدا فەیلەسوفێکی زۆر بێهاوتا بووە لە هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی فەلسەفە تێڕامانیەکان، زۆریش بە کاریگەرو باڵابووە لەو فەلسەفەدا.

---

(١) زارشت: منطق.
(٢) بافت: أثر.
(٣) بێچەم: بێمانا.
(٤) سارا: زۆر پوختە.
(٥) چەرەن: خەراف.
(٦) ئەورەنگ: تەختی پاشایی.
(٧) ئارمەند: تەقوا.
(٨) ئەفەروزگا: مەنفا؛دوورگە.



# لينين.....

۱۸۷۰ ز - ۱۹۲٤ ز

Lenin

ڤلادیمێر ئیلیتش ئۆلیانۆڤ نازناو بە (لینین)... پێشەوا و لێپرسراوێك بووە بە شێوەیەکی گشتی لە دامەزراندنی کۆمۆنستیی لەڕووسیادا. بە پێڕەوە چاپووکەکانی کارڵ مارکس دادەنرێت، پێشکار بوو لە پێڕەوی رێبازگەی کارڵ مارکس، بێگومان سەرکەوتنیشی تیادا بەدی هێناوە. جا بە هۆی خێرا بلاوبوونەوەی کۆمۆنستی... لینین بە یەکێ لەو کەسانە دادەنرێت کە دۆخێکی گەورەی هەبووە لە مێژووی مەردومدا .

لینین ساڵی ١٨٧٠ ز لە شاری سمبرسك (کە ئێستا لەبەرئەو ئۆلیانۆفسکی پێ دەڵێن) لە دایك بووە. باوکی کاربەدەستێکی میری بووە، براکەیشی فەرماندرا بە سێدارەدانی لەبەر ئەوەی کە بەشداربوو لە پیلانگێڕان دژ بە قەیسەر. لینین لە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا بووە مارکسی باوەڕ، لە کانونی یەکەمی ١٨٩٥ زدا بە تاوانی چالاکی شۆڕشگێڕانەی دژبە قەیسەر بۆ ماوەی چوار مانگ خرایە زیندانەوە، پاشان دوور خرایەوە بۆ سیبیریا، لەو سێ ساڵەی سیبیریایدا هاوسەری ژیانی بۆ خۆی پەیدا کرد کە یەکێك بوو لە ئافرەتە شۆڕشگێڕەکان، هەر لەو ماوەیەیشدا پەراوێکی دەرکرد بە ناوی (پەرەپێدانی سەرمایەداری لەڕووسیا). لە ساڵی ١٩٠٠ زدا ئازاد کرا، دوای ئەوە یەکسەر چوو بۆ ئەوروپای ڕۆژاوا لەوێ ١٧ ساڵ مایەوەو بانگەوازی شۆڕشی بڵاو دەکردەوە.

پارتی سۆشیالستی دیموکراسی کرێکاران دووبەرەکییەکی تێکەوت (ئەو پارتە لینین تیایدا ئەندام بوو). لە دواییدا بووە سەرۆکی بەرەی زاڵ بوو کە پێیان دەووتن بەرەی بەلشەویك.

بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی باشترین هەل و دەرفەت بوو بۆلینین چونکە باری سەربازی و ئابووری تەواوڕووسیای شلەژاندبوو، دەنگی کینەو بێزاری ئەوەندەی تر بەرزبووەوە دژبە ڕژێمی قەیسەر.

ئەم بارە ناهەموارە بووە ڕێخۆشکەرێك بۆ کودەتای ئازاری ١٩١٧ز و ڕوخاندنی تەختی قەیسەری. بۆ ماوەیەك وەها باوبوو کە گوایە ڕژێمێکی دیموکراسی دێتە سەر. لینین ئەو کاتە لە دەرەوەی

وولاّت بوو. هەربە بیستنی سەرکەوتنی شۆڕش‌و ڕوخاندنی قەیسەر دەسبەجێ گەڕایەوە بۆ ڕووسیا. زۆر بە مەندی‌و هێمنییەوە دەیڕوانیە پارتە دیموکراسیەکان، هەرچەندە دەوڵەتێکی کاتی‌یان پێکەوەنا بەڵام هێزێکی ئەوتۆی نەبوو کە بتوانێت خۆی ڕابگرێت. ئەم بارە ناهەمواریەیش کە دیسان دروست بووەوە دەرفەتێکی گونجاوتری ڕەخساند بۆ پارتی کۆمۆنستی ڕێکخراو بۆ ئەوەی سەرهەڵبدات‌و بە ژمارەیەکی کەمەوە بتوانێت دەسەڵات بخاتە ژێر ڕکێفەوە. بۆ ئەم مەبەستە هانی بەلشەویەکانی دەدا کە دەوڵەتی کاتی بڕوخێنن‌و دەوڵەتێکی کۆمۆنستی دابنێن لەبری. نائارامی‌و پەشێوییەك ڕوویدا، لینینی ناچار کرد کە خۆی بشارێتەوە بۆ ماوەیەکی کەم، بەڵام بە بزووتنەوەی‌وکۆدەتایەکی دژوار هەر ساڵی ۱۹۱۷ ز لینین توانی سەربکەوێت‌و ببێتە سەرەك دەوڵەت.

لینین وەك سەرەك دەوڵەتێك چەنێ توندڕەو بوو لە داکوتاندنی ڕژێمدا ئەوەندەیش سەهەندو توندڕەو بوو بۆ خۆی، هەرگیز ووچانی بە خۆی نەدەدا لە کارکردندا. لە سەرەتادا کەوتە گۆڕانکاری ئابووری دەوڵەت بۆ ئابووری سۆشیالیستی سەرانسەر، پاشان بانگەوازی هەرەوەزی زەوی ئاشکرا کرد لە دەوڵەتدا.

لە ساڵی ۱۹۲۲ زدا دووچاری نەخۆشییەکی کتوپڕو ترسناك بوو هەر پێوەی دەناڵا تا لە ساڵی ۱۹۲٤ زدا بووە هۆی مردنی. هەر بەو نەخۆشییەیشەوە ئارامی لە خۆی بری‌بوو، کاری دەکرد بەبێ ئەوەی بە تەنگ تەندروستی خۆیەوە بێت. پاش مردنی لاشەکەی مومیاکرا بۆ

یادگار تاهەمیشە لەبەرچاو بێت، تا ئێستایش لە گۆڕەپانی سوور بە مۆمیایی دانراوە .

لینین بەمەردێکی کارا ناودەبرێت لە دامەزراندنی ڕژێمی کۆمۆنستی لەڕووسیادا. ئەو بیرانەی کارلْ مارکسی کردە هەوێنی کارەسیاسەکانی و خستیەگەڕ لە کاروباری وولاتدا هەر لە ۱۹۱۷ ز یەوە ئیتر کۆمۆنیزمی پەرەی‌سەندو سەرانسەری کیشوەری ئەوروپاو جیهانی گرتەوە ئێستایش نزیکەی سێ‌یەکی دانیشتوانی زەوی کۆمۆنیستن .

لینین سەرەرای ئەوەی کە پێشەوایەکی سیاسی هەڵکەوتوو بوو پەڕاوەکانیشی زۆر کاریگەرو هاندەر بوون، ئەو نووسراوانەی خۆی دەدات لە نزیکەی ٥٥ بەرگ .

لینین زۆر بایەخی دەدا بە تەکتیکی شۆڕش، هەمیشە حەزی بە توندڕەوییەکی شۆڕشگێرانە دەکرد، باوەری بەوەهەبوو کە دەسەڵاتی پرۆلیتار دەبێت هەر ڕەگی خۆی داکوتێت .

گەرتێروانین... لە ڕۆژانی لینینەوە هیچ گەلێك ڕژێمی کۆمۆنیستی هەڵنەبژاردووە گەردەسەلاتی بوویێت ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ دەست بەسەراگرتنی دەوڵەت بەسەر دەزگا ڕۆژنامەگەری‌و بانگ‌و یەکێتیە کرێکاریەکاندا لەو ڕژێمەدا .

ئاشکرایشە کە کۆمۆنیزم بزوتنەوەیەکەو دیاردەیەکی گەورەی هەیە لەمێژوودا، لینینیش بە توانای سیاسییەوە یاد دەکرێتەوە بەوەی کە مەردێکی کاریگەر بووە لە داکوتان‌و پتەوکردنی ڕەگی کۆمۆنیزم لە ڕووسیادا .

٥

# موسا | خ. ر|.....

Moses

## سەدەی سیانزەهەمی پ.ز.

ئەو سەرچاوە باوەڕپێکراوانەی کە لە بارەی موسا (د.خ) وە دەدوێت دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیانزەهەمی پێش زایینی... بەوەی کە گوایە ڕەمسیسی دووەم ئەو فرعەونە بووە کە داستانی چوونە دەرەوەی لێدەگێڕنەوە. ڕەمسیسی فرعەون لە ساڵی ١٣٢٨ پ زدا مرد، ئەو سەردەمە دەکات کە موسا (د. خ)ی تیا ژیاوە، لە سیپارەی چوونە دەرەوەدا ئاماژ بەوە دەدات کە کۆمەڵێك بووە لە عیبرانیەکان ڕەفتاری ڕەمسیسیان لاپەسەند نەبووە.

موسا (د. خ) مەردێکی هێژاو بە نوازش بووە لای گشت گەلی عیبری بۆ ماوەی پێنج سەدەیەك، لە ساڵی ٥٠٠ ز دا ناوبانگی لەتەك ئاینی دیاندا بە ئەوروپا ڕا بڵاوبووەوە. لەپاش سەدەیەکیش ئیسلام

هات‌و دانی به پێغه‌مه‌ریێتی موسادانا. له‌پاش بڵاوبوونه‌وه‌ی ئیسلام، ئیتر له جیهانی ئیسلامیه‌وه را بووه مه‌ردێکی خۆشه‌ویست‌و به‌رێز هه‌تا وه‌کو له میسریش. له‌م ڕۆژانه یشماندا‌و پاش تێپه‌ربوونی ۳۲ سه‌ده‌یه‌ك به‌سه‌ر کۆچی دواییدا هێشتا هه‌ر ریزی لای جووله‌که‌و دیان‌و موسوڵمان هه‌یه. سه‌ره‌ڕای ئه‌و ناوبانگیه‌یشی که‌چی ئه‌و باستانه باوه‌ڕپێکراوانه ده‌رباره‌ی زۆرکه‌من. هه‌ندێك ده‌ڵێن گوایه میسری نه‌ژاده به‌وه‌ی که ناوێکی میسریانه‌ی هه‌یه که به واتای (فرزه‌ند) دێت. له‌مه‌وه ده‌رده‌که‌وێت که ناوێکه له ناوه فرعه‌ونیه‌کان. جا ئه‌و داستانه دێرینانه‌ی که له‌سه‌ر موسا ده‌گێڕنه‌وه زۆری ئه‌فسونیه‌و بۆی هه‌ڵبه‌ستراوه.

به‌ڵام به‌تێکرا سێ ده‌سکه‌وتی گرنگی لێوه ده‌رده‌که‌وێت.
یه‌که‌م: گرنگی پێده‌درێت به‌وه‌ی که مه‌ردێکی سیاسی بووه‌و توانیویه‌تی پێشره‌وی عیبرانیه‌کان بکات کاتی ده‌رباز بوونیان له میسر.
دووه‌م: گرنگی پێده‌درێت به‌وه‌ی که قانونه‌کانی ناسراوه به ناوی خۆیه‌وه (قانونه‌کانی موسا) که بریتین له‌و قانونانه‌ی ده‌سه‌لاتی کێشابووه سه‌ر ره‌فتاری عیبرانیه‌کان له چه‌رخی ته‌وراتدا. ئه‌و قانونانه‌یش ۱۰ ئامۆژگاری‌و[1] راسپارده ده‌گرێته‌وه، جا له‌به‌ر کاریگه‌ری ته‌ورات، وه به شێوه‌یه‌کی تایبه‌تی ده راسپارده‌و دانانی... شایانی ئه‌وه‌یه که موسا (د. خ) به مه‌ردێکی کاریگه‌رو خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات ناوببرێت. به‌ڵام زوربه‌ی لاهوتزانانی دیان باوه‌ریان وایه که موسا تاکه‌دانه‌ری ئه‌م

سیپارەیە نەبێت بەڵکو بە دەستی چەندین دانەران نووسرابیتەوە، لە ڕاستیشدا لە پاش کۆچی دوایی موسا نووسرایەوە، وایش باوەڕە کە موسا دۆخێکی کاریگەری هەبووە لە دانانو نەخشاندنی ئەو نەرێتو ئاکارە عیبریانەی کە لە سەردەمی خۆیدا هەبوو... وەیا لە داڕشتنی هێندێك لەو دەستوورە عیبریانە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بەدەستەوە نیە کە خۆی بسەپێنێت لەم بوارەدا.

سێهەم: زۆر کەس باوەڕیانوایە کە موسا دامەزرێنەری باوەڕپێکردنی جوولەکەیە بە تاکی خودا بەڵام لەوە ناکات هیچ ڕاستییەکی تیادا بەدی بکرێت چونکە تەنها سەرچاوەیەك باوەڕی پێبکرێت دەربارەی موسا سەردەمی دێرینەو بایەخ پێدانێتی بە ئیبراهیم (د. خ) کە باوەڕی بە تاکی خودا هێناوە. بەڵام ئاشکرایشە گەر موسا (د. خ) نەبوایە ئەو باوەڕە درێژەی نەدەکێشا. جا گرنگی موسا لێرەداوا وەردەکەوێت کە چاپووکانەو زرنگانە دۆخێکی یەجگار باڵاو بەرودوای گێرا لە پەیڕەوکردنو هێشتنەوەی ئەو باوەڕە. چونکە بیرکردنەوە بە بە تاکی پەروەردگار بەهەموو دڵسۆزییەکەوە بەهەموو پساتدا بڵاوکرایەوە.

---

(1) لەئایەتی ١٥١ تاکو ئایەتی ١٥٣ لە سورەتی ئینعام لە قورئانی پیرۆزدا ......
* وەرگێڕ *

O



# چارڵس داروین...

١٨٠٩ز - ١٨٨٢ز

Charles Darwin

چارڵس داروین... دانەری (بیردۆزەی گۆڕەندام بەهۆی سروشت بژارەوە). لە ٢ ی شوباتی ١٨٠٩ ز لەشاری (شرۆزبێری) ئینگلتەرە لەدایك بووە (هەمان ڕۆژی لەدایكبوونی ئەبرەهام لەنكۆڵنە).

لە ١٦ ساڵیدا خۆی گەیاندە زانكۆی ئەدنبرە بۆ پزیشكیی خوێندن. بەڵام پزیشكیی و توێكاریی دوو ڕشتەی بەكەیل نەبوون

لای، لەبەرئەوە خۆی گواستەوە بۆ زانکۆی کامبورج بۆ لاهوت خوێندن. سواریو ڕاوشکاریش لەولاوە کەوتبووە خولیایو بیری لەوە دەکردەوە کە ئەم وەرزشکاریانە زۆر خۆشترو گونجاوترن لە خوێندنەکە بۆی، لەبەر ئەوە زۆر تکای لە یەکێ لە ئوستادەکانی کرد کە بە سروشتگەرێك دایبنێت لەو گەشتە دۆزگەرییەی کەنیازوابوو کەشتی (بیگڵ) پێی هەستێت. باوکی ئیتر حەزی لەو ئارەزووەی بەربوو چونکە هەستی بەوەدەکرد کە ئەم گەشتە کورەکەی سەرقاڵ دەکاتو ئیدی بیر لە خوێندن ناکەتەوە. بەڵام هەرچۆنێك بوو باوکی ڕێی نەگرت. ئەم گەشتەی سەلماندی کە بە گرنگترینو چێژاوترین گەشتی ئۆقیانووسی دادەنرێت کە سوودی بووبێت لە مێژووی زانستدا.

ساڵی ۱۸۳۱ زدا کەشتی دەریای تەیکرد. ئەودەمە داروین ۲۲ ساڵانبوو، لەماوەی ٥ ساڵدا کەشتیەکە بەجیهاندا سورایەوە، لەسەرەتادا خۆی گەیاندە ڕۆخەکانی ئەمەریکای باشورو پاشان ڕوویکردە ئۆقیانووسی هێمنو هەندێك لە لەندەکانی، ئینجا سەریدا لە چەند لەندێکی ئۆقیانووسی هیندیو پاشان بەرەو باشووری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی کشا.

داروین لەو گەشتەیدا زۆر بەهاژو سەیرەوە سروشتی دەبینی، دیدەنی ئەو خێڵانەی کرد کە لە ژیانێکی سەرەتاییدا گوزەرانیان دەکرد، زۆر شتی نوێی لێدۆزینەوە. هەروەها سەرنجی دایە ژیانی ژمارەیەك لە چەند هۆزێکی ڕووەكو تەبا. بەگشتی هەرچییەکی ببینایەو سەرنجی

ڕابکێشایە لەیاداشتەکەیدا هەمووی دەنووسی. ئەم یاداشتەی لە دواییدا بووە بنچینەو کرۆکی بەرهەمەکەی پاشەڕۆژی.

داروین لە ساڵی ١٩٣٦ زدا گەڕایەوە بۆ نیشتمان، لەو بیست ساڵەی دواییندا چەند نووسراو و پەڕاوێکی بڵاوکردەوە کە بووە هۆی ناوبانگی‌و دانانی بەیەکێ لە سروشتگەرە مەزنەکانی ئینگلتەرە.

لەو باوەڕەدا بوو کە جۆرەکانی ڕووەك‌و تەبا هەروەکو خۆیان نەبوون بەڵکو لە چاخەکانی جیۆلۆجیەوەڕا ... گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە.

پاش خوێندنەوەی یەکێ لە ووتارەکانی (تۆماس ماڵتۆس)ی زانا بیرێکی بۆهات دەربارەی (بەربەرەکانی مانەوەو سروشت بژارە)، لە دواییدا پەڕاوە گرنگ‌و بەناوبانگەکەی بڵاوکردەوە بەناوی (مانەوەی بنەچەکان لە کێشەدا بۆ ژیان)

لە سەردەمی ژیانیدا مشت‌ومڕێکی زۆرکرا لەسەر ئەوبیرانەی کەلەپەڕاوە نوێکەیدا بڵاوی‌کردبووەوە بەناوی (داکەوتنی مەردوم‌و بژارەی سەبارەت بە ڕەگەز)، لەم پەڕاوەیدا ئەو بیرکە دێنێتە پێشەوە کە گوایە مەردوم لە گیانەوەرێك کەوتۆتەوە کە بەمەیمون دەچێت. ئەم پەڕاوەی ئارتینی[1] مشتومڕی زیاتر خۆش کرد، بەڵام داروین بەهیچ جۆرێك خۆی نەدەخستە ناو ئەو مشت‌ومڕەوە چونکە لە گەڕانەوەیدا تەندروستی بەرەو خراپی دەچوو، لەگەڵ ئەوەیشدا لایەنگیرانی بیردۆزەکەی زۆر بە توندی‌و بەجۆشەوە بەرگریان لە بیرەکانی دەکرد.

ئەو بەرگرییەیش زیاتر لە خودی (تۆماس هکسلی)دا بەدی‌دەکرا کە زانایەکی لێهاتووو قسەزانو زارابوو. ئابەم چەشنە زاناکان لە دواییدا بروایان بەڕاستی بیردۆزەکانی داروین هێنا، ئەویش بەر لە مردنی کە ساڵی ١٨٨٢ز دەکات.

داروین دامەزرێنەری بیرکی (گۆڕانکاری جۆرەکان)ە، هیچ کەسێك پێش‌خۆی ئەم بیردۆزەی نەبووە. ئەو کارە گرنگەی داروین کە پێی‌ی هەستا وەنەبێت تەنها هەر پەسنێکی [1] میکانیکی بخاتەڕوو لە سروشت بژارەدا بەڵکو برێکی زۆریش لە بەڵگەزانستەکان دەخاتەڕوو بۆ پتەوکردنو دڵنیایی گریمانەکانی.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە داروین ئەو بیردۆزەی دارشتووە بەبێ‌ئەوەی هیچ پەنابەرێتە بیردۆزەکانی زگماکزانی‌ی یان زانیبێتی لە بارەیەوە. لەسەردەمی ژیانی داروینیدا هیچ کەسێك نەیدەزانی چ ڕێگەیەك ئەو خوکارانە [2] دەگوازێتەوە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی‌تر.
ئەوکاتەی کە (گریگۆر مەندل) لە قانونەکانی زگماکی دەکۆڵییەوە، هەر ئەو کاتەیش دەکات کە داروین بە نامەزانستیەکانیەوە خەریك‌بوو، لەبەر ئەوە کارەکانی مەندل کە تەواوکەری کارەکانی داروین بوو تاساڵی ١٩٠٠ ز نەدەزانراو کەسیش هێشتا نەیبیستبوو، هەر ئەوساڵەیش بوو کە بیردۆزەکانی داروین زانراو بڵاویش‌بووەوە.
ئەوبیرانەی داروین بەسەر بیرکردنەوە ئاینییەکاندا تەنییەوە، زۆر

له پیاوانی ئایینی دیان بڕوایان کردبوو بەوەی کە پەسەندکردنی بیردۆزەکانی داروین دەقۆزرێتەوەو دەبێتە هۆی گومرایی له باوەڕی ئایینیدا. هەرچەندە بیانوویان هەبوو بترسن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئاشکرایە ئەگەر چەند کاراو ترنگەیەکی تر هەبووبێت و کارێکی گرنگیان گێڕابێت لەرماندنی بیرکردنەوەی ئایینی دا (تەنانەت له ئاستی جیهاندا)، ئەوا بیردۆزەکەی داروین... کە هەر چۆنێك بێت گۆڕانکارێکی گەورەومەزنی هەبووە له ڕێبازی بیرکردنەوەی مەڕومدا سەبارەت بە پسات.

ئیتر ئەوەنەما وەکو جاران ڕەگەزی مەردوم جێ یەکی سەرەکی بگرێت لەنەخشاندنی سروشتدا، واتە ئێستا دەبێت خۆمان دابنێین بەجۆرێك لەو فرەجۆرانەی کە دەژین لەسەر زەویدا، لەبەر ئەوەبابەتە دۆراندنی ئەم جێ سەرەکییە نموونەییەمان لەیادا بێت کە لەوانەیە ڕۆژێ له ڕۆژان ڕووبدات.

---

(١) ئاماژ. ئیشارەت

(١) ئارتین: تێنی ئاگر

(١) پەسن: وەسف

(٢) خوکار: خصائص

O



# شی هوانگ تی

**٢٥٩ پ‌ز - ٢١٠ پ‌ز**

**Shih Huang Ti**

ئیمپراتۆری مەزنی چین (شی‌هوانگ تی)... بەزەبری چەك‌و خاسكاری‌ی توانی سەرانسەری چین یەك بخات، ئەم خاسكارییە بووە كارێكی سەرەكی لە یەكگرتنی ڕۆشنبیری چینی كە هەر لەو دەمەوە پارێزراوە تاكو ئێستا.

شی هوانگ تی ساڵی ٢٥٩ پ‌ز لەدایك بووەو ساڵی ٢١٠ پ‌ز مردووە. جا گرنگی ئەم مەردە گەر بزانین پیویستە ئاورێك لە مێژووی دێرین بدەینەوە. شی هوانگ تی لە دواساڵانی شانشینی‌ی بنەماڵەی (شوا) لەدایك بووە. ئەم بنەچەیە لە نزیكەی ساڵانی ١١٠٠ پ‌ز وە

دامەزراوە. بەر لە هاتنی بنەماڵەی (شوا) باری ئەم بنەچەیە زۆر بەربادبووو بەرەو پووکانەوە دەچوو، جاری خۆ چین کرابوو بە چەند بەگنشینێکەوە، ئەمانە هەمیشە لەبەرەنگاری‌و جەنگ‌و ناکۆکی‌دا بوون، وایان لێهاتبوو هەریەکە بەتوانای خۆی پەلاماری ئەوی‌تری‌دەداو بەرەبەرە بەگنشینە بچوکەکانیش لەنێوانیاندا بەرگەیان نەدەگرد، سەرکوت دەبوون‌و دەتوانەوە.

گەورەترین‌و بەهێزترین بەگنشین لە نێوانیاندا (تشین) بوو کە کەوتبووە بەشی رۆژاوای وولاتەوە، ئەم بەگنشینە بەشێنەیی گەشەی کرد، هەر بە پێی شوێنی جوگرافی‌و لێهاتوویی فەرمانڕانەکانی بووە بەهێزترین بەگنشین، بەتایبەتی لەو دەمەی کە تشنگ تیادالەدایك بوو بوو.

تشنگ واتە (شی‌هوانگ‌تی) لە ساڵی ٢٣٨ پ‌ز دا دەسەڵاتی درایەدەست لەلایەن ئەم بنەچەیەوە. لەو ماوەی دەسەڵاتەیدا چەند سەرکردەیەکی گوردو لێهاتووی لە خۆی کۆکردەوە. ئەمجا جەنگێکی سەختی گێڕا لەدژی بەگنشینەکانی دەوروبەری، دوابەگنشینیش کە مابووبوەوە لە ساڵی ٢٢١ پ‌ز روخاندی، هەر لەو ساڵەیش‌دا خۆی کردە شی‌هوانگ‌تی واتە (شاشانی یەکەم)(١).

هەر کە کاروباری گرتە ئەستۆ دەسبەجێ هەستا بە چەند خاسکارییەك کە زۆر گرنگ‌و شیاوی نووسینە لە مێژوودا. یەکەم هەنگاوی بڕیاریدا بەنەهێشتنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی‌و شێوازەکانی لە

دەوڵەتدا، ڕژێمێکی سازکرد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ووڵات بەناوی هەرێمنشینی. میری ئەم هەرێمنشینە نەدەبوو میرزاییانە هەرێم بەڕیوەبەرێت (واتە بە ڕژێمی وەچەزایی دەسەڵاتی ئەم هەرێمە بگرێتە دەست). ئینجا دەستی کردە گواستنەوەو جیٓگۆڕکیٓی میرەکان. ئەمکارەیشی بۆیە دەکرد تاکو ترسی لەوەنەبێت یەکێکیان جیٓی خۆی خۆشبکات‌و خزم‌و ناسیاو لەخۆی کۆبکاتەوەو تەختی ئیمپراتۆریەتەکەی پیٓلێژ بکات. نەخشەی ڕێگاوبانی والێکرد کە پایتەختی هەرێمەکان بەیەکەوە ببەستێت. مەڵبەندێکی دروستکرد بۆ خاسکردنی کێشانەو پێوانەو دراو، سەرپەرشتی کرد لە دروستکردنی ڕێگەو جۆگەو دێراو، هەروەها لە سازکردنی قانون‌و زمانی نووسیندا.

لەو شاکارانەی کە لە نزیکەی سالی ۲۱۳ پ‌زدا بەئەنجامی‌دا بریتی بوو لە سووتاندنی هەرچی نووسراو هەیە لە چیندا بێجگە لەو نووسینانەی کە ڕشتەی تەکنیك‌و کشتوکاڵ‌و پزیشکی تێدایە. ئەو یاداشتانەی بنەماڵەی (تشین) و کارە فەلسەفەییەکانی قانونسازەکان. لەمانە بەولاوە ئیتر هیچی‌تری نەهێشتەوە. هەندێك نووسراوی تریشی سووتاند وەك نووسراوەکانی کۆنفۆشیۆس‌و هەموو ئەو نووسراوە فەلسەفەیانەی کە لە خوێندگاکاندا دەخوێنرا.

لە سیاسەتی دەرەوەی ووڵاتیشدا، هەستا بە چەند هێرشێك بۆ باشووری ووڵات‌و چەند ناوچەیەك، توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت‌و بیانخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. بەڵام لە باکووردا نەیتوانی گەلانی ئەو ناوچانە بەزێنێت لەبەرئەوە هەستا بە دروستکردنی

دیواربەندێك[1] بە شێوەیەکی وا کە هەرچی دیواربەندە ناوخۆییەکان هەبوو کە دروستی‌کردبوو پێکەوە ببەسترێن. وای لەم دیواربەندە کرد کە زۆر گەورەو دوورو درێژ بێت تاکو بتوانێت بەربەستی ئەو هێرشانە بکات کە دەکرێتە سەری لە باکوورەوە. تائێستایش شوێنەواری ئەم دیواربەندە مەزنە هەرماوە. دروستکردنی ئەم دیوارەو زنجیرە جەنگێکی دەرەکی ناچاری‌کرد کە میرانەیەکی[1] زۆر بخاتە سەر گەلەکەی بەرادەیەك کە لە توانای گەل چووبووە دەرەوە. جگە لەوەیش کە دەنگی بێزاریان لێ‌بەرزبووەوە لە دژی. خۆهەرچی سەرپێچییەکیش بکرایە لە دژی رژێمە ئاسنینەکەی... هەر بەزوویی سەرکوت دەکرایەوە. چەند جار پیلانگێررا بە نیازی کوشتنی بەڵام هەمووی شکستی هێنا تاکو لە ساڵی ٢١٠ پ‌ز دا بە مردنێکی سروشتی کۆتایی پی‌هات.

لەوکاتەی کە یادی دەسکەوتە مێژووییەکانی شی هوانگ تی دەکەینەوە، بابەتە (لی‌سو) یش لە یادنەکەین، چونکە لەراستیدا گرنگی (لی‌سو) ی شالیاری زرنگ‌و بلیمەت هیچی لە ئیمپراتۆر کەمتر نەبوو، نابێت ناوی یەکێکیان بی‌ئەوی تریان ببەین. ئەو هاریکاریە پتەوییەی نێوانیان پاڵهێزێك‌بوو بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن‌و مانەوەیان لە دەسەڵاتدا.

زۆر لە مێژووناسە رۆژاواییەکان شی- هوانگ- تی دەخەنە ریزی ناپۆلیۆن پوناپارتەوە.

---

(١) شاشان: ئیمپراتۆر، شای شاهان

(١) میرانە: باجی میری بۆ سەر گەل.

٥



# ئەگستۆس قەیسەر...

٦٣ پ ز - ١٤ پ ز

Augustus

ئەگستۆس قەیسەر دامەزرێنەری ئیمپراتۆریێتی رۆمانی... لەو مەردە دیارانەی مێژووە کە توانی زالّ بێت بەسەر ئەو ئاژاوەو جەنگە میللیانەی کە هەر لەسەدەی یەکەمی پێش زایینیەوە کۆماری رۆمانی شلوکوت کردبوو. ئازایانە رژێمی رێکوپێك کردەوە، توانی یاساو ئاسایش و گەشاندن لە سەردەمی دەسەلاّتیدا بچەسپێنێت و نزیکەی ٢٠٠ ساڵیش پاش خۆی ئەو رژێمە بمێنێتەوە.

گایۆس ئۆکتافیۆس کە ناوەڕاستیەکەیەتی سالْی ٦٣ ی پ ز بەبێکەسی هاتۆتە جیهانەوە، تەنانەت دایك و باوکیشی نازانرێت کێن، بەلاّم ئەوەی کە باوەو دەزانرێت یۆلیۆس قەیسەر هەلْیگرتۆتەوەو پی ّی گەیاندووە. ئەو دەمەی کە یۆلیۆس قەیسەر دەسەلاّتی گرتبووە دەست ئۆکتافیۆس لە تەمەنی نەوهالْیدابوو. جا لە کاتێك کە یۆلیۆس قەیسەر سالْی ٤٤ پ ز کوژرا، سوپا ڕۆمانیەکان دووبەرەکییان تێکەوت، بەرەیەکیان سەر بە (مارك ئەنتۆنی) بوو کە یەکێكبوو لە دلْسۆزەکانی قەیسەر، بەرەیەکی تریان سەر بە (ئۆکتافیۆس).

مارك ئەنتۆنی ئەوەندە گرفتاری ئەوینی (کیلۆپاترا) بوو بوو لە میسر ئیتر نەیدەپەرژایە سەر جەنگ لەبەرئەوە لە جەنگی (ئاکتیۆم)دا سالْی ٣١ پ ز بەرامبەر بە بەرەی سەر بە ئوکتافیۆس تێکشکاو جەنگەکەی دۆراند . ئۆکتافیۆس پاش ئەو سەرکەو تنانەی... توانی هەمان هێزو دەسەلاّت بگرێتە دەست کە یۆلیۆس قەیسەر بەر لە پانزە سالْی مردنیدا هەیبوو .

هەموو کەس پاش ئەو جەنگانە چاویان بڕیبووە هێمنی و ئاسایش، لەبەرئەوە یەکسەر ئۆکتافیۆسیان بی ّدوودلْی پەسەندکرد. ئەمیش کە زۆرزانبوو هەستی بەوە کرد کە دەبێت کارێکی وەها بکات ئەوەندەی تر خەلْك پەسەندی بکات و بچێتە دلْیانەوە. لە هەموو بارو ڕووەکانی ژیاندا فەرمانو دەسەلاّتی خستەگەر. جا ڕاستیەکەی... هەرچەندە ئیمپراتۆر بوو بەلاّم هەر هەرێمەکانی ئەسپانیا وگالْ و سوریا ڕاستەوخۆ لەژێر دەستدابوو چونکە زۆربەی

سوپا رۆمانیەکان کە سەربەوبوون لەو هەرێمانە مابوو بوونەوە .

ئۆکتافیۆس سالارێکی زۆر مەندو خۆراگر بوو. ئەنجومەنی پیرانی رۆمان زۆر ڕێزیان دەگرت، لە هەموو بۆنەو کاروبارێکی دەوڵەتدا دەنگی خۆیان ئەدایە پاڵی، لەدواییشدا نازناوی (ئەگستۆس) یان پێبەخشی، هەرچەندە بەخۆی هیچ جۆرە نازناوێکی شاهانەی بەکارنەدەهێنا .

ئا بەم چەشنە رۆمان بە کۆماری مایەوەو (ئەگستۆس)یش وەك سەروەرێك ناودەبرا لەو کۆمارەدا. ئەنجومەمەنی پیران ئەوەندە بروایان پێبووو ڕێزیان لێدەگرت کە چی بوویستایەو چی‌بکردایە بەدەمیەوە دەهاتن، لەبەرئەوە بەدرێژایی ژیانی بە دیکتاتۆری رۆمان مایەوە بێ‌ئەوە هیچ کەسێك لێ‌ی هەڵبگەڕێتەوە .

سەردەمی مردنیشی کە ساڵی ١٤پ‌ز دەکات رۆمان لە قۆناخێکی گوازراوەی تەواوو لەباردابوو لە رژێمی کۆماریەوە بۆ رژێمی شاهانە. جا کورەکەی (کە ئەمیش هەروەکو خۆی هەڵگیرابووەوە) جێ‌ی پاشایی گرتەوە بەبێ هیچ گیروگرفتێك .

ئەگستۆس فەرمەندارێکی زۆر بەیاراو برست‌و میهرەبان بوو، سیاسی‌زانێکی زۆر لێهاتووبوو، بەشێوازێکی ژیرانە توانی ئەو ئازارو زامانەی کە لە ئاکامی جەنگە ناوخۆییەکاندا تەنیبوەوە سارێژ بکات .

نزیکەی ٤٠ ساڵ فەرمانڕانی کرد، ئەو ڕێبازەی زۆر کاریگەربوو بۆ دوارۆژی ڕوونی رۆما. لەسەردەمی خۆیدا سوپا ڕۆمانیەکان ئەسپانیاو

سویسره، ئاسیای بچوكو بەشێكی فراوانی لە وولاتی بولغانیان داگیرکرد. سنووری دەسەلاتی لە باکوورەوە گەیشتبووە راینو دانوب، ئەم سنوورەیش بۆ چەند سەدەیەك پاش خۆی هەرواماییەوە.

ئەگستۆس دۆخێکی زۆر گرنگو باڵای گێڕا لە کاروباری دەوڵەتدا، رژێمی دارایی و میرانەی بەست بە دەوڵەتەوە. سوپای رۆمانی رێکخستو نیرۆیەکی کۆماندۆسی دەریای پێکەوەنا. پاش ئەوە ئینجا گوردێکی تایبەتی پێکەوەنا کە ناسرابوو بە (گوردی پریتۆری). ئەم گوردە لەدواییدا کارێکی زۆر توندو گەورەی دەگێڕا لە دانانو لابردنی ئیمپراتۆرەکاندا.

لە فەرمانڕانی ئەگستۆسدا چەندین رێگەو جادە دروستکرا، چەندین خانووبەرەو ساختمانی گەورە لەرۆمادا دروست کرا. بایە خێکی زۆر ئەدرا بە جوانیو رازاندنەوەی پەرستگاکانو ساختمانە گەورەکان. چەند قانونێکی سازکرد بۆ هاوسەربوونو[1] گۆشکردنی زارۆلان[2].

---

(۱) هاوسەر بون : ژن و ژنخوازی.

(۲) زارۆلان : منداڵان.



# ماوتسی تونگ

١٨٩٣ ز - ١٩٧٦ز

Mao Tse Tung

ماو تسی تونگ پێشرەوی پارتی کۆمۆنستی چینی‌کرد. بەلێهاتوویی توانی خۆی بگەیەنێتە دەسەڵات و ٢٧ساڵیش سەرۆکاری گۆڕانکاری بکات لە وولآتدا.

ساڵی ١٨٩٣ ز لە گوندی (شوهان)ی سەربە هەرێمی (هاتان) هاتۆتەجیهانەوە. باوکی جووتیارێکی خۆش گوزەرانبووە. ساڵی ١٩١١ز ماو لە تەمەنی ١٨ ساڵیدابوو کە شۆڕش بەرپابوو لەدژی بنەماڵەی پاشایی (بنەماڵەی شنگ) کە هەر لە سەدەی حەڤدەهەمەوە

دەسەڵاتی داکوتابوو. لەچەند مانگێکدا تەختو تاراجی پاشا ڕۆخێنراو ڕژێمی کۆماری کاروباریووڵاتی دەبرد بەڕێوە. بەڵام لە بەدبەختی شۆڕشەکە سەرکردەکانی ئەوەندە جەربەزەو کارامە نەبوون تا بتوانن بنچینەیەکی پتەوو دەسەڵاتێکی چەسپاوویەکگرتوو دابمەزرێنن لە چیندا. ئیتر هەر لەو ساڵانەوە تاکو ساڵی ١٩٤٩ ز پڕبوو لە ئاژاوەو بێئارامیو جەنگی گەلی.

ماو.. کە وەك لاوێکی چەپڕەو لە بیرەسیاسیەکانیدا خۆی دەبینیەوە، لەساڵی ١٩٢١ زدا بووە یەکێ لە دامەزرێنەرە سەرەکیەکانی پارتی کۆمۆنستی چین. زۆر بەسستیو هێواشی گەیشتە پلەی سەرکردایەتی، ئەویش لەساڵی ١٩٣٥ دا ڕوویدا. لەو دەمانەیشدا پارت خەریكو جەنجاڵبوو بە بەرنامەی چۆنیەتی هەنگاونان بۆگەیشتن بەدەسەڵات، بەڵام تووشی چەند شکستیەك بوو، شیرازەی تێکچوو تا نزیکەی ساڵی ١٩٢٧ز. لەساڵی ١٩٣٢ ز بەوە بەرەبەرە ڕێکخراوی پارت بەهێزو گەشندەبوو، توانی زاڵبێت بەسەر ئەو کۆسپە ناهەمواریانەدا. هەر لە سەرەتای ١٩٣٥ ز وە کە ماو جڵەوی سەرکردایەتی پارتی کەوتە دەست ئیتر ئەوەندەتر هێزو توانای پەیداکردو بێباکەنە کەوتە بەربەرەکانی دەوڵەت.

ساڵی ١٩٤٧ ز پارت خۆی گورج کردەوەو گوڕیدایە خۆی بۆ جەنگ لەدژی دەسەڵاتی نیشتمانی کە (شان کای شیك) بەڕێوەی دەبرد. ساڵی ١٩٤٩ ز سوپاکانی گەل تەواو سەرکەوتنیان بەدەستهێناو دەسەڵاتی خۆیان داکوتا لە خاکی چیندا.

لەودەمەی کە ماو دەسەڵاتی گرتە ئەستۆ، چین لە بارێکی زۆر ناهەمواردابوو. جەنگی گەلی کە نزیکەی ٣٦ ساڵی خایاندا وڵاتی خستبووە هەژاریو دواکەوتوییەوە. زۆربەی گەل نەخوێنەوار بوو.

چین ئابەم چەشنە دەچەرخاو گوزەرانی دەکرد. ئەوکاتەی کە ماو دەسەڵاتی لەدەستا بوو تەمەنی ٥٦ ساڵ بوو، زۆر سڵی دەکردەوە لەوەی کە نەتوانێت بەسەر ئەو کۆسپانەدا زاڵ بێت. بەڵام بەهێمنی و کۆڵنەدانی توانی ئەو کۆسپانە ببڕێت، ئەویش بە چەند هەنگاوێکی بوێرو ئازایانە وەك بە پیشەساز کردنی وڵات، بایەخو پەروادانێکی بێ‌پایان بە خوێندنو چارەسەرکردنی باری تەندروستی. ئەم کارانەی وەنەبێت بۆ چینی دواکەوتوو ئیتر بەس بێت بەڵکو چاوەڕوانی هەنگاوی دووەمی لێ‌دەکرا ئەویش گۆڕینی باری ئابووری لە ڕژێمێکی سەرمایەدارییەوە بۆ سۆشیالیستی، گۆڕینی باری سیاسی وڵات بۆ بارێکی دیکتاتۆرانە. هەروەها توانی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بسازێنێت.

هەوڵی ئەوەی دەدا کە باری خێزانی چینی بگۆڕێنێت بەچەشنێك کە هەریەکێ لە ئەندامانی خێزان هەست بە خۆبەستنەوەی بکات بە دەوڵەتەوە زیاتر وەك بە خاوخێزانەوە. ئەم هەنگاوەی کارێکی زۆر گەورەی کردە سەر چین، چونکە چین نەریتو ژینگارییان ناسراوە بە خۆبەستنەوەیان بەخێزانەوە. سەرەڕای ئەوەیش بانگەوازێکی پرۆپاگەندەی لەدژی ئامۆژگاریەکانی کۆنفۆشیۆس بڵاوکردەوە. ئەم هەڵمەتەی تارادەیەك سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

ماو کەڵەمێرێکی چینبوو لە ساڵەکانی ١٩٤٩ ز - ١٩٧٦ ز دا. یەکێ لە پرۆژەکانی کە لە ساڵی ١٩٥٠ زدا دەستی پێکرد ناسرابوو بە (زلەبازێك بۆ پێشەوە)، زۆر لە لێکۆڵەرانو چاودێران سەرکەوتنی ئەم پرۆژەیان خستبووە گومانەوە چونکە بریتیبوو لە بەکار هێنانی توندرەوی لەشێوەکانی رێگەی بەرهەم لەگونددا ئەگەرچیش ئەم پرۆژەیە لابرا لەبەرنامەی شۆڕشدا. پرۆژەی دووەمی بریتی بوو لەشۆڕشی رۆشنبیری کە ئەمەیش لە ساڵی ١٩٦٠ ز وە دەستی پێکرد ئەم شۆڕشە جەنگێکی گەلی بوو دژبە رفتاری بیرۆکراتی لەنێو ریزەکانی پارتدا. سەیر ئەوەیە کە ماو لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا بوو کە بڕیاری ئەم پرۆژەیەی دەرکرد کەچی لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا خرایە گەڕ، هەروەها لە تەمەنی نزیك ٨٠ ساڵیدا نزیك بوونەوەی سازاند لەگەڵ وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا.

ماو لەو براوایەدا بوو کە کرێکارانی پیشەسازی لەشارەکاندا بنکەیەکی بەهێزو پتەو پێکدەهێنن بۆ پشتگیریو راگرتنی دەسەڵاتی پارت، بەڵام ئەو رێبازەی گۆریو هێزی جووتیارانی خستەبریو پەروایەکی تەواویدا بە گۆڕانکاری کشتیاریو ژیانی گوندەکی.

لێرەدا دەبێت ئاورێك لەمێژوو و پەیوەندی بەشۆڕشی چین بدەینەوە، ئەویش کە مەبەستمانە بیخەینە روو ئەوەیە کە دامەزرێنەری کۆمۆنستیی لە رووسیادا لینینە، لەبەر ئەوە دەبێت ئەو راستیە وون نەکەین کە رێبازی لینین زۆرکاریگەرو رێخۆشکەرێك بوو بۆ دامەزراندنی کۆمۆنیستیی لە چیندا.

جا لە ڕاستیدا پۆلاندنی کەسێکی هاوچەرخی وەك ماو زۆر گرانە چونکە نازانین ئەنجامی کاردانەوەکانی بۆ گەلی چین لە پاشەڕۆژدا چۆ دەبێت؟ بەڵام هەرچۆن بێت دەتوانرێت لەگەڵ (شی هوانگ تی)

بەراوورد بکرێت، چونکە هەرکامێکیان بگرین سەیردەکەین بۆ زنجیرە گۆڕانێکی شۆڕشگێری تێکۆشاوە لەچیندا. جا هۆی دانانی شی هوانگ تی لە ئاستێکی بڵندتر لە (ماو) ئەوەیە کە (شی...) نزیکەی ٢٢ سەدەیەك کاریگەربووە لە چیندا، بەڵام دەسەڵات و کاریگەری ماو جارێ نازانرێت تاکەی بردەکات.

O



# جەنگیزخان

نزیکەی
١١٦٢ز - ١٢٢٧ز

Genghis Khan

داگیرکەری گەورەو پەرۆیز جەنگیزخان... نزیکەی سالّی ١١٦٢ز لەدایك بووە. باوکی بە نگینی یەکیّ لە سەر خێلّە دژوارە بەزیوەکانەوە ناوینا (تیمۆجین). لە تەمەنی ٩ سالّاندا بوو کە باوکی بەدەستی کۆمەڵێك لە خێلّە دوژمنەکانی کوژرا، ئیتر کەس وکاری تیمۆجین هەر لە تەنهایی و تەنگ وچەڵەمەدا دەژیان.

ئەستێرەی بەختی ئەوکاتە درەوشایەوە کە لە دیلێتی هەڵهاتوو

هاوپەیمانی بەست لەگەڵ (تۆرگوڵ) کە یەکێ بوو لە دۆستانی باوکی‌و سەرخێڵی ئەو ناوچەیە.

چەند ساڵێك چەندین جەنگ‌و شەڕوشۆڕ لەنێوان خێڵەکاندا بەرپابوو، (تیمۆجین) یش بەم جموجۆڵییە توانی خۆی بەرێتە پێشەوە و ناو دەربکات.

هەر لە دێرەوە خێڵە مەغۆلیەکان ناسراوبوون بە دڕی‌و سوارچاکی جەنگاوەرانیان، جاربەجار مێژوو ئەو شاڵاوانەمان دێنێتەوە یاد کە چۆن هەڵیان دەکوتایە سەر باکووری چین. جا پێش بەدەرکەتن‌و هاتنی تیمۆجین خێڵەکان زوربەی کاتیان بە ستێزەو کوشتاری یەکتر دەبردەسەر، بەڵام تیمۆجین بە چەتوێی‌و لێهاتوویەکی سەربازی‌و سیاسی‌و سەرسەختی توانی هەموو خێڵەکان لەژێر ئاڵای خۆیدا گردبکاتەوە. لە ساڵی ١٢٠٦ زدا پیرانی خێڵە مەغۆلیەکان کۆبونەوەو نازناوی جەنگیزخان (واتە ئیمپراتۆری جیهان) یان پێبەخشی. جەنگیزخان گشت لەوەندە[١] سامناکەکانی ڕێکخست‌و ڕووەدەرەوەی ئاراستەکرد بۆ پەلاماردانی گەلانی دراوسێ‌ی.

یەکەم شاڵاوی بردەسەر وولاتی (هی‌های) کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژاوای چینەوە. ئینجا ڕوویکردە ئیمپراتۆرێتی (تشن) کە ئەمیش دەکەوێتە باکووری چینەوە. هێشتا لە گەرمەی جەنگدابوو... کەوتە ناکۆکی لەگەڵ (خوارزم محمد شا) کە شایەتی ئیمپراتۆرێتێکی بەرینی دەکرد لە ئێران‌و ئاسیای ناوەڕاستدا.

لەساڵی ١٢١٩ز دا پێشەنگی سوپاکانی کردو هێرشی بردەسەر خوارزمشا، ئەنجامی ئەو جەنگە بە بەزینی خوارزم شا لە نزیك هەرێمی خوارزمدا کۆتایی هات.

لەو دەمەی کە سوپا مەغولیەکانی تر شاڵاویان دەبردەسەر روسیا، جەنگیزخانیش بە هێزێکەوە بە سەرکردایەتی خۆی هێرشی بردە سەر ئەفغانستانو باکووری هیندستان، بەڵام پاش گەرانەوەی لەو جەنگانە لەساڵی ١٢٢٥ زدا بۆ مەنگۆڵیا هەر لەوێ لە ساڵی ١٢٢٧ زدا مرد.

---

(١) لەوەند: هێزێکی چەك بەدەست

# ئەقلیدس...

**٣٠٠ پ.ز ژیاوە**

**Euclid**

کەم ناو رەچاو دەکرێت ئەوەندەی بیرکارزانی یۆنانی ئەقلیدس کە ناوبانگی هەبێت لەم لیستەدا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە گەلێك لەو مەردانە ناودارترو ناسراوتر بوون لە سەردەمی ژیانیاندا وەك ناپۆلیۆن، ئەسکەندەری گەورەو مارتن لۆثەر... بەڵام پاش چەند دەماودەمێك ئەم.... لەو جۆرە پیاوانە بەناوبانگتربووە. چەنێك بەناوبانگ و گرنگ بووە کەچی ئەوەندە ژینباری نازانرێت. ئەوەیش کە دەزانرێت ئەوەیە کە لە ئەسکەندەریەو میسردا نزیکەی ٣٠٠ پ.ز وەك ئوستادێك بە چالاکی زانستەوە خەریك بووە، مێژووی لەدایك بوونی و مردنیشی باوەرپێکراونیە، تەنانەت ئەو زادگایەیشی نازانرێت کەسەر بە چ کیشوەرێك یان چ شارێك بووە.

هەرچەندە زۆر بابەت و رشتەی نووسیوەو هەندێکیشیان ماون بەڵام ئەوەی کە زۆر ناوبانگی پێ‌دەرکردبێت پەراوەکەیەتی دەربارەی زانستی ئەندازە بەناوی (بنچینەکان Principle). جا بلیمەتی و بڵندی ئەقلیدس لەمێژوودا وەنەبێت تەنها لە گرنگی ئەو پەراوەی بێت چونکە

زوربەی ئەو بیردۆزە ئەندازەییانە بەر لە ئەقلیدسیش بە فرەبەڵگەو سەلماندنەوە دەزانرا. بەڵکو بلیمەتیو زرنگی لە ڕێکخستنی بابەتو دارشتنی نەخشەیەکی ڕەسایە لە پەڕاوەکەیدا کە ئەمەیش بە پلەی یەکەم کۆمەڵێکی هەڵبژاردە دەگرێتەوە لە گریمانەکان Hypothesis و بەدیەکان Oxioms کەدان بە ڕاستیاندا نراوە. ئینجا شیرازەی ئەو بیردۆزانەی وا ژیرانە بەستبووەوە بە جۆرێك کە هەر یەك پاشکاری ئەوی تربێت، جاروباریش لەکاتی پێویستدا چەند گریمانێکی وونبووی بەبەڵگەوە پێش‌کەش دەکرد.

ئەوەی شایانی سەرنجو تێڕوانینە ڕشتەی بنچینەکان لەخۆیدا برێتی‌یە لە تەختەندازە[1] و تەنەندازە[2] و بەشێکی زۆریش لە جەبرو بیردۆزەی ژمێرە. ئەم پەڕاوەی کە نزیکەی پتر لە دوو هەزار ساڵێك بەکاردەهێنرا بە سەرکەوتووترین پەڕاوی خوێندگا دەژمێررێت. بە زمانی یۆنانی نووسراوەتەوەو بۆ چەند زمانێکی بیگانەیش وەرگێرراوە.

یەکەم چاپی نزیکەی ساڵی ١٤٨٢ ز وەدەرکەوت واتە دوای ٣٠ ساڵ بەسەر داهێنانی چاپەمەنیدا، هەر لەو دەمەوە پتر لە هەزار جار لەسەری چاپکراوەتەوە.

پەڕاوی (بنچینەکان) کارایەکی سەرەکی بوو بۆ سەر ڕاهێنانی ئاوەزی مرۆڤ لەسەر بناغەی زاربڕکی‌یەکی ڕاستەقینەدا بەجۆرێکی وەها کە دەتوانین بڵێین بەکاریگەرتر بووە لە هەر ووتارێك گەر بیگرین لە ووتارەکانی ئەرەستۆ دەربارەی زارشتی‌ی و نموونەی زیندوو لە دەرەنجام پێکهاتندا. زۆر لە بیرمەندانیش حەزیان بە پەیڕەوی ئەم

پەراوە کردووە هەر لەو کاتەوە کە دەرکەوتووە، بگرەتائێستایش....
بایەتە باوەرمان بەوە هەبێت کە دەرکەوتنی پەراوەکەی ئەقلیدس هۆیەکی سەرەکی هەبووە لە دەرکەوتنی زانستی نوێدا.
زانستی‌ی.-زیاتر بریتی‌یە لە گەڵاڵەکردنی کۆمەڵێك لە تێبینی ووردو رای‌پتەو و بنەرەتە گشتییەکان. جا ئەو دەسکەوتە مەزنانەی زانستی نویێ کە دێت لەلایەکەوە لەگەڵاڵەو گردکردنەوەی تاقیکردنەوەکان‌و ئەزمون‌کردەییەکانەوە، لەلایەکی تریشەوە لە شیکارییەکی ووردو دەرەنجامێکی پتەو و زارشتی‌یەوە[٣].

ئێمە بە تەواوی نازانین بۆچی زانستەکان لە ئەوروپاوە دەرکەوت‌و بوژایەوە بەر لە ووڵاتی چین!!... دەبێت ئەمە بە رێکەوت نەبووبێت، بەڵکو دەبێت سەردەمی ئەو مەردانە زۆر گرنگ بووبێت کە دۆخێکی باڵایان تیادا دەگێرا وەك نیوتن، گالیلۆ، کۆپەرنیکۆس. ئەو هۆیانەیش کە پاڵهێزو پاڵپشتی ئەم مەردانە بوون زەمینەیەکی زانستی بەپیت بوو لە ئاوەزو هۆشی یۆنانەکاندا سەرەرای ئەوفەرهەنگە بیرکاریانەی کە یۆنان وەك کەلەپورێك بۆ ژیاری مەردم بەجی‌ی هێشتبوو.

شایانی یادیشە کە چین لە تەکنیکاریدا بۆ چەند سەدەیەك لە ئەوروپا پێشکەوتووتر بووە، بەڵام توانای پێکخستنی بیردۆزەی نەبووە لە زانینی بیرکاریەکاندا وەك ئەوروپا. بەوەیشدا دەردەکەوێت کە زانایەکی وەك ئەقلیدس یان تیادا هەڵنەکەوتووە. هەروەها چینیەکان

فرەزان بوون لە ئەندازکارییدا بەڵام هەر نەگەیشتبوونە رادەی دارشتنی ئەندازە بە شێوەیەکی دەرەنجامی. سەبارەت بە ئەورووپاییەکان بیرکردنەوەیان وابوو کە دەتوانرێت زۆری بنەرەتە فیزیکەکان هەموو بابەتێکی لێوە دەرەنجام بکرێت.

بوونی زانایەکی وەك ئەقلیدس شتێکی ئاشنا بوو لە بیری ئەورووپاییەکاندا، تەنانەت ئەو ئەندازەی ئەقلیدسیان بە رژێمێکی پەتییان دادەنا ئەو بیردۆزەو گریمانانەی بە راستییەکی رەساو هەمواریان دادەنا سەبارەت بە جیهانی دەروبەریان.

ئەقلیدس کارێکی زۆر مەزنی کردبووە سەر نیوتن، زۆر ئاشکرایشە کە نیوتن لە پەراوەکەیدا (بنەرەتەکان Principia) تا رادەیەك زۆر شێوەی ئەندازیانەی لە شێوازی ئەقلیدس دەچێت لە پەراوەکەیدا... (بنچینەکان).

---

(١) تەختەندازە: الهندسە مستویە

(٢) تەنەندازە الهندسە مجسمە.

(٣) زارشتی: علم المنطق.



# مارتن لۆثەر

١٤٨٣ ز - ١٥٤٦ ز

Mertin Luther

بەرەنگاری‌کردنی مارتن لۆثەر بۆ کەنشتەی کاثۆڵیك... بووە بەردی بناغەی ڕێبازگەکەی لە خاسکاری ئایینی دیاندا .

ساڵی ١٤٨٣ ز لە شاری ئیزلیبین - ئەڵەمانیا لە دایك بووە. ڕۆشنبیرییەکی چاکی لە زانکۆ وەرگرت‌و هەر لە سەر ئارەزووی باوکیشی قانونی خوێند بەڵام تەواوی نەکرد. لە باتی ئەوە خۆی خستە سەر ئەوەی کە ببێتە قەشەیەکی ئۆگەستینی. لە ساڵی ١٥١٢ ز دا پلەی دکتۆرای لە زانکۆی ووتنبێرگ لە لاهوت‌دا وەرگرت، هەر

دەسبەجێش چووە ڕیزی دەستەی مامۆستایانەوە، لەو دەمەی ڕا بەرەبەرە رەخنەکانی لە کەنشتە دەردەکەوت .

لە سالی ١٥١٥ ز دا چوو بۆ رۆما، لەوێ ڕووبەڕووی پڕوپووچی زانا ئایینیەکان بووەوە و کەوتە ئاخاوتن لەگەڵیان دەربارەی خۆبەستنەوەی تەواویان بە کاروباری گێتی‌یەوە. ئەوەی کە زیاتر بووە هۆی بێزاری‌و رك‌هەمتانی لە کەنشتە... فرۆشتنی (نووشتەی لێبوردن) بوو کە گوایە گشت بەدکاریەکانی ئەو کەسە دەسڕێتەوەو گوناهەکانی لە سەر لادەبات (جاروباریش کات کەمکردنەوە بۆ ئەو گوناهبارە تیایدا دیاری‌دەکرا کە لە گۆشەی پێلێنانەکان (مەودیانێ)[1] دا دەیبردە سەر .

لە تشرینی یەکەمی ١٥١٧ ز دا نزیکەی ٩٥ بێزاری بە دەروازەی کەنشتەدا هەڵواسی لە ووتنبیرگ، بە شێوەیەکی گشتی کەنشتەی تاوانبار دەکرد بە سووخۆری‌و بەدکاری، وە بەتایبەتی بە فرۆشتنی نووشتەی لێبوردن. ئینجا ڕوونوسێکی لەو بێزارییەی نارد بۆ مەتران (مینز)و چەندێکیشی چاپکردوو و بلاویکردەوە بە نێو زۆربەی ناوچەکەدا .

بەم چەشنە... بێزارییەکانی دژی کەنشتە بە خێرایی بلاوبووەوە، لە دەسەلاتی پاپاو ئەنجومەنی کەنشتەیش هەڵگەڕایەوە. بڕیاریدا کە ڕێ‌و شوێنی ئەوان نەگرێت، تەنها دوای سپارەی پیرۆزو ئاوەزی پوختو رەوان بکەوێت. سەیریش نەبوو بۆکەنشتە کە بە توورەییەوە بڕوانێتە بیروڕاکانی‌و بانگی بکات تاکو بە ملکەچیەوە بەرامبەر بە

خێو گەورەکانی رابوەستێت لە کەنشتەدا. هەرچەندە بیستیەوە کە بیروراکانی بە ئاشکرا پووچەڵ کراوە، بەڵام ئەم هەرکوڵی نەداو گوێی نەدایە توورەو مشەیان، لەبەر ئەوە لە کۆڕی کەنشتەدا کردیانە هەراو جاڕیاندا کە مارتن لۆثەر کەسێکی خوانەناسەو لە قانون یاخی‌یە. نووسراوەکانیشی ساڵی ١٥٢١ز لە (ورمس)دا قەدەغەکرا .

جا ئەگەر بەم پێ‌یە بوایە دەبوایە لۆثەر بسوتێنرایە، بەڵام بە پێچەوانەوە... بیروراکانی برەوێکی یەجگار زۆرو فراوانی بەدی هێنا لە نێو گەل‌و هەندێك لە میرەکانی ئەڵەمانیا. لەگەڵ ئەوەیشدا هەر ناچار بوو خۆی بشارێتەوە بۆ ماوەی ساڵێك. هەرچەندە گەلی ئەڵەمانیا بە هەموو توانایەکیانەوە پشتگیریان دەکرد . ڕەنگە بوو هەر ئەو هێزو توانایەیش بەس بووبێت بۆ ئەوەی خۆی سەرفەراز بکات لەو هەرەشەو گوڕەشە ترسناکانەی کە چاوەڕوان دەکرا بۆی لە لایەن کەنشتەوە .

لۆثەر زانایەکی فرە بەرهەم بوو. سەلماندیشی کە نووسراوەکانی زۆر مەزن‌و کاریگەرن. یەکێ لەو شاکارانەی گۆڕینی سیپارەی پیرۆز بوو بۆ سەر زمانی ئەڵەمانی، بە شێوەیەکی وەها کە هەموو کەسێك بتوانێت بۆخۆی بیخوێنێتەوە بێ‌ئەوەی پەنا بەرێتە کەنشتەوخێووگەورە پیاوانی ئایینی، سەرەڕای ئەوەیش کە زۆر گرنگ‌و کاریگەر بوو (واتە وەرگێڕانی سیپارەی پیرۆز بۆ زمان نەژادی) بۆ سەر زمان‌و وێژەی ئەڵەمانی .

گرنگترین ئەنجامەکانی خاسکاری ئایینی بریتی بوو لە پەیدابوونی چەندین تیپی پرۆتستانتی، هەر چەندە یەکێکە لەو رێبازگایانەی ئایینی دیان... نەك رێبازگەیەکی زۆر فراوانیش، کەچی گەر سەرنج بدەین پەیڕەوانی لە بوزاییو ئایینانی تر زۆرترە .

یەکێ لەو ئەنجامە گرنگانەی تری خاسکاری ئایینی لە ئەوروپادا. بەرپابوونی ئەو جەنگو بەربەرەکیە ئایینیانە بوو کە ئەوروپای خستبووە گێژاوو کێشەیەکی ئالۆزو سەختەوە .

بۆ نموونە... ئەو جەنگە خوێنینەی کە ٣٠ ساڵی خایاند (لە ساڵەکانی ١٦١٨ز تا ١٦٤٨ز دا) لە ئەڵەمانیا، هۆیە سەرەکیەکەی ناکۆکی بەرە ئایینیەکان بوو. هەر ئەم ناکۆکیە بۆ چەند سەدەیەکیش درێژەی کێشا. بەڵام ئەو خاسکارییانە لە لایەکی تریشەوە دۆخێکی زۆر گرنگی گێڕا لە هۆشمەندی مرۆڤی ئەوروپای رۆژاوادا. پێش ساڵانی ١٥١٧ز تاکە کەنشتەیەك کە باوەڕپێکراوو رەوا بوو لای خەڵك کەنشتەی کاثۆلیکی رۆمان بوو، هەر یەکێکیش لە رێبازو رێچکەی ئەم کەنشتە دەرچوو بایە زۆر بە توندی سزا دەدراو نەفرەتیان لێ دەکرد. ئا لەم تەمو مژەدا بە هیچ جۆرێك بۆ کەس نەدەلوا بیروڕایەکی ئازادی هەبێت... یان بتوانێت رابیرێکی خۆی بکاتەوە. بەڵام پاش خاسکاری ئایینیو بیروڕای ئازاد خەڵك کەوتە ئەوەی کە ئیتر بیر لە کاروباری تری ژیان بکاتەوە بە هەمیشەیی .

لۆثەر یەجگار ڕکی لە جوولەکە دەبووەوە. نووسینەکانی زار توندی تیا بەدی دەکرێت دژ بە جوولەکە... ڕەنگە هەر ئەم نووسینانەیشی ڕێخۆشکەرێك بووبێت بۆ دەسەلأتی هێتلەر لە سەدەی بیستەمدا .

---

(١) مەودیانێ : لە زمانی سریانیو کلدانیدا بەکاردەهێنرێت... (وەرگێڕ) .



# نیکۆلاس کۆپەرنیکۆس

١٤٧٣ ز - ١٥٤٣ ز

Nicolaus Copernices

ستێرناسی مەزن نیکۆلاس کۆپەرنیکۆس... ساڵی ١٤٧٣ ز لە شاری (تۆرۆن) لە دایك بووە کە لە سەر رووباری (ڤستۆلا)ی پۆڵەندە یە. لە نێو بنەماڵەیەکی خۆش گوزەراندا پێگەیشتووە. لە هەرەتی لاویدا خۆی گەیاندە زانکۆی (کراکۆ)، هەر لەو دەمەیشدا گرنگی تەواوی دابووە ستێرناسی ی. لە ناوەڕاستی بیستەکانی تەمەنیدا چوو بۆ ئیتالیا بۆ خوێندنی پزیشکی ی و قانون لە زانکۆکانی (پۆلۆنا) و (پادۆڤا)، لە

دوایشدا چووه زانکۆی (فرارا)و پلەی دکتۆرای لە قانونی کەنشتەیدا وەرگرت. پاشان بووە تەرسایەکو خۆی گەیاندە کاتلرایی (فرونبرگ) لە پۆڵەندە .

هەر چەندە پیشەی ستێرناسیی نەگرتبووە خۆی بەڵکو لە پشوودانیدا خەریك دەبوو پێوەیو کاتی پیێ دەبردە سەر، بەلاّم هەر ئەو کارنامە مەزنانەیشی بوو کە ناوبانگی پیێ دەرکرد. ئەو دەمەی کە لە ئیتالیادا جێنشین بوو بوو بە بیرەکانی فەیلەسوفی یۆنانی ئەرسترخس سامۆسی (لە سەدەی سێهەمی پ ز ژیاوە) ئاشنا بوو کە دەیگوت زەویو ستێرەکانی تر بە دەوری خۆردا دەسووڕێنەوە .

کۆپەرنیکۆس ئەم بیردۆزەی زۆر لا پەسەند بوو، ئەوە بوو لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا کورتە دەسنوسێکی دەربارەی ئەو بیروڕایانەی کە کۆیکردبۆوەوە بلاّویکردەوە لە نێو دۆستەکانیدا. چەند ساڵێك خۆی خەریك کردو کەوتە لێکۆڵینەوە لەسەر تێبینیو ژمێرکاریو ئەوکارانەی کە پێویست بوو بۆ دارشتنی پەڕاوە مەزنەکەی دەربارەی (خولانەوەی ستێرە ئاسمانیەکان) کە زۆر بە شێوەیەکی ژیرانە لە سەر بیردۆزەکەی دەدوا بەسەلماندنەوە.

ساڵی ١٥٣٣ز لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا هەستا بە سازکردنی چەند کۆڕێك لە ڕۆما بۆ درکاندنو ڕوونکردنەوەی چەند خاڵێکی سەرەکی لە بیردۆزەکەیدا، جا ئەو کاتەی کە لە نوسینی پەڕاوەکەی بووەوە دوو دلّ بوو لە بلاّوکردنەوەی چونکە لە گێرمەو کێشەی کەنشتە دەترسا،

هەرچەندە هەر نەیتوانی چاپی بکات تا لە دواشەستەکانی تەمەنیدا نەبێت. جا ئەو ڕۆژەی کە مرد یەکەم دانەی چاپکراویان لە پەڕاوەکەی بۆ هێنا .

لەو پەڕاوەیدا زۆربەڕێکوپێکی ڕوونی دەکردەوە کە زەوی بە تەوەری خۆیدا دەسووڕێتەوە، مانگیش بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە، زەوی‌و گشت هەسارە(١) گەڕۆکەکانی تریش بە دەوری خۆردا دەسووڕێنەوە .

بێگومان کۆپەرنیکۆس هەر وەك پێشینانی کەوتە هەڵەوە لەو پێوان. ڕێژەییانەی نێوان وێنەی نەخشەو دوورە بنەرەتیە سروشتیەکان. هەروەها لەوەیشدا کەوتە هەڵەوە بیردۆزەی وەنەبێت هەر بیرکارییەکی ئاڵوزاو بێت بەڵکو ووردەکاریشی لەگەڵدا دەویست، بەلاَم بە هەر چون بێت بایەخێکی زۆر گرنگ‌و مەزن بە نووسینەکانی دەدرا. سەرەڕای ئەوەیش کە پاڵهێزێك بوو بۆ ستێرناسان .

هەر دوابە دوایش زانایان کەوتنە تێڕووانینێکی ووردو سەرنجدار لە جولاَنەوەی ئەو هەسارانەی کە لیَ‌ی کۆڵراونەتەوەو خراونەتە شیپان‌و چێوەیەکی ڕاست‌و گەوارەوە. ئەو ڕاستیانەیش بۆ دواجار لەلایەن زانا (کیپلەر)ەوە دەقێنرا .

لە ڕاستیدا بیردۆزەو تێڕوانینەکانی کۆپەرنیکۆس شۆڕشێکی گەورەی خستە بیرکردنەوەمانەوە دەربارەی‌گەردون، هەروەهایش بووە گۆڕانکارێك لە تێڕوانینە فەلسەفەیەکانماندا .

دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە ستێر ناسین ئەوەندە لە ژیانی ڕۆژانەدا ناگات بە زانستی فیزیك و کیمیاو ژینزانی ی. واتە لە توانای مرۆڤدا هەیە کە تەلەفزیۆنێك، ئۆتۆمۆبیلێك... یان هەر کارگەیەکی کیمیایی دروست بکات بە بێ ئەوەی پەنا بۆ بیردۆزەکەی کۆپەرنیکۆس بەرێت، بەڵام ناتوانێت دەسبەرداری بیردۆزەکانی لاڤوازی و ماکسوێل بێت لەم بوارەدا.

لەوە دەکات کە دەرکەوتنی پەراوەکەی کۆپەرنیکۆس نوێشکێك بێت... نەك تەنها هەر لە ستێر ناسی ی نوێدا بەڵکو لە گشت زانستە نوێکانیشدا.

---

(١) هەسارە : کوکب : planet



# جێمس وات

١٧٣٦ز - ١٨١٩ز

James Watt

(جێمس وات)ی سکۆتلەندی... کە زۆر جار بە داهێنەری ئامێری هەڵمی ناودەبرێت کارێکی باڵاو سەرەکی گێڕا لە شۆڕشی پیشەسازییدا .

ڕاستیەکەی وەنەبێت جێمس وات یەکەم کەسێك بوو بێت لە دروستکرونی ئامێری هەڵمیدا ، بەڵکو لە سەدەی یەکەمی زانییدا زانای ئەسکەندەری (هیرۆ) پەسنی ئەو جۆرە ئامێرەی کردووە. لە ساڵی ١٦٩٨ز یشدا (تۆماس سافری)ی ئینگلیزی ئامێرێکی هەڵمی داهێناو

بەکاریشی هێنا لە پەمپی ئاودا. لە ساڵی ۱۷۱۲ز دا کارمەندێکی تری ئینگلیزی بە ناوی (تۆماس نیکۆ) دانەیەکی چاکتری هێنایە کایەوە بەلاّم ئەوەندە برەوی نەبوو لە بەر ئەوەی کە کاری پێدەکرا تەنها بۆ فشاری ئاو لە کانەکانی خەڵوزدا .

گرنگی جێمس وات لە ساڵی ۱۷٦٤ ز وە بەدەرکەوت. بایەخێکی زۆری ئەدا بە ئامێری هەڵمی، هەر لەو کاتەیشدا خەریك بوو بە چاکردنی داهێنراوەکەی نیکۆ. نزیکەی ساڵێکی بە خۆفێرکردنەوە لە سەر دروستکردنی چەند ئامێرێکی تر بەردەسەر، لەگەڵ ئەوەیشدا لێزانینو بەهرەی داهێنان بە کارەکانیەوە دیار بوو بەوەی کە هەستا بە سازکردنی ئەو داهێنراوەی نیکۆ بە دەسکاریەوە، ئەو ئامێرە بووە داهێنراوێکی نوێی زۆر گرنگ بە رادەیەکی ئەوتۆ کە شایانی ئەوەیە نازناوی یەکەمین داهێنەری ئامێری هەڵمی پێببەخشرێت .

لەو یەکەمین دەسکاریانەی کە لە مێژووی داهێناندا تۆماری کرد لە ساڵی ۱۷٦۹ ز دا بریتی بوو لە سازکردنی تونێکی لولەداری هەڵمی جیا بۆ خەستکردنەوە. لە ساڵی ۱۷۸۲ز دا ماتۆرێکی جوت برەوی بەدەسکاریەوە داهێنا کە چوستی ئامێرە هەڵمیەکەی چەند جار پترتر دەکرد. ئەم کارە مەزنە برەویەی ئاستێکی زۆر گرنگو گەورەی ئاشکرا کرد لە جیاوازی نێوان داهێنراوێکی بێ هاوتاو ئەوەندەیش کەڵکی لێوەرنەگیرێت، وە داهێنراوێکی خۆش برەو لە پیشەسازیدا .

لە ساڵی ١٧٨١ز دا کۆمەڵێك لە چەرخەی دانداری داهێنا بۆ گۆڕینی جووڵەگۆڕکێ لە ئامێرەکەدا بۆ جووڵەخولکێ، ئەم کارە زۆر سوودی بۆ ئامێری هەڵمی گەڕانەوە. لە ساڵی ١٧٨٨ز دا توانی ئامێری گێژوان Centrifuge دابهێنێت جگە لەوەی کە چەندین دەسکاری تریشی لە زۆر ئامێرو ئامرازەکاندا بە ئەنجام هێنا .

ساڵی ١٧٧٥ز لەگەڵ ئەندازیار (ماثیۆبۆڵتۆن) دا کە کارمەندێکی لێهاتووبوو کەوتەکارکردن. هەر لەماوەی ٢٥ ساڵدا توانییان چەندین ئامێری هەڵمی دروست بکەن بەناوی کۆمپانیای وات – بۆڵتۆن، بەم کارەیان زۆر دەوڵەمەندبوون .

رەنگبێت زۆر سەخت بێت ئەوەندە گرنگی بدەین بەئامێری هەڵمی چونکە لە راستیدا چەندین داهێنراوی تر هەبووە کە کارێکی بالأی گێڕاوە لە شۆڕشی پیشەسازیدا وەك هەندێك چاکاری لە کانەکانو کانزاگەریو چەندین جۆری تر .

زۆر داهێنەرانیش پێشکاری (وات) یان کرد لەم ریبازەدا وەك (جۆکیکی) لە داهێنانی مەکۆی هەڵفر Flying Shuttle، (جێمس هارگریفز) لە داهێنانی ئامێری رێسان (خەرەك). بەلأم ئەوەی کە لە هەموویان بژێوتر بوو ئامێرەکەی وات بوو لە شۆڕشی پیشەسازییدا ، جا ئەگەر ئەو نەبوایە ئەو شۆڕشە پیشەسازییە بەم شێوەی ئێستا نەدەبوو .

زۆر لە مێژەوە سەرچاوەی پرستو ووزە زوربەی لە بازووی مرۆڤەوە بوو لە کارکردنی بۆ سەربەرهەم، بەلاّم بە داهاتنی ئامرازی نوێ کە ئامێری هەلّمییە ئەو بارەگرانەو تەگەرەی نەهێشت لە سەر مرۆڤ. بووە هۆی پەیداکردنی برێکی یەجگار زۆر لە ووزەیەکی هەمیشە بۆ بەرهەم. ئەو نەخشەی نەوتبەستنەی کە لە ساڵی ١٩٧٣ز دا روویدا توانی وا لە وولاّتە رۆژاوایی‌یەکانو تێکچوونی شیرازەی رژێمی پیشەسازییە. ئەم تاقیکرنەوەیەیش بیرێکی ئەو تۆی لە داهێنراوە گرنگەکەی (وات)ی داینێ سەبارەت بە شۆڕشی پیشەسازیی .

○



# کۆستەنتینی مەزن

٢٨٠ز - ٣٣٧ز

Constantine The great

کۆستەنتینی مەزن دامەزرێنەری ئیمپراتۆریێتی دیان لە رۆما... بوونی بە دیانو هاندان بۆ گەشەپێدانی کارودۆخێکی باڵاو پێشەنگی گێڕا لە گورینیدا، ... لە تیپێکی ئاینیی چەوساوەوە کردیە ئاینێکی بەهێزو زاڵ لە سەراسەری ئەوروپادا.

ساڵی ٣٨٠ ز لە شاری (تیسۆس) لە دایك بووە کە ئێستا بە یوگوسلاڤیا ناو دەبرێت. باوکی ئەفسەرێکی گەورەو بەیارا بووە لە سوپادا، سەرەتای ژیانی لە شاری (نیکۆمیدیا) گوزەران دەکرد... ئەو

شارەی کە (دیۆکلیتان) ی شاشان کۆشکێکی تیا کردبوو بۆ خۆی. لەو دەمەی کە دیۆکلیتان لە تەختی شاشانی‌ی هاتە خوارەوە کۆستانتیێۆس (باوکی کۆستانتین) فەرمانڕەوای هەرێمەکانی ئیمپراتۆریێتی ڕۆژاوای ڕۆمانی دەکرد. لە دوای ئەو ساڵەدا باوکی مرد ئیدی کۆستانتین بە یارمەتی سوپاکەی باوکی بووە جی‌نشین، بەڵام لەو گۆڕانەدا زۆر لە سەرکردەی بۆ پەیدابوو داوای تەختیان دەکرد. ئەم ناکۆکییە جەنگی گەلێ خۆشکرد، تا لە ساڵی ۳۱۲ زدا کۆتایی پی‌هات بە زاڵ‌بوونی کۆستانتین بە سەر دوادوژمنانی لە کارزارێکدا نزیك بە ڕۆما. ئا بەم چەشنە بووە فەرمانڕەوا یەکی بی‌هاوتا لە ڕۆژاوای ئیمپراتۆریێتی ڕۆمانیدا. بەشەکەی تریشی لە ژێر دەسەلاتی (لیسینۆس) شا ناوێکدا بوو. لە ساڵی ۳۲۳زدا هێرشێکی بەهێزی بردە سەر لیسنیۆس‌و توانی زاڵ بێت بە سەریا. ئیتر لەو دەمەوە بووە تاکە شاشانی ڕۆمانی تا مردنی لە ساڵی ۳۳۷ زدا.

زۆر بە تەواوی مێژووی بە دیان بوونی نازانرێت، بەڵام ئەوەی کە دەیگێڕنەوە... ئێوارەیەك لە کارزاری (پردی میلفان) دا خاچێکی ئاگرین بە ئاسمانەوە دەبینێت ، لەگەڵ ئەو خاچەدا چەند تیپێکی ئاگرین بە نووسراوی‌ی دەبینێت دەڵێت: «ئا بەم خاچە هەر سەردەکەویت...». ئیتر لەو کاتەوە کۆستانتین دەبێتە دڵسۆزو لایەنگیری ئاینی دیان. یەکەم کاریشی کە پی‌ی هەستا ئەوە بوو فەرمانێکی شاشانی (میلانی) دەرکردو ئاینی دیانی کردە ئاینێکی ڕەواو ڕێدار. بەو فەرمانە ئەو زەوی‌و سامانەیشی گەڕانەوە بۆ کەنشتە کە لە

سەردەمی چەوسانەوەی دیانەکاندا شاشانەکان کاتی خۆی زەوتیان کرد بوو. ئینجا بڕیاریدا کە ڕۆژی یەکشەممە دابنرێت بە ڕۆژی خواپەرستن.

ئەو فەرمانە لایەنێکی گرنگی تریشی هەبوو، ئەویش چەوسانەوەی جوولەکەکان بوو کە چەند سەدەیەکی لە دوای خۆی خایاند لە ئەورووپادا.

کۆستانتین وەنەبێت زۆر بە سەرسەختو پەرگرانە ئاینی دیانی کردبێتە ئاینی ئیمپراتۆری‌ی، بەڵکو تەنها ئەوەی کە زیاتر دەیکردو پێ‌ی هەڵدەستا هانی وەرارو گەشەپێدانی ئەدا. هەر لە سەردەمی فەرمانڕەوانیشی‌ڕا دیارو ئاشکرابوو کە ئەوەی دیان بوایە کاری بەرزی دەدرایێ لە کاروباری میریدا و مافی تایبەتی دەدرایێ، سەرەڕای ئەوەیش کە لە سەردەمیدا چەندین کەنشتە کرایەوەو دروستکرا وەك ئەوەی لە شاری (لەد) بە ناوی کەنشتەی لانك، وە کەنشتەی ئاخیزە[1] لە قودس.

بوونی کۆستانتین بە یەکەمین شاشانی دیانی ئەوەی بەسە کە ببێتە یەکێ لە ناودارانی ئەم لیستەیە، پتر لەوەیش شاری بیزەنتەی دروستکرد... فراوانتری کردو ناوینا (کۆستانتینا)، لە دواییشدا کردیە پایتەختی خۆی‌و بووە گرنگترین‌و گەورەترین شار لە جیهاندا. ئەم شارە هەر بە پایتەخت مایەوە تا ساڵی ١٤٥٣ ز و بۆ سەدان ساڵێکێش بە پایتەختی ئیمپراتۆرێتی عوسمانلی مایەوە.

کۆستانتین لە مێژووی کەنشتەدا دۆخێکی زۆر گرنگی گێڕا، ئەوەبوو ئەنجومەنی (نیقیە) ی دامەزراند بۆ چارەسەرکردنی ئەو ستێزەو

ناكۆكییە ناوخۆییانەی لە کەنشتەدا پەیدادەبوو، کاری ئەم ئەنجومەنە کە خۆیشی ئەندامێکی کاراو چالاك بوو تیایدا... دانانی ڕێبازگەی (نیقیە) بوو کە لە دواییشدا بووە ڕێبازگەی ئەرثەدۆکسی لە کەنشتەدا.

لەوە گرنگتر ئەوەبوو کە چەند قانونێکی شارستانی دەرکرد بۆ چەند پیشەگەرییەك کە ئەویش دەبێت بە وەچەزایی بروات وەك نانەوایی و کوشتیاری[2]... واتە کوڕەزا لە سەر ئەوپیشەیە دەمێننەوە کە لە باوکییانەوە بۆیان ماوەتەوە. هەروەها قانونێکی تریشی دەرکرد بۆ وەرزێران و کشتیاران کە نابێت زەوی بەجێ بهێڵن، ئەمەیش وای لەوانە کرد کە پابەندی زەوی بن و پێوەی ببەسترێنەوە، ئاکامی ئەم قانونەیش بووە هۆی دەرکەوتنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپادا.

کۆستانتین لە کاتی سەرەمەرگیدا ڕایسپارد کە داشۆر بکرێت، هەرچەندە بەر لەوەیش بە ماوەیەکی کەم باوەڕی بە ئاینی دیان هێنابوو کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر دڵ ڕەق بوو ئەویش لەبەر چەند هۆیەکی نەزانراو. ئەڵێن ئەوەندە دڵڕەق بوو ژنەکەی خۆی و کوڕە گەورەکەی لە ساڵی ٣٢٦ ز دا لە سێدارەدا.

---

(١) کەنشتەی ئاخێزە:کنیسة القیامة.
(2) قەساب



# جۆرج واشنگتۆن

١٧٣٢ ز - ١٧٩٩ ز

George Washington

زادگای جۆرج واشنگتۆن شاری (وایکفیلْد) ی سەربە ڤەرجینای وولاْتە یەکگرتووەکانە لەساڵی ١٧٣٢ ز. کوڕی کابرایەکی کشتیاری دەوڵەمەندبوو، لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا سامانێکی زۆری لە باوکیەوە بۆ بەجی‌ما.

لەساڵی ١٧٥٣ ز تا ١٧٥٨ ز لە خزمەتی سەربازییدا بوو، لە جەنگەکانی فەرەنساو هیندیشدا بەشداری‌کرد، ئیتر بەمە شارەزاییەکی تەواوی لە تەکتیکی جەنگدا پەیداکردو زۆریش ڕێزی لی‌دەگیرا.

لە کۆتاییەکانی ١٧٥٨ زدا گەڕایەوە ڤەرجینا، وازی لە سەربازی‌ی هێنا، پاش ماوەیەکیش بێوەژنێکی بە دوو کۆلەبەسەوە مارکرد (خۆی هیچ منداڵی لی‌ی نەبوو). لەو ١٥ ساڵەی دواییندا سەرکەوتوانە سەروکاری زەویەکانی دەکرد. لە ساڵی ١٧٧٤ ز هەڵبژێرا بە نوێنەری ڤەرجینا بۆ یەکەمین ئەنجومەنی پیرانی شۆڕشگێڕان. لە حوزەیرانی ١٧٧٥ز دا جارێکی تر بۆ ئەنجومەن هەڵبژێررایەوەو هەموویش دەنگیان بۆدا کە ببێتە سوپاسالاری زەویە زەوتکراوەکان.

جۆرج واشنگتۆن بە ڕەوشتی بەرز، دەوڵەمەندی، شارەزایی لە کاروباری سەربازییدا، کەڵەگەتی (زۆر بەخۆبوو، بالآی ٦ پی‌ی‌و دووگری دەبوو)، سەرسەختی، کارزانێکی بەهرەدار، لەسەرو ئەمانیشەوە بەزەبرو یارابوو... ئەمانە هەمووی کە تیایدا کۆبووبوەوە وای لێکرد کە لە میرییدا هەڵبژێرێت بۆ ئەو پلەوپایە بەرزە. جاری خۆ بە درێژایی جەنگ زۆر چوست‌و چالاکانە لە خزمەتی سەربازییدا بوو بەبی‌ئەوەی مووچەیەك لەبری وەربگرێت.

دەسکەوتە مەزنەکانی واشنگتۆن لەنێوان ١٧٧٥ ز (ئەوکاتەی سەرکردایەتی سوپای شۆڕشگێڕانی گرتبووە ئەستۆ) و ئازاری ١٧٩٧ز بەئەنجام درا و تەواو جی‌ی خۆی‌گرت، ئەو دەمەی کە سەرۆکایەتی دووەمی وەك سەرەك کۆماری وولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کۆتایی پی‌هات. هەر لە ماڵی خۆیدا لە ڤەرجینا لە کانوونی یەکەمی ١٧٩٩ زدا کۆچی دوایی کرد.

ناوبانگی واشنگتۆن وەك مەردێکی هەڵکەوتوو و پرشنگدار لە دامەزراندنی وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا لە سێ کاری مەزندا خۆی دەنوێنێ. یەکەمیان: وەك پێشەوایەکی سەربازی سەرکەوتووی لە جەنگەکانی سەربەخۆیی ئەمەریکادا ، راستە ئەوەندەی ئەسکەندەری گەورەو پۆلیۆس قەیسەر زرنگ و لێزان نەبوو لە کاروباری سەربازییدا، بەلاّم سەرکەوتوویی تاسەری دەگەرێتەوە بۆ لێنەهاتوویی و ناچوستی سەرکردە بەریتانیاییەکان کە دەجەنگا لە دژیان. دەبێت ئەوەیشمان لەیاد نەچێت کە زوربەی ئەو سەرکردە ئەمەریکاییانەیش تەواو تێکدەشکان و دەبەزین بەلاّم واشنگتۆن زرنگانە توانی سەرەوکاری ریزەکانی سوپا بکات و تاسەر بجەنگێت، ئەنجامێکی سەرکەوتوانەیش بەدەست بێنێت، هەرچەندە لەچەند شەروشۆرێکی بچوکیشدا دەبەزی.

دووەمیان: واشنگتۆن وەك مەردێکی لێهاتوو وبەیاراو بەهێزبوو پاڵپشتی دەستووری نوێی کرد، ئەگەر ئەو نەبوایە ئەو دەستوورە جێی خۆی نەدەکردەوە لەو وولاّتە یەکگرتووانەدا چونکە بەربەرەکانی لەو دەستوورە نوێیە زۆردەکرا.

سێهەمیان: جۆرج واشنگتۆن یەکەمین سەرۆکی وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکابوو، مەردێکی زۆر پارێزراو و بەنگین بوو. هەروەك دیارە لە مێژووی وولاّتە تازە دامەزراوەکانی ئەمەریکای باشووری و ئەفەریقادا کە زۆر ئاسان و لەبارە بۆ دەوڵەتی نوێ کە بە دەستوورێکی دیموکراسیانە رەفتار بکات و پاشان بایداتە رژێمێکی

دیکتاتۆری سەربازی، بەلاّم ئەم ڕەفتارو ڕێبازە لە جەوهەری واشنگتوندا هیچ بەدی نەدەکرا بەڵکو سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو کۆت‌و بەدکارییانە بن‌بڕ بکات کە دەبوونە لەناوبردن و تێکدانی ڕیزەکانی گەلی ئەمەریکای نوێ بەبێ ئەوەی هیچ نیازی مانەوەی هەمیشەیی هەبێت لە دەسەلاّتدا.

هیچ ئارەزووی ئەوەیشی نەدەکرد کە ڕۆژی لە ڕۆژان ببێتە پاشایەك یان دیکتاتۆرێك. ئەوەی کە تەنها مەبەستی‌بوو و پێی‌ی هەستا پێشکارییەکی گەورەبوو لە دەستووردا کە تائێستایش هەر لەسەری دەڕۆن، ئەویش: (وازهێنان لە دەسەلاّت بە ڕێگەیەکی ئاشتیانە)

جۆرج واشنگـتۆن لەڕاستیدا کارمەندێکی بژێو بوو لە بزوتنەوەی سەربەخۆیی ئەمەریکا لەکاتی جەنگ‌و ئاشتیدا، بەڕادەیەکی وا کە لە هیچ بزوتنەوەیەکی پێکهاتوودا هاوتای نیە.

بە هەموو خۆڕاپەرمونێکیشەوە دەتوانین بڵێین کە پلەی لە ئەسکەندەری گەورەو ناپۆلیۆن بالاّتر بووە چونکە دەسکەوتە مەزنەکانی زۆر لەوان پتر درێژەی کێشاوە.

O



# مايكڵ فەرەدای..

١٧٩١ ز – ١٨٦٧ ز

**Michael Faraday**

چەرخی کارەبا بە دەرکەوت.... ڕاستە چەرخی ئێستامان جاروبار بە چەرخی بۆشایی ناودەبرێت، هەندێ جاریش بە چەرخی ئەتۆم... هەرچەندە ئەو گەشتە ئاسمانیانەی کە دەکرێت و ئەو چەکە ئەتۆمیانەی کە بەهەموو هێزو ووزەیەکی شاراوەیەوە کە هەیەتی تاڕادەیەکی کەم کاری بۆسەر ژیانی ڕۆژانەمان هەیە، بەڵام هەمیشە پێویستمان بەکارەبا هەیە لە بەکارهێنانی ئامرازە کارەباییەکاندا، دەتوانین بەوپەڕی بڕواو ئارماندەوە بڵێین کە هیچ داردەیەکی تەکنۆلۆجی وەك

بەکارهێنانی کارەبا ئەوەندە جێ‌ی خۆی نەکردۆتەوەو بەتەواوی باڵی بەسەر چەرخی نوێاندا ئاوەها نەکێشاوە.

زۆر لە کارمەندانو خاوەن بەهرە هاوبەشییان کردووە لە دۆزینەوەی نهێنیەکانی کارەبادا، بەڵام ئەوەی کە پتر رەنجی لەم بوارەدا دەرکەوت دووزانای بەریتانیایی بوون مایکڵ فەرەدای‌و جێمس کلارك ماکسوێڵ کە کاری هەریەکەیان تەواوکەری ئەوتریانە. وەنەبێت ئەو دوو زانایەیش پێکەوە هاوکارییان کردبێت، بەڵکو دەستکەوتەکانی هەریەکەیان بە تەنها وایان لێ‌دەکات کە ئاستێکی بەرێزو هێژایان هەبێت لەم لیستەدا.

مایکڵ فەرەدای ساڵی ۱۷۹۱ ز لەشاری (نیوئانگتن) ی سەربە ئینگلتەوە لە بنەماڵەیەکی هەژار لەدایك بووە. هەر بەسە رشتەیی خۆی رۆشنبیری‌وخوێنەواری فێربووە. لە تەمەنی ۱٤ ساڵیدا بوو بە شاگردێکی فێرو شارەزا لە پیشەی چزوبەندی سپیارەدا، ئینجا کەوتە پەراو فرۆشتن، ئەم کارەی بە هەلزانی تاکو خۆی بێدار بکاتەوەو زۆر سەرنج بدات لەو پەراوانە. لە تەمەنی ۲۰ ساڵیدا لە چەند کۆرێکی زانای بەریتانیایی بەناوبانگ (سێر هامفری داڤی) دا ئامادە دەبوو و زۆر بە تەوسەوە گوێ‌ی بۆ دەگرت، تا لەدواییدا بۆ (داڤی) نووسی‌و داوای لێکرد کە بیکاتە یاریدەدەری خۆی. لە ماوەی ۷ ساڵرا فەرەدای بەخۆی کەوتە زانستگەرییە تایبەتیەکانی، هەر چەندە زەمینەیەکی ئەوتۆی نەبوو لە زانستی بیرکارییدا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فیزیکزانێکی چوست‌و بێخەوش بوو لە تاقیکارییەکانیدا. یەکەم داهێنانی کارەبایی

لەساڵی ١٨٢١ ز دا بوو، ئەویش ئەوەبوو پێش دووساڵ (واتە ١٨١٩ز) زانای بەناوبانگ (ئۆرستد) بۆی دەرکەوت کە ئەگەر بێتو بە تەلێکدا تەزوویەکی کارەبای پیابڕوات‌و نزیك بکرێتەوە لە قیبلەنمایەك (کە موگناتیسی تێدایە) ئەوا میلی (دەرزی) قیبلەنماکە لادەدات.

فەرەدای لەمکارەوەڕا ئەوەی بۆهات کە دەبێت تەلەکەیش بکەوێتە جوڵە ئەگەر قیبلەنماکە جێگیربێت. پاش لێکوڵینەوەیەی بێ‌ووچان گەیشتە داهێنانێکی زۆر مەزن ئەویش ئەوەبوو کە تەلێکی نزیك بە موگناتیس هەمیشە لەسوڕانەوەدا دەبێت ئەگەر تەزوویەکی کارەبایی لەو تەلەدا تێپەڕێت. لەڕاستیشدا یەکەمین داهێنراوی فەرەدای ماتۆری کارەبایی بوو، هەرچەندە زۆر سەرەتاکاری پێوە دیاربوو بەلاّم هەر بە

یەکەمین نۆبەرەی ئەو ماتۆرە کارەباییانەی جیهان دادەنرێت کە ئێستا کاریان پێدەکرێت. هەرچەندە ئەم کارانەی هەنگاوێکی زۆر مەزن بوو بەلاّم سوودی زانستی تارادەیەك کەم بوو، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ڕێگەیەك بۆ پێکهێنان‌و پەیداکردنی تەزووی کارەبایی نەك بەو ڕێگە سەرەتاییەی کە بە باتریبە کیمیاییەکان پەیدا دەکران. فەرەدای هاتەسەر ئەو بیرەی کە دەبێت ڕێگەیەکی تر هەبێت بۆ پەیداکردنی کارەبابە بەکارهێنانی موگناتیس. ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٣١ ز دا بۆی

دەرکەوت کە ئەگەر موگناتیسێك بەخێرایی بەناو کۆکڵە (کۆیل) یەکی گەیەندردا ببرێت ئەوا تەزوویەکی کارەبایی لە تەلی کۆکڵەکەدا پەیدا

دەبێت، ئەنجامی ئەم کارە پێی دەووترێت هاندانی ئەلەکترۆموگناتیسیی Induction of Electormagnatism. جا دۆزینەوەی ئەو قانونەی کە ئەم هاندانە بە ڕێکی پیشان دەدات قانونەکەی فەرەدایە Farady's Lawof Induction کە بە مەزنترین دەستکەوتەکانی فەرەدای دادەنرێت.

○



# جێمس ماکسوێڵ..

١٨٣١ ز - ١٨٧٩ ز

James Clark Maxwell

فیزیکزانی بەریتانیایی مەزن جێمس کلارك ماکسوێڵ بە دارشتنی چوار هاوکێشەی گرنگ توانی ئەو قانونە سەرەکییانەی کارەباو موگناتیسیی کۆبکاتەوەو روونو یەکالای بکاتەوە.

ئەم دوو رشتەیە (کارەباو موگناتیسیی) بەر لەماکسوێڵ زۆر بە ووردیو تێروتەسەلی لێی دەکۆڵرایەوە، دیارو ئاشکرایشە کە ئەم دووانە تانوپۆی یەکترنو هەر یەکێکیان بگرین پەیوەستی ئەوی تریانە، هەر چەندە زانایانی پێش (ماکسوێڵ) یش چەندین قانونی کارەباو

موگناتیسییان دۆزیبوویەوە بەڵام بیردۆزەیەکی وافراوان نەبوو کە بتوانێت چونیەکیان بخات.

ماکسوێڵ بە دانانی چوار کورتە هاوکێشەی ساکار توانی بە ووردی ئەو پەیوەندە ئاڵشتیانەی نێوان کایەی کارەباو موگناتیسی ی کەهەن روونیان بکاتەوە. ئا بەم کارەمەزنەی ئەو دیادە سروشتیە ئاڵۆزانەی گواستەوە بۆ بیردۆزەیەکی راستورەوان بە رادەیەکی وەها کە بە درێژایی سەدەی رابووردوو بەکاردەهێنراو خرابووە گەڕ لەزانستە بیردۆزەیی و تاقیکارییەکاندا.

گرنگی هاوکێشەکانی ماکسوێڵ لەوەدایە کە بریتییە لەچەند هاوکێشەیەکی گشتی گونجاو لەهەموو مەرجو بارێکدا، دەیشکرێت زوربەی ئەو قانونە کارەباییە زانراوانە لە هاوکێشەکانی ماکسوێڵەوەرا وەربگیرێت سەرەرای چەندین ئەنجامی تریش کە نەدەزانرا پێش ئەو ئەو نوێکارییە گرنگانەی کە ماکسوێڵ بەخۆی دەرەنجامی کرد بریتی‌بوو لە لەرەخولەکیەکان Rotational Vibrations لەکایەی کاروموگناتدا. بەم لەرە دەوترێت پێلەکارۆ موگناتەکان Electromagnetic Waves. ئەگەر ئەم پێلانە لە سەرچاوەیەکەوە بێت ئەوا بە بۆشایی ئاسمانرا درێژدەبێتەوەو بە خێرایی بلاودەبێتەوە بەرەو دەرەوە. جا ماکسوێڵ خێرایی ئەم پێلانەی بەژمێرە پێوا کە دەکاتە نزیکەی ٣٠٠٫٠٠٠ کم/چرکە (١٨٦٫٠٠٠) میل/چرکە ئەمەیش بریتییە لە خێرایی تاف «رووناکی»، لەگەڵ ئەوەیشدا بۆی دەرەنجام بوو کە تاف پێکهاتووە لە کارۆموگناتەکان. ئەم هاوکێشانەی ماکسوێڵ

وەنەبێت تەنها هەر بریتیبن لەو قانونە سەرەکییانەی کارەباو موگناتیسیی بەڵکو قانونە سەرەکییەکانی (بینازانیی Optics) یش دەگرێتەوە. جا لە ڕاستیدا هەموو ئەو قانونانەی بینا دەتوانرێت دەرەنجام بکرین لە هاوکێشەکانی ماکسوێڵدا سەرەڕای زۆر لەو ڕاستیو پەیوەندییانەیش کە جاران نەدۆزرابوونەوە.

تاڤی بینراو وەنەبێت تاکە سروشتێك بێت لە تیشکدانەوەی کارۆموگنەتدا. تەنانەت ماکسوێڵ سەبارەت بەم ڕشتەیەیش بەهاوکێشەکانی دەریخستووە کە چەند پێڵێکی کارو موگناتیسیی تر هەن کە جیاوازن لە تاڤی بینراو لە درێژی لەرزە frequency و لەرانەوە Vacillation یاندا. هەر کاتی خۆیشی زانای مەزن هەرتز ئەو دەرەنجامە بیردۆزانەی بەکردار دووپات کردبوەوەو توانیبووی ئەو پێڵە نەبینراوانەیش بدۆزێتەوەو بیانهێنێتە بەرهەم کە کاتی خۆی ماکسوێڵ پێشبینی لیێدەکرد. پاش چەند ساڵێکیش کارزانی مەزن مارکۆنی دەریخست کە ئەو پێڵە نەبینراوانە دەشێت بەکاربهێنرێت لە گەیاندنی بێسیمیدا کاتێك کە ڕادیۆ بووە دیاردەیەکی ڕاستی، لەم ڕۆژانەیشدا لە تەلەفزیۆندا بەکاردەهێنرێت.

هەر چەندە سەرەتای ناوبانگی ماکسوێڵ لەسەر ئەوکارە باڵاو کاریگەرانەی بوو دەربارەی جیهانی کارۆموگناتیسییو بیناکان... بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هاوبەشی زۆر هەبوو لەبواری زانستەکانی تردا وەك بیردۆزەکانی گەردوونو دینامیکی گەرمایی. یەکێ لەو بابەخ پێدانە تایبەتییانەی لە بیردۆزەی چالاکی گازەکاندا بوو، بۆی دەرکەوت کە

گازەکان ڕەوتی خێراییان وەك یەك نیە، هەندێك لە گەردی گازەکان بەخێرایی دەڕەوتێن و هەندێکیان بەسستی و هەندێکی تریشیان زۆر بە خێرایی. ماکسوێلّ لەمەیشەوە ڕا توانی بیردۆوزەیەك دابڕێژێت و سنورێك بۆ ژمارەی کەرتی مۆڵی .Mole fraction no دابنێت بۆ هەر گازێك کە خێراییەکی دیاریکراوی هەبێت، بەم شێوگە دەوترێت بلآوبوونەوەی ماکسوێلّ Maxwell Distribution. ئەم بیردۆزەیە بەفراوانترین شێوگێکی گشتی دادەنرێت کە تائێستا بەکار هێنرابێت و خرابێتەکار لە چەندین بواری زانستدا.

لە دایك بوونی ماکسوێلّ دەگەڕێتەوە بۆ سالّی ١٨٣١ ز لە ئەدنبرەی سەر بە سکۆتلەندە، هەر لەسەرەتای منداڵیەوە زرنگی و بلیمەتی پێوە دیار بوو، لە تەمەنی ١٥ سالّیدا بوو ڕاپۆرتێکی زانستی بە چفاتی شاهانە پێش‌کەش کرد لە ئەدنبرە:

ماکسوێلّ دەرچووی زانکۆی (کامبورج)ە، زوربەی ژیانی وەك ئوستادێکی زانکۆ گوزەران دەکرد، ژنێکی هێنا بەلآم هیچ منداڵێکیان نەبوو، ئیتر هەروەها بە وەجاخ کوێری لە تەمەنی ٤٨ سالّیدا بە نەخۆشی کانسەر مرد.

ماکسوێلّ دادەنرێت بە مەزنترین فیزیکزانی بیردۆزە لەو سەردەمەی نێوان نیوتن و ئەنشتایندا.

برایان

ئۆرڤیڵ ڕایت
١٨٧١ ز - ١٩٤٨ ز

وڵبەر ڕایت
١٨٦٧ز - ١٩١٢ ز



Wilbur Wright — Orville Wright

وڵبەر ڕایت ساڵی ١٨٦٧ ز لەشاری میلڤیل سەر بە ئەندیانای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە دایك بووە، براکەیشی ساڵی ١٨٧١ ز لەشاری دایتۆن سەربە ئۆهایۆ لە دایك بووە. هەردووکیان تاڕادەیەك پلەی خوێندنیان بێبڕوانامە تەواو کردووە.

ئەم دووبرایە زۆر زرنگ و هەڵکەوتوو بوون لە میکانیکاریداو زۆریش بایەخیان دەدا بە فڕین. لە ساڵی ١٨٩٢ زدا وەرشەیەکیان

کردەوە بۆ فرۆشتنو چاککردنی پاسکیل، بەم کارەیان توانییان پارەیەکی
ـش پاشەکەوت بکەنو خۆیان تەرخان بکەن بۆ گەڕان لە دوای
چۆنیەتی فرین. بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستەیان کەوتنە خوێندنەوەو
ێکۆڵینەوەی ئەو نووسراوانەی کە بایەخیان دەدا بەفرین. گەیشتنە
ئەوەی کە لە ساڵی ١٨٩٩ زدا هەر بە خۆیان دەست بکەن
ـەکارکردن، لەپاش ڕەنجو ئەرکێکی بێووچان کە پتر لە چوار ساڵی
خایاند توانیان ئاکام وەدەست بێنن. لەوانەیە پرسیار بکرێت لەوەی
کە بۆچی برایانی ڕایت ئاکامیان هێناو کەسانی تر لەم کارەدا
شکستییان هێنا؟... لێرەدا چەندین هۆی سەرکەوتنیان لەم بوارەدا
دێتە پێشەوە:

هۆی یەکەمیان ئەوەیە کە دوو مێشك باشترو بە ئاکامتر لەیەك مێشك کار دەکات، جا ئەم دوو برایە هەمیشە پێکەوە بوونو هەر پێکیشەوە کاریان دەکرد.

هۆیەکەی تری ئەوەیە کە بڕیارێکی ژیرانەیان دا لەسەر فێربوونو ڕاهێنان لەسەر چۆنیەتی فرین بەر لە دروستکردنی. ئەمەیش تا ڕادەیەك لەوانەیە بڕیارێکی سەیرو بێجێ بێت چونکە مرۆڤ چۆن دەتوانێت فێری فرین بێت بەبێ فڕۆکە؟. وەڵامەکەیشی ئەوەیە کە برایانی ڕایت بە سەرشتەیی خۆیان توانیان فێری فرین ببن بە بەکارهێنانی فڕۆکەی بێماتۆر.

لە پێشدا دەستیان کرد بە دروستکردنی فڕۆکەی بێماتۆر، لە ساڵی ١٩٠٠ زدا یەکەم فڕۆکەیەکیان لەم جۆرە دروست کرد کە جێی یەك

کەسی تیادا دەبووەوە. ویستیان پێی بفڕن بۆ باکووری کارۆلینا بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، یەکێکی تریان دروست کرد دیسان هەر سەرنەکەوتن. بۆ جاری سێهەم تاقیکردنەوەکەیان سەرکەوتوانە هێنایەدی. دوای ئەوە پتر لە ١٠٠٠ جار سەرکەوتوانە بە ئاسماندا سوڕانەوە. ئیتر برایانی ڕایت بوونە سەرکەوتووترین فڕۆکەوانی چارۆکەدار[1] لە جیهاندا بەرلەوەی فڕۆکەی پەروانەدار بێتەکایەوە.

ئەو کۆسپەی دەهاتە ڕێیان ئەوەبوو کە چۆن بتوانن ڕەوتی فڕۆکە بخەنە ژێر ڕکێفەوە لە ئاسماندا. زۆر خەریك بوون بە نەخشاندنی چەند ڕێگەیەك بۆ هێشتنەوەو لەنگەری فڕۆکەکەیان تاکو گەیشتنە داهێنانی سیلا گۆڕین بۆ دەست‌بەسەرڕاگرتنی جوڵانەوەی. ئەم داهێنانە گرنگەیان یارمەتی ئەوەی‌دان کە سەرکەوتنێکی زۆر باش بەدەست بێنن. هەروەها زۆر هەوڵ و ڕەنجیان کێشا لە دروستکردنی باڵی گونجاو بۆ فڕۆکە، جا لە ڕاستیدا گەورەترین گیروگرفت کە هاتە ڕێیان نەبوونی ماتۆڕی فڕۆکە بوو، ئەو دەمەیش ماتۆڕی هەڵمی لە ئارادا بوو، بەڵام هەڵگرتنی زۆر سەنگین بووو ئەوەندەیش لەبار نەبوو کە بەکاربهێنرێت.

لەبەر ئەوە هەر بەخۆیان ماتۆڕێکی‌تەقینەرەیان‌دروستکرد و زۆر بە سەرکەوتوانە توانییان بەکاری بێنن، بێگومان ئەمەیش بەڵگەیەکە بۆ زرنگییان کە توانییان پێش هەموو کەسێك ئەم جۆرە ماتۆڕە دروست بکەن جگە لەوەیش کە زۆر بە لێهاتوویی توانییان پەروانەی فڕۆکە دروست بکەن.

براياني ڕايت له ١٧ی كانونی يەكەمی ١٩٠٣ زدا يەكەمين فڕينيان هێنايه دی لەنزيك شاری كيتی‌هوك له باكووری كارۆلينادا. لەو ڕۆژەدا دوو گەشتيان كرد. يەكەم جار ئۆرڤيل پیێ هەستا كه نزيكەی ٢٢٠ پیێ بڕی له ١٢ چركەدا، فڕينی دواييبيشيان ولبەر پیێ هەستا كه نزيكەی ٨٥٢ پیێ بڕی له ٥٩ چركەدا. ئەم فڕۆكەيان ناونا فروكەی ژماره (١)، زياتر له هەزار دۆلاری تێچوو، درێژی باڵەكانی چل پێ‌و كێش ٧٥٠ پاوەند بوو. تواناى مەكينەكەی ١٢٠ ئەسپ‌و كێشی ١٧٠ پاوەند بوو. هەتاكو ئێستايش ئەو فڕۆكەيه به ئاسمانی مۆزەخانەی نيشتمانی له واشنگتۆندا پارێزراوه. هەرچەنده پێنج كەس لەو يەكەمين فڕينەياندا ئامادەبوون كەچی ڕوژنامه بۆ ئەو ڕۆژەی دوايی هيچيان له بارەيەوه بڵاونه كردەوه. نزيكەی پێنج ساڵ بەسەر ئەم كارەمەزنەياندا تێپەڕی ئينجا بۆ جيهان هاتەدی كه مرۆڤ به كردەوه سەركەوت‌و به ئاوات گەيشت له فڕيندا.

---

چارۆكەدا: بايەوان: glider.



# ئەنتوان لاڤوازێ..

١٧٤٣ ز - ١٧٩٤ ز

Antoine Laurent Lavoisir

زانای فەڕەنسایی بەناوبانگ ئەنتوان لاڤوازێ... بە کاریگەر ترین کاتسێك دادەنرێت لە پەرەپێدانی کیمیا زانیدا. لە سەردەمێکدا لە دایك بوو (ساڵی ١٧٤٣ ز لە پاریس) کە ڕشتەی کیمیا زۆر لە دوا کەوتندا بوو لە چاو زانستەکانی فیزیك و بیرکارییدا. کیمیازانەکانی ئەو سەردەمە هەرچەندە زۆر ڕاستییان روون کردبووەوە بەڵام توانای ئەوەیان نەبوو کە بیخەنە چێوەیەکی زانستانەوەو ئەو زاراوەو بیردۆزە پەرتوبڵاوانە گەڵاڵە بکەن و بیۆلێن.

ئەو بڕوا ناڕاستانەی کاتی خۆی باوبوون ئاوو هەوایان بە توخم دادەنا تێگەیشتنی هەڵەیان هەبوو سەبارەت بە سروشتی ئاگر. لەو بڕوایەدا بوون کە هەرچی مادەیەکی گڕاوی هەیە مادەی (فلۆجستۆن Phlogiston)ی تێدایە. ئەو مادده گڕاوییانە لە سوتاندا مادەی فلۆجستۆنی لێوە دەردەپەڕێت. بەڵام لە ساڵەکانی نێوان. ١٧٥٤ ز – ١٧٧٤ زدا هەندێ کیمیازانی هەڵکەوتوو هاتنەکایەوەو توانییان چەند گازێك جیابکەنەوە وەك ئۆکسجینو هایدرۆجینو نایترۆجینو دایۆکسیدی کاربون. ئەوانەی کە هەر بڕوایان بە فلۆجستۆن هەبوو ئیتر نەیاندەتوانی لە سروشتە کیمیاییەکانی ئەو مادە تێبگەن. لاڤوازێ زۆر تێدەکۆشی ئەو زانراوە سەرسورهێنەرانە کۆبکاتەوەو بەرێبازێکی ڕاستو زانستانە بیردۆزەیەکی کیمیاییان لەسەر داربڕێژێت. جارێ پێش هەموو کارێکی بیردۆزەی فلۆجستونی پووچاندەوەو ووتی:

کرداری سوتاندن پەیدا دەبێت لە یەکگرتنی مادەی سوتاو لەگەڵ ئۆکسجیندا، لەدوایشدا دەریبڕی کە ئاو توخم نیە بەڵکو ئاوێنەیەکی کیمیاییە لە ئۆکسجینو هایدرۆجین، هەروەها (هەوا)یش پێکهاتووە لە چەندین گازی وەك ئۆکسجینو نایترۆجین و دایۆکسیدیکاربون...

بەڵێ... لەم ڕۆژانەدا ئەم هەموو بیروڕایانە ڕوونو ئاشکران بەڵام بەر لە هاتنی لاڤوازێو تەنانەت لە سەردەمی خۆیشیدا نەدەزانران، هەتا وەکو زۆر لە کیمیازانە ناسراوەکان ئەم بیردۆزانەی لاڤوازێیان

لاپەسەند نەبوو. بەڵام پەڕاوە بەرنامەییەکەی کە بۆ خوێندگاکانی دانابوو بە ناوی (توخمەکانی کیمیا)، بە شێوازێکی وارێکو زانستانە هۆنیبویەوە وای لە لاوە کیمیازانەکان کرد کە بە زووبی بڕوای پێبکەن.

پاش ئەوەی کە ڕوونی کردەوە هەواو ئاو توخم نین، هەر لە پەڕاوەکەیدا لیستەیەکی دانا بۆ ئەو مادانەی کە لای خۆی توخمن.

هەرچەندە ئەم لیستەیەی چەند هەڵەیەکی تێدابوو، بەڵام دەبێت بزانین کە خشتەی خولی نوێی توخمە کیمیاییەکان لەسەر خشتەکەی لاڤوازیێ دانراو فراوانتر کرا.

لاڤوازیێی مەزن یەکەم کەسێك بوو پەی بە (یاسای مادە پارێزی The Law of mass Conservaton) برد لە کارلێکە کیمیاییەکاندا، واتە لە کارلێکردنی کیمیاییدا دەشێت ئەو توخمانە لە ماددەیەکدا خۆیان ڕێك بخەنەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە دەیزانی مادە هەرگیز هیچی لێ نایەتو وون نابێت.

لە کاتی شۆڕشی فەرەنساییدا لە ٨ ی ئایاری ١٧٩٤ زدا لەگەڵ ٢٧ کەسدا بەیەك ڕۆژ فەرمانی کوشتنیان دەرچوو بە سەربڕین بەڵام لە دواییدا لێی خۆشبوونو لەدادگا بەزەییان پێداهاتەوە، هەرچەندە

دادبار دەیگوت: «ڕژێمی کۆماری هیچ پێویستی بە بلیمەتان نیە» بەڵام یەکێ لەو هاوڕێیانەی لاڤوازیێ کە بیرکارزانێکی مەزن بوو بە ناوی لاگرانج ووتی «سەر بڕینی تەنها چاو تروکاندنێك دەخایەنێ لەگەڵ ئەوەیشدا ڕەنگە سەدان ساڵی تر بەس نەبێت بۆ بژاردنی.




---

بیردۆزەی فلۆجستۆن... (وەرگێڕ)



# سیگمۆند فرۆید...

۱۸٥٦ ز - ۱۹۳۸ز

**Sigmund Freud**

سیگمۆند فرۆید... دامەزرێنەری شیکارزانی دەروون Psychoanalysis لەشاری فرابیرگ لەدایك بوو کە ئێستا سەر بە وولاتی چیکۆسلۆڤاکیایە، جاران سەر بە ئیمپراتۆریێی نەمسا بوو. لە تەمەنی چوار ساڵیدا بە خێزانەوە گواستیانەوە بۆ ڤییەنا ئیتر بە درێژایی ژیانی هەر لەوێ مایەوە .

فرۆید زانکارێکی زۆر زرنگ بوو لە خوێندگادا، ساڵی ۱۸۸۱ز پلەی دکتۆرای پزیشکیی لە زانکۆی ڤیەننا وەرگرت، لەو دەساڵەی

دوایین ڕا بە زانستگەرییەکانی فسیۆلۆجیەوە خۆی خەریك کردو چووە پاڵ پزیشگا دەروونیەکانەوە. پاشان هەر بە خۆی پزیشگایەکی تایبەتی کردەوە بۆ لێکۆڵینەوەی نەخۆشییەکانی پەی[1].

ئەو بیروڕایانەی دەربارەی زانستی دەروون بەرەبەرە پەرەی سەند، ئەوەبوو لە ساڵی ١٨٩٥ زدا یەکەم پەڕاوی بڵاوکردەوە بە ناوی (چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی هیستریا)، دووەم پەڕاویشی لە ساڵی ١٩٠٠ زدا بڵاوکردەوە بەناوی (خەونامە) کە بە شاکارە نووسینەکانی دادەنرێت. پاش ئەوەی ناوی کەوتە نێوانەوەو ناوبانگی دەرکرد، چەند کۆڕێکی ساز کرد لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، دەستەیەکیان ڕێکخست بۆ لێدوانی پێویستیەکانی دەروون لە ڤیەننا لەگەڵ (ئەلفرێد ئەدلەر)ی زانا کە کۆنترین ئەندامی ئەو دەستەیە بوو. لە دوایشدا (کارل یۆنگ) هاتە ڕیزیانەوە، ئەم دوانە پاشان بوونە زانا بەناوبانگەکانی دەروون لە جیهاندا.

فرۆید لەگەڵ ژنو شەش منداڵەکەیدا ژیانێکی ئاسوودەیان گوزەران دەکرد بەڵام لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا دووچاری نەخۆشی کانسەری چەناگە بوو.

هەرچەندە لە ساڵی ١٩٢٣زیەوە بەو نەخۆشییەوە دەنیاڵاندو پتر لە ٣٠ جاریش نەژدارکاری بۆکرا بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هەر سوور بوو لەسەر کارکردنو خەریك بوونی بێ ووچان بە زانستگەرییە گرنگەکانیەوە. لە ساڵی ١٩٣٨ زدا نازییەکان هاتنە نەمساوە،

فرۆیدیش لەبەر ئەوەی کە جوولەکە بوو تەنگیان پی ھەڵچنیو ناچار کرا کە رابکات بۆ لەندەنو ھەر لەوی بەجگاری نیشتەجی ببێت تا لە تەمەنی ۸۲ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد .

کاریگەری فرۆید سەبارەت بە زانستی دەروون «دەروون زانیی» زۆر زۆر بەرینو فراوانە بە رادەیەك کە ناتوانین بە کورتی بیبرێنینەوە بەلام ئەوەندەی کە مەبەستمانە لە روونکردنەوەی بیرە بنەرەتیەکانی ئەوەیە کە سوور بوو لە گرنگیو بایەخ پێدانی کردارەکانی بێ ئاگایی مێشك لە رەفتاری مرۆڤدا، بۆی دەرکەوت کە ھەر ئەو کردارە نابێدارانەیە کاردەکەنە سەر خەون، تگەی زمان، فەرامۆشی. ھەندێك لەو رووداوانەی کە مرۆڤ ئاراستەی خۆی دەکات و ھەر لەبەر خۆیەوە دەیجووێتەوە، لەگەڵ چەندین نەخۆشی تر کە بەسەر مرۆڤدا دێت .

فرۆید بە لێھاتووانە توانی شێوازو تەکنیکێکی دەروون شیکاریی پەرەپێبدا بۆ دامرکانەوەی ئەو نەخۆشییانەی مێشك. بیردۆزەیەکی دارێژا دەربارەی کەسایەتی مرۆڤ (یان جەوھەری مرۆڤ). ھەروەھا توانی ئەو بیردۆزە دەروونیانە بە ئاسانی دابرێژێت کە دەڕوانێتە سەر مەراق، شپرزەیی و میکانیکی بەرگریکردن، گرێی خەساندن، پیس خواردنەوە، خۆ چەوسانەوە، ھەڵچوون.... جا ئەو بیرورایانەی کە لەو سەردەمەدا پێشنیاری دەکرد بووبوونە مشتو مڕێکی گەرم لە نێو کۆمەڵو کۆڕی زانستدا .

فرۆیدا بە یەکەمین زانایەك دادەنرێت کە بیرکی (شاراوە با)ی هێنایە کایەوە کە دۆخێکی سەرەکی دەبینێت لە نەخۆشییەکانی ئاوەزو (پەی) یدا، هەروەها روونی کردەوە کە هەست بە باکاری هەر لە سەرەتای منداڵیەوە پتر دەست پێدەکات بە تایبەتی لە هەرەتی هەرزەکاریدا .

زوربەی ئەو بیرورایانەی فرۆید تا ئێستا لە لێدواندایە لەبەر ئەوە زۆر لامان قورسە ئاستی دیاری بکەین لە مێژوودا، هەر چەندە زانایەکی پێشەنگ بوو لە بواری دەروونزانییدا کەچی بیردۆزەکانی (بە پێچەوانەی داروینو باستۆر هیچ بایەخێکی ئەوتۆی پێنەئەدرالە کۆمەڵگای زانستدا، جا لەبەر ئەوە سەختە گەر سەرنج بخرێتە سەر پاژێك لە بیروراکانیو گەوارێکی زانستانەی بدرێتیو بە راست دابنرێت. سەرەرای ئەمانەیش هیچ گومان لەوەدا نیە کە فرۆید زانایەکی پەرەپێدەرو هەڵکەوتوو بوو لە مێژووی بیرکردنەوەی مەردومدا، چونکە بەراستی بیرەکانی لە دەروونزانییدا شۆرشێکی مەزنی بەرپاکردە شێوازی تێگەیشتنمانو چەمکێکی نوێی خستە ئاوەزی مەردومەوە . ئەو زاراوانەیشی کە پێشکەشی کردو بووە باو لە نێو مەردومدا شێووگێکی جیهانی وەرگرت لە بەکارهێنانیاندا، بۆ نموونە زاراوەی (من) Ego، (ئەو) Id، یان (منی مەزن) Supergo، ئارەزووی مردن...

---

(١) پەی : رەهـ : عصب : nerve.

(١) با : جنس .

(٢) باکاری : هەوەسی جنسی .



# ئەسکەندەری گەورە...

٣٥٦ پ ز - ٣٢٣ پ ز

Alexander The Great

ئەسکەندەری گەورە... کە بەناوبانگترین جیهانگیر بوو لە جیهانی کۆندا ساڵی ٣٥٦ پ ز لە شاری (بیلا) پایتەختی مەکدۆنیای سەر بە وولآتی یۆنان لەدایك بووە. (فیلیپ)ی دووەمی باوکی کە پاشای مەکدۆنیا بوو مەردێکی زۆر جەربەزەو دووربین بوو، بە لێهاتوویی سوپای مەکدۆنیای ڕێکخستەوەو باربۆی کردو کردیە هێزێکی نەبەز و یارا.

لە سەرەتادا سوپای خستەگەڕ بۆ گەمارۆدانی هەندێ لەو ناوچانەی باکووری یۆنان، ئینجا ئاڕاستەی کردە باشوورو زوربەی

ناوچەکانی تر. لە دوایدا یەکانگیرییەکی تەواوی سازاند لە نێو وولاتی یۆنانداو خۆی کردە سەرۆکی. هەر بەمەیشەوە دانەمرکا کەوتە پیلان گێران بۆ داگیرکردنی وولاتی پارس بەلاّم بەنائومێدی لە تەمەنی ٤٦ ساڵیدا کوژرا .

ئەسکەندەر لە تەمەنی ٢٠ ی ساڵیدا بوو کە باوکی مرد، لەبەر ئەوە بەبێ هیچ کۆسپ و کێشەیەك هەروا بە ئاسانی هاتە سەر تەختی دەسەلاّت. باوکی بەر لە مردنی ئارادەیەك هەموو پێویستیەکی ئامادە کرد بوو بۆ جێ نشینی کورەکەی. بێگومان ئەسکەندەر یش هەر لە منداڵیەوە شارەزاییەکی چاکی پەیدا کرد بوو لە کاروباری جەنگدا سەرەرای ئەوەیش کە تەواو قاڵ بوو بوو و بیرو هۆشی کرابوو بووەوە لە ژێر چاودێری و ئاگاداری مامۆستا بلیمەتەکەی (ئەرەستۆ)ی فەیلەسوف .

جا هەر کە فیلیپ شا مرد گەلانی یۆنان زۆر شادو خۆشنود بوون، بە دەرفەتیان زانی کە خۆیان لە جەورو ستەم ئازاد بکەن بەلاّم ئەسکەندەر کە هاتە سەر تەخت لە ماوەی دوو ساڵرا توانی هەموو دوژمنان و بەرەنگارانی سەرکوت بکاتەوە. پاش ئەو کارانەی ناوخۆ مری خۆشکرد لە دەرەوە بۆ هێنانەدی نیازو ئارەزووەکانی باوکی. لەبەر ئەوە تەواو خۆی تەرخان کرد بۆ هێرش بردن بۆسەر شاشانی پارس. شاکانی پارس ناوچەیەکی فراوان و بەرینیان بە دەستەوە بوو لە دەریای سپی یەوە هەتا هیندستان. هەر چەندە ئەوەندە هێزو توانایان نەمابوو بەلاّم هەر کۆسپ و ملۆزمێکی سەهەند بوون بۆ ئەسکەندەر .

لە ساڵی ٣٣٤ پ ز لەشکری بەرێخست بۆ پەلاماردانی ئیمپراتۆرێتی پارس، ئۆردو یەکیشی لەو لەشکرەی هێشتەوە بۆ پاراستنی

تەختو ناوچە داگیرکراوەکانی لە ئەوروپا .

ئەویتر کە خۆی ئەدا لە ٣٥ هەزار جەنگاوەر لە تەك خۆیدا بەرێیکرد. ئەگەرچی هێزەکانی بە ژمارە کەمتر بوون بەلاّم هەر چونێك بێت بە لێهاتوویی خۆی توانی سەرکەوتنێکی دیار بە ئەنجام بداتو سوپاکانی پارس ببەزێنێت .

سێ هۆی سەرەکی بوونە پاڵپشتی ئەو سەرکەوتنانەی یەکەم : ئەو لەشکرەی کە باوکی بۆی ئامادە کردبوو تەواو ئازاو رێکخراوتر بوو لە لەشکری پارس .

دووەم : بە تایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ سالاریو زرنگی خودی ئەسکەندەر بە رادەیەکی وا کە رەنگبێت چەرخی رۆژگار یەکێکی وەهای بەخۆیەوە نەدیبێت .

سێهەم : ئازایەتیو سڵ نەکردنەوەی ئەسکەندەر کە بەتەواوی شیرازەی جەنگی سەرانسەر گۆڕی. هەر خۆی سەرکردەو پێشەنگی لەشکرەکەی دەکردو خۆیشی دەخستە مەترسیەوە، داوای لە هیچ کەسێك نەدەکرد کە بە کارێك هەستێت گەر خۆی لەگەڵدا نەبایە، هەتاوەکو چەند جار لەو شەڕو شۆڕانەدا بریندار دەبوو، سوپاکەیشی کە ئەمەیان لێ دەبینی ئەوەندەی تر گورج دەبوونەوەو وورەیان بەتینتر دەبوو. بێگومان ئاکامی ئەو خۆش رەفتارییەی بووبە هۆی سەرکەوتنی ئەو نەخشەو پیلانانەی .

ئەسکەندەر یەکەم جار سوپاکانی بەرەو ئاسیای بچوك بەریکرد، هەرچی خێڵو میرنشینە بچووکەکانی ئەو هەرێمانە بوو هەمووی تێکشکاند. ئینجا روویکردە باکووری سوریاو بەرەنگاری سوپاکانی پارس بووەوە. هەر لە کارزاری (ئیسوس) دا توانی سوپاکانی پارس

بەزێنێت. پاشان بەرەو باشوور بووەوەو گەمارۆی شاری (سور)ی فینیقیەکانی‌دا بۆ ماوەی ٧ مانگ تا توانی داگیری بکات. لەو کاتەی کە نە گەمارۆدانی (سور) دا بوو نامەیەکی لە پاشای پارسەوە بۆ هات داوای لێکرد کە واز لە نیوەی ئیمپراتۆرێتەکەی دەهێنێت گەر دۆستایەتی لەگەڵدا مۆر بکات، جا یەکێك لە یاوەرە نزیکەکانی ئەسکەندەر کە (بارمینۆ)ی ناوبوبو ئەو داخوازییەی پاشای پارسی لاپەسەند بوو دەیگوت «ئەگەر ئەسکەندەر بوومایە ئەم داخوازییەم پەسەند دەکرد» ئەسکەندەریش ئەمەی بیستەوەو ووتی «منیش ئەگەر بارمینۆ بوومایە ئەم داخوازییەم پەسەند دەکرد».

پاش داگیرکردنی سور روویکردە ناوچەی غەزرە، ئەمیش لەپاش گەمارۆدانێکی دوو مانگی داگیرکرا، (میسر) یش بێ بەرهەڵستی خۆیدا بە دەستەوە. ماوەیەك لە میسر پشویدا بە لەشکرەکەی. لەوێ... کە تەمەنی لە ٢٤ ساڵیدا بوو تاجی فرعەونی کردە سەرو خۆی دانا بە خواوەند، ئینجا لە ئاسیاوە ملی گەڕانەوەی نا بەلاّم لەرێ تووشی جەنگێکی تر بوو لەگەڵ پارسەکاندا، ئەوە بوو لە کارزاری (ئەربێلا) ساڵی ٣٣١ پ ز توانی بە یەجگاری تێکیان شکێنێت. لەو دەمەی کە چووە نێو ناوچەکانی (بابل) ەوە هەواڵی کوشتنی داریۆشی سێهەم پاشای پارسی پێ‌گەیشت بە دەستی یەکێك لە ئەفسەرەکانی لەبەر ئەوەی کە خۆی نەئەدا بە دەستەوە . هەرچەندە ئەسکەندەریش جێ‌نشینی داریوشی سێهەمی کوشت بەلاّم ئەو کارەی پێ‌پەسەند نەبوو کە ئەفسەرەکەی سەرکێشانە پێ‌ی هەستا .

هەر لە ماوەی ٣ ساڵدا توانی سەرانسەری خۆرهەلاّتی ئێران بخاتە ژێر ڕکێفیەوە، ئینجا گوری دایە خۆی بەرەو ئاسیای ناوەڕاست لەوێش

چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا. تیپە سەربازیەکانی کە هەر لە جەنگ‌و پەلاماردانێکی بێ‌ووچاندا بوون، تەواویش ماندوو بوو بوون بەرە بەرە کەوتنە سەرکێشی‌و بێزاری لە ئەسکەندەر تا لە دوایی‌دا ناچارکرا کە بگەڕێتەوە.

ئەسکەندەر سال‌و قنچکێکی مابوو لە ژیانیدا، خۆی تەرخان کرد بۆ بەڕێوەبردن‌و ڕێکخستنی دەسەلات لەسەر بناغەی ڕۆشنبیری یۆنانی کە تاکە ڕۆشنبیریەکی بێ‌هاوتای ئەو سەردەمە بوو. ئەوانەی تر کە هەبوون ڕۆشنبیری بەربەری بوون، بەلام ئەسکەندەر کە راوێژی خۆی کردەوە هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە (ڕۆشنبیری پارسی)ش جی‌ی هێژاو ڕێزە هاتە سەر ئەو نیازەی کە یەکانگیریەك بپۆرێنێت لە نێوان هەردوکیاندا بە سەرکردایەتی خۆی.

کاتێکیش کە بە گرانەتا (سالی ٣٢٣ پ ز) مرد کەسێکی دانەنا لە دوای خۆی لەبەر ئەوە هەر بە مردنی بەرە بەرە ئیمپراتۆرێتەکە پەرت‌و بلاو بووەوە لەنێو یاوەرەکانیدا.

ئەسکەندەر لە مێژوودا بە گەورەترین مەردێکی درامی دادەنرێت، گرنگترین ئەنجامی داگیرکردنی ئەوە بوو کە زباری یۆنانی‌و زباری خۆرەلاتی لەیەك نزیك کردەوە. ئەمەیش بووە هۆی تەنینەوەی ڕۆشنبیری یۆنانی بە خێرایی لە ئێران، میاندواو، سوریاو میسردا.

هەر لە دەمی دەسەلاتیدا زیاتر لە ٢٠ شاری گەورە دروست کرا، گرنگترینیان شاری (ئەسکەندەریە) بوو لە میسر کە بووە یەکێك لە شارە پێشکەوتووەکانی جیهان، بووە مەلبەندیك لە مەلبەندە گەشاوەکانی زانست‌و ڕۆشنبیری‌ی.

٥



# ناپلیۆن پۆناپارت..

۱۷٦۹ ز - ۱۸۲۱ ز

Napoleon Ponaparte

ئیمپراتۆری فەرەنسی بەناوبانگ ناپۆلیۆن پۆناپارت ناسراو بە ژەنەراڵ ناپۆلیۆنی یەکەم... ساڵی ۱۷٦۹ز لە شاری (ئەجاکسیو)ی سەر بە لەندەی گۆرسیکا لەدایك بووە. بەر لەدایك بوونی بە ۱۵ مانگ فەرەنسایەکان هاتن گۆرسیکایان داگیر کرد. لەبەر ئەوە ناپۆلیۆن لە تێروانینێکی نەتەوەییەوە هەربە چاوێکی زۆردار و داگیرکەر سەیری فەرەنسایەکانی دەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا خۆی گەیاندە کۆلێژە سەربازی‌یەکانی فەرەنسا، ساڵی ۱۷۸۵ز لە تەمەنی ۱٦ ساڵیدا، کۆلێژی تەواوکردو بووە سوپا ئەفسەرێکی فەرەنسایی. دوای ئەوە بە

چوارساڵ شۆڕشی فەڕەنسا هەڵگیرسا، لە چەند ساڵێکرا دەوڵەتی نوێی فەرەنسا دووچاری چەند جەنگێك بوو لەگەڵ دەوڵەتە بێگانەکاندا .

ساڵی ١٧٩٣ز باشترین هەل‌و دەرفەتێکی ڕەساو بوو بۆ ناپۆلیۆن، لەو ساڵەدا کە فەرمانداری تۆپە قورسەکان بوو توانی ئازایەتی خۆی پیشابدات لە گەمارۆدانی شاری (تۆلۆن)ی فەڕەنسایی، هەر لەو کاتەیشدا ئیتر وازی لە گۆرسیکایەتی هێناو خۆی دانا بە هاوولاتیەکی فەڕەنسایی. لە پاداشتی ئەو سەرکەوتنەیدا پلەی سەربازی بەرزکرایەوە بۆ ژەنەراڵ، لە ساڵی ١٧٩٦ زدا دانرا بە سوپا سالاری لەشکری فەڕەنسایی لە ئیتالیا، لەوێش چەند سەرکەوتنێکی سەرنج ڕاکێشی بەدی هێنا .

لە ساڵانی ١٧٩٦ ز – ١٧٩٧ زدا کە گەڕایەوە بۆ پاریس گەلی فەڕەنسا زۆر بە گەرمی‌و ڕێزەوە پێشوازییان کردو بە پاڵەوانی نەتەوە ناویان دەبرد .

لە ساڵی ١٧٩٨ زدا سەرکردەیی هێرشێکی بۆ میسر کرد بەڵام ئەو هێرشە بە مەڕەی[1] برد، لە زەوییەوە هێرشەکەی تا ڕادەیەك سەرکەوتوو بوو بەڵام هیچ پێشڕەوییەکی نەتوانی بە دەست بێنێت بەرامبەر بە نێرویی دەریایی بەریتانیا بە سەرکردەی (نێلسن). لە ساڵی ١٧٩٩ زدا ناپۆلیۆن سوپاکەی لە میسر بەجێ هێشت‌و گەڕایەوە پاریس. سەیری کرد هێشتا فەڕەنساییەکان یادی سەرکەوتنەکانی ئیتالیای دەکەنەوە زیاتر لە تێکشاندنەکەی میسری. جا بە پشتیوانی گەل لە کۆدەتایەکدا هاوبەشی کردو ڕژێمێکی نوێ پێکهێنرا بە ناوی (ڕژێمی کونسولان)، ناپۆلیۆنیش کرا بە کۆنسوڵی یەکەم. لە سەرەتای

دەسەڵاتیدا بە هەموو توانایەوە گەشەی بە دەستووری تازەداو بەرایی[٢] گەلیشی لەسەر درا، ئەم خاسکاریە بنەرەتیانەیشی بۆیە دەکرد تاکو بە مێرخاسێکی دڵسۆز بۆ کۆمار ناو دەربکاتو ئەو نیازو ئارەزووانەیشی بە ئاسانی لەژێرەوە بهێنیتە دی کە بریتی بوولەسەپاندنی دیکتاتۆرییەکی سەربازیانە.

بەرزبوونەوەی ناپۆلیۆن لە دەسەڵاتدا ئەوەندە خێرا بوو کە باوەڕنەدەکرا.. لە ئابی ١٧٩٣ زدا پێش گەمارۆدانی تۆلۆن بە ئەفسەرێکی بچوك ناسرابوو جگە لەوەیش کە فەرەنسایی نەبوو کەچی بە شەش ساڵ کەمتر لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا بووە فەرمانڕانی سەرانسەری فەرەنسا. لە ماوەی دەسەڵاتیدا دەستی خستە ناو ڕژێمی کارگێڕیو قانونی فەرەنساوە و هەندێك چاکاری تێدا کرد، ئینجا کەوتە خاسکاری دەزگاکانی داراییو دادوەری، بانکی دروست کردو زانکۆی فەرەنسای دامەزراند، وای لە کارگێڕی کرد کە دەسەڵاتێکی کارکۆیی (سێنترالی) هەبێت، هەر چەندە ئەم گۆرانکاریانە جێی خۆی گرت لە فەرەنسادا بەلام ئەوەندە برەوی نەبوو لە وولاتانی تری جیهاندا. تەنها خاسکارییەك کە زۆر گرنگو کاریگەر بوو بۆ دەرەوەی فەرەنسا بریتی بوو لە (قانونی ناپۆلیۆن) کە نموونەی ڕەوشتو رابەرزی شۆڕشی فەرەنسایی تێدا دەبینرا. بۆ نموونە.... ئیتر ئەوە نەما هەر کەسێك مافێکی جیاو تایبەتی خۆی هەبێت، گشت کەس بەرامبەر بە قانون یەکسانە.

ناپۆلیۆن بەرەبەرە سیاسەی خۆی پتەو دەکرد، خۆیشی وەها پیشان دەدا کە سوورە لەسەر پاراستنی شۆڕشی فەرەنسایی، لەگەڵ ئەوەیشدا ساڵی ١٨٠٤ز خۆی ناونا ئیمپراتۆر فەرەنسا. سێ برایشی

کردە پاشای وولاتەکانی تر لە ئەوروپادا .

ئەم کردەوەو ڕەفتارانەی رکوکینەی زۆربەی کۆمار خوازەکانی فەرەنسای هەلسانی، کەوتنە گومانو ترسی ئەوەی کە ناپۆلیۆن لە باوەرو ڕێڕەوی شۆرشی فەرەنسایی لایداوە، ئەو مەترسییەیش زیاتر لە ئەنجامی جەنگەکانی دەرەوەیدا دەرکەوت کە بووە مایەی نەوینی .

لە سالی ۱۸۰۲ زدا پەیمانی ئاشتی لەگەل ئینگلتەرەدا بەست لە (ئەمیانز)، ئەم پەیماننامەیە ووچانو پشوویەکی دا بە فەرەنسا پاش ئەو جەنگە دەسالەی کە پێوەی گرفتار بوو بوو. ئەوەندەی نەبرد لە سالی ئایندەدا پەیماننامەکەی شکاندو جەنگی بەرپا کردەوە، ئەمجارە نەك تەنها هەر لەگەل ئینگلتەرەدا بەلکو لەگەل دۆستانی ئینگلتەرەیشدا .

هەر چەندە سوپاکانی فەرەنسا لە زەوییەوە هەمیشە سەرکەوتوو بوون بەلام نیرۆی دەریایی ئینگلتەرە زۆر بە تواناتر بوو. لەبەر ئەوە لە سالی ۱۸۰۵ زدا نێروی دەریایی فەرەنسا شکستی هێنا بەرامبەر ئینگلتەرە لە کارزاری (تەرفەلگەر Tarfalgoer)، پاش شەش هەفتەیش سوپاکانی سەرکەوتن بەسەر سوپاکانی نەمساو روسیا لە کارزاری (ئۆسترلتز) بەلام بەو سەرکەوتنانەی وەنەبێت توانیبێتی زامی ئەو جەنگە دۆراوەی سارێژ بکات کە لەگەل ئینگلتەرەدا بەرپای کردبوو .

لە سالی ۱۸۰۸ زدا ناپۆلیۆن فەرەنسای گیرۆدە کرد بە جەنگێکی دوورو درێژی بێ هوودە لە لەندەی (ئیبریە) کە سوپاکانی فەرەنسایی تیایدا کەوتنە زۆنکاوەوە ئیتر هیچ توانای پێشرەوییان نەما. لاساریو

هەڵەی گەورەتری ئەوەبوو کە هێرشی بردە سەرڕووسیا. لە ساڵی ۱۸۰۷ز دا دیداری قەیسەری رووسیای کردو سوێندی دۆستایەتییان مۆرکرد لە پەیماننامەی (تلست) دا بەلام لەمەیشدا ئەوەندە خۆی ڕانەگرت ئەوەبوو لە حوزەیرانی ۱۸۰۷ز **لەشکرێکی باربۆکردو بەرەو ڕووسیای بەڕێ خست** ئەنجامەکانیشی دیار بوو،هێزە ڕووسیەکان خۆیان دوورە پەرێز ڕاگرت لەو جەنگە سەختەدا، ناپۆلیۆنیش بە خێرایی بەرەو پێشەوە دەهات، لە مانگی ئەیلولدا توانی مۆسکۆ داگیر بکات بەلام رووسەکان بەر لە هاتنی ناپۆلیۆن گریان بەردایە شارەکە، هەرچی تێدابوو سووتا. پاش چاوەڕوانییەکی پێنج هەفتەیی لە مۆسکۆدا بە ئومێدی ئەوەیرووسەکان داوای ئاشتیو پەیمان بکەن. ئەو ئومێدە نەهاتە دی، بێهودە گەڕایەوە بەلام پاش چی!!! پاش ئەوەی کە کار لە کار ترازا بوو..!! سوپاکانی رووس بە ئازوقەیەکی زۆرەوە لەو سەرماو سۆڵە سەختەدا بەرەنگاری سوپا ماندووکەی فەرەنسایی بوونو بە ئاسانی توانییان ڕایانشکێنن بە ڕادەیەك کە تەنها ۱۰٪ لە سوپاکەی بۆ دەرباز بوو. دەوڵەتە ئەوروپاییەکان خواخوای ئەمەیان بووو بۆ دەرفەتێکی وا دەگەڕان کە خۆیان رزگار بکەن لەو جەورو ستەمەی ناپۆلیۆن. ئەو دەرفەتەیش لەم کاتەدا هاتە پێشەوە،

بەجارێ هەموویان دەنگیان کردە یەك و هێزەکانیان کردەیەك دژ بە ناپۆلیۆن، هەر دوو هێزە دژوارە بەرەنگاری یەك بوون ساڵی ۱۸۱۳ز لە کارزاری لایبرگ، ئەنجامەکەی بە ڕاشکاندی ناپۆلیۆن کۆتایی هات، هەر لە ساڵی دوایشدا ناپۆلیۆنیان لە کارخستو دووریانخستەوە بۆ لەندەی (ئەلبا) نزیك بە ڕۆخەکانی ئیتالیا .

بەلام سالی ١٨١٥ز هەڵاتو گەڕایەوە فەرەنسا، زۆر بە گەرمییەوە پێشوازی کرا لە لایەن فەرەنساییەکانەوە، هەمان دەسەڵاتی جارانی وەرگرتەوە. لە پاش سەد ڕۆژ بەسەر گەڕانەوەیدا دەوڵەتە ئەوروپاییەکان جارێکی تر بەرەنگاری بوونەوە لە کارزاری (واترلۆ)دا ئەمجارەیان ئیتر بەتەواوی ڕاشکا، ئینگلیزەکان گرتیانو خستیانە زیندانەوە لە لەندەی (سانت هێلینا) کە دەکەوێتە باشووری ئۆقیانوسی ئەتڵەسییەوە. تا دوازیانی (سالی ١٨١٢ز) لەوێ مایەوە و بە نەخۆشی کانسەر مرد .

---

(١) مەرە: کارەسات.

(٢) بەرابی: فتوا.



# ئەدۆلف هێتلەر...

١٨٨٩ ز - ١٩٤٥ ز

Adolf Hitler

کەسێك نیە ناوی هێتلەری نەبیستبێ... ئەو کەسەی کە بووە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگێکی زۆر سەختو بە کوشتدانی نزیکەی ٣٥ ملیۆن کەس. هەرچەندە هیچ کەسێك ئارەزووی ئەوە ناکاتو رازیش نابێت بەوەی کە مەردێکی وەها بخرێتە ریزی ئەو سەد کەسەوە. بەڵام بەهەر چۆن بێت... چەنو چۆن لەوە ناکرێت کە کارێکی زۆر ناهەموارو کاریگەری گێڕاوەلە ژیانی ژمارەیەکی یەجگار زۆر لە مەردومی ئەم جیهانەدا.

ئەدۆڵف هیتلەر ساڵی ١٨٨٩ ز لە شاری (برۆنو)ی سەر بە نەمسا لەدایك بووە. لە پیشەی رۆژانەیدا رۆن هەنوویەکی ناچوست بووە. بەڵام لە هەرەتی لاویدا بووە نیشتمان پەروەرێکی ئەڵمانی چاپووك. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بووە سەرباز لە سوپای ئەڵمانیادا هەتاوەکو زامداریش بوو و مەدالیای ئازایەتی‌و دلێری پی‌بەخشرا.

بەزین‌و روخاندنی ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمدا زۆر کاری کردە سەر ناخی دەروونی، ئەمە پاڵی‌پێوەنا کە خۆی بخاتە ئامێزی پارتێکی سیاسی راسترەوی بچوکەوە لە میونیخ‌دا، ئەم پارتە لە دواییدا ناوی خۆی گۆری بە پارتی نیشتمانی سۆشیالیستی کرێکارانی ئەڵمانی (واتە نازی Nazy). هەر لە ماوەی دوو ساڵدا بووە پێشەوای (فوهەر) ئەم پارتە.

ئەم پارتە لە ژێر دەسەڵاتی هێتلەردا بەرە بەرە گەشەی کردو هێزو توانای پەیدا کرد. لە ساڵی ١٩٢٣ زدا کۆدەتایەکی ساز کرد لە دژی میری بەڵام سەرکوت کرا و هێتلەریش خرایە بەندیخانەوە. بەڵام پاش ساڵێکی لە بەندیخانە ئازاد کرا. لە ساڵی ١٩٢٨ زدا پارتی نازی بە زۆربوونی ئەندامەکانی چالاکی خۆی خستەگەرو دەستی خستە ناو نەخشاندنی سیاسەتی ئەڵمانیاوە. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣٣ زدا هێتلەر بووە راوێژباری ئەڵمانیا، لەو ماوەیەدا توانی دەسەڵاتی تەواوی خۆی داکوتێت‌و دیکتاتۆرانە فەرمانرانی بکات، .دام‌و دەزگاکانی دەوڵەتی خستەکار بۆ سەرکوت کردنی ئەوانەی لە فەرمانی دەردەچوون. لەو ساڵانەی پێش جەنگ چەند کارێکی بە ئەنجام هێنا وەك کەم کردنەوەی بێکاری‌و بوژانەوەی ئابووری لە وولاتدا. ئەمانەو چەند

ـەسکاریيەکی تری... بووە هۆی ئەوەی کە خوشەویستو بەرێز بێت ـەناو گەلدا.

ئینجا کەوتە ئەوەی ئەڵەمانیا سەربازانە گورجو باربۆ بکاتو هێزێکی پۆڵایینو دلێری لیٚ پێکبهێنێت بۆ جەنگ «جەنگی جیهانی ـووەم». لەو دەمەیشدا ئینگلتەرەو فەرەنسا کەوتبونە گێروگرفتی ـبوورییانەوە بەرادەیەك کە نەیاندەپەرژایە سەر ئەوەی ئاورێك لە جموجۆڵی هێتلەر بدەنەوەو بزانن چی دەکات!!... سەرنج لەو پەیمانامەی ڤەرسای بدەنەوە کە هێتلەر ئاستنی کربووو پووچاندبوویەوە. بێ ئاگا بوون لە ڕێکخستنەوەی لەشکری ئەڵەمانیا بە شێوەیەکی نویٚ، تەنانەت بێدەنگ بوون لەو هێرشەی هێتلەر کە لە ئازاری ۱۹۳٦ زدا کردیە سەر زەوییەکانی (ڕاین)و هەروەها لە هەڵمەت بردنی لە ساڵی ۱۹۳۸ زدا بۆ سەر نەمساو بەستنی بە ئەڵەمانیاوە، جاریٚ خۆ چیکۆسلۆڤاکیای هەمیشە لەبەردەستا بوو و کردبوویە داردەستێك هەرکاتێك نیازی ئاشتی ببوایە. هەر کارێکی بوویستایە دەکەوتە هەڕەشەو گوڕەشە گەر بەرەنگارییەکی بەرامبەر ئەو ئارەزووو تەماعکارییانەی ببینیایە.

لە هەڵوێستێکدا ئینگلتەرەو فەرەنسا بڕیاریاندا بەرگری لە پۆڵەندە ـکەن کە ئەمەیش لە هەنگاوی دووەمی پەلاماردانەکەی هێتلەردا بوو. ـەسەرێکەوە بۆ پاراستنی خۆی پەیمانی دۆستایەتی بەست لەگەڵ (ستالین) پیشەوای ڕووسیا لە ئابی ۱۹۳٦زدا، لە سەرێکی تریشەوە پاش ۹ ڕۆژ بەسەر ئەو پەیمانەدا شاڵاوی بردەسەر پۆڵەندە، هەرچەندە ئینگلتەرەو فەرەنسا جەنگیان لە دژی هەڵگیرساند بەڵام نەیانتوانی

بەرگەی ئەو هێزەی هێتلەر بگرن لەبەرئەوە هەروا بە زووبی ڕاشکێنران.

ساڵی ١٩٤٠ ز بە چەرخی زێڕینی هێتلەر دادەنرێت، سوپاکانی لە مانگی نیساندا ووڵاتی دانیمارك‌و نەرویجیان گرت، لە ئاباری هەر ئەو ساڵەدا هۆڵەندەو بەلچیکاو لۆکسمبۆرگی خستە ژێر دەسەڵاتیەوە. لەحوزەیراندا فەرەنسای ڕاشکاند، بەڵام لە دواییەکانی ئەو ساڵەد بەریتانیا توانی بەرامبەر بەو شاڵاوە ئاسمانیانەی هێتلەر خۆی ڕابگرێت. لەبەرئەوە ئیتر هێتلەر فریانەکەوت هیچ شتێك لە بەریتانیا بپچرێت. لە نیسانی ١٩٤١ زدا یۆنان‌و یۆگۆسلاڤیای داگیرکرد، لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا پەیمانەکەی کە لەگەڵ ستالین‌دا هەیبوو هەڵیوەشاندەوەو هێرشی بردە سەر ئەویش. هەرچەندە بەشێکی فراوانی لە زەوییەکانی سۆڤیەتی داگیرکرد بەڵام نەیتوانی زاڵ بێت بەسەر سوپاکانیاندا پێش هاتنی وەرزی زستان. لە ولایشەوە لەگەڵ ئینگلتەرەو فەرەنسادا هەر لە جەنگدا بوو.

پاش چەند ڕۆژێك ژاپۆنیەکان هێرشیان بردە سەر بنکەی (بیرل هاربر)ی ووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، هێتلەریش لە کانوونی دووەمی ١٩٤١ زدا دەسبەجێ جەنگی هەڵگیرساند لە دژی ووڵاتە یەکگرتووەکان. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٢ زدا ئەڵەمانیا گەورەترین بەشی ئەوروپاو ئەفەریقای خستە ژێر دەسەڵاتەوە.

شەوەزەنگی تاریکایی جەنگ لە دوانیوەی ساڵی ١٩٤٢ ز وە دەستی پێکرد. بەرەبەرە شیرازەی جەنگ تێکچوو. پاش ئەوەی جەنگی عەلەمەینی لە باکووری ئەفەریقا دۆڕاند، لە کارزاری

ستالینگرادی یەکیەتی سۆڤیەتدا تەواو شکا، ئابەم چەشنە ئەستێرەی گەشی هێتلەر بەرەبەرە بەرەو کزبوون دەچوو. هەرچەندە ڕوخاندنی ئەڵەمانیا لە نزیکیدا بوو کەچی هێشتا هێتلەر هەر لە فەرمان دەرکردندا بوو، تاوەکو دوو ساڵیش پاش جەنگی ستالینگراد هەردەجەنگا، بەڵام کۆتایی بە ڕووخاندنی بە ئاشکرا چاوەروان دەکرا. ئەوەبوو لە بەهاری ١٩٤٥ زدا تەواو دارماو بە نائومێدی لە ٣ی مانگی نیساندا خۆی کوشت، پاش حەوت ڕۆژیش ئەڵەمانیا خۆیدا بە دەستەوە.



# وليەم شەكسپير...

١٥٦٤ ز - ١٦١٦ ز

William Shakespeare

بوێژو نووسەری شانۆگەری ئینگلیزی ولیەم شەکسپیر... ساڵی ١٥٦٤ ز لە شاری (ستراتفۆد ئۆنافۆن) ی سەر بە ئینگلتەرە لەدایك بووە، هەرچەندە نەچووبووە زانکۆ بەڵام رۆشنبیرییەکی فراوانو پتەوی هەبوو. لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا ئافرەتێکی ٢٦ ساڵەی هێناو پێش تەمەنی ٢١ ساڵەیشی ٣ منداڵیان بوو.

شەکسپیر پاش ٣ ساڵ چووە لەندەنو نزیکەی ٢٠ ساڵ لەوێمایەوە و ژنەکەیشی بە تەنها لە ستراتفۆرد. ستارەی بەختی لە تەمەنی ٣٠ ساڵی بەولاوە درەوشایەوە، لەو ماوەیەدا سوودێکی

هونەری و ئابووری چاکی پەیداکرد و بووە کەڵەنووسەرێکی پێشەنگ لە شانۆگەریدا. لەو دەساڵەی دواییندا نووسینە نەمرەکانی بڵاوبووەوەو کەوتە دەستی خوێنەرانەوە، ئەوکارنامەبەرزانەیشی کە بە ئەنجامی دان بریتیی بوون لە (یۆلیۆس قەیسەر، هاملێت، ئۆتێللۆ، ماکبێث، شالێر).

شەکسپیر لە دوا ساڵەکانی چلْ ساڵیدا گەڕایەوە بۆ ستراتفۆرد و هەر لەوێیش ساڵی ١٦١٦ ز کۆچی دوایی کرد، پاش ئەوەی تەمەنێکی ٥٢ ساڵەی لە ژیانیدا گوزەران کرد بە بێ ئەوەی هیچ منداڵێکی بۆ بمێنێتەوە.

ئەو شاکارانەی کە تائێستا بۆمان ماینەتەوە نزیکەی ٣٨ شانۆگەرییە لەگەڵ چەند کورتە شانۆگەرییەك بە هاوبەشی هەندێك نووسەری تر. جگە لە کۆمەڵێك لە ١٥٤ سۆناتا (هەر سۆناتایەك بریتیە لە ١٤ چامە دێرێك) و سێ... چوار چامەی تر.

هەر چەندە ناوی لە سەرەتای ئەم لیستەیەدا نیە، ئەمەیش وەنەبێت هیچ لە ئاستو گرنگی کەم بکاتەوە بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هونەرمەندانو بویژان ئەوەندە کارناکەنە سەر مێژووی مەردوم، چونکە پێشەوایانی ئایینیو زانایانو سیاسەمەندانو دۆزینگەران، فەیلەسوفانو داهێنەران بە زۆری کاردەکەنە گۆڕانکاری ژیانی مەردوم لە بوارە جیاوازەکاندا.

بۆ نموونە پێشکەوتنی زانستی کارێکی دیارو گرنگی لێ‌بەدی دەکرێت لە کێشە سیاسیەکانو ئابوورییەکاندا تەنانەت بۆ سەر باوەڕە ئاینیەکانو هەڵویستە فەلسەفیەکانو گۆڕانکاریە هونەرەییەکانیش.

ئەگەر لەنێو ئەمانەدا رابیری خۆمان بکەینەوە لەوە دەکات کە شەکسپیر بژاردەو پێشەنگ بەکاریگەرتر بووبێت لەنێو ئەو بوێژو نووسەرانەدا.

رەنگبێت کەم کەس ئێستا کە (شوسەر)، (ڤراجیل)و هەتاوەکو هۆمیرۆسیش بخوێنێتەوە بەڵام زۆربەی کەس ئەگەر سەرنجیان بدەین حەز بە شانۆگەرییەکانی شەکسپیر دەکەن و هەرچۆنێك بێت خۆیان بۆ ئامادە دەکەن.

بەگشتی دەتوانین بڵێین شانۆگەرییەکانی بۆ نزیکەی چوار سەدەیەك بووبوونە خۆشنوودیو خرۆشییەك لەنێو زۆربەی خوێنەرانو بینەراندا. هەرلەوانەیشە کارنامەکانی تری هەمان چێژو پێزی لێوەربگیرێت بۆ چەندین سەدەیەکی تر.

هەرچەندە نووسراوەکانی بە زمانی ئینگلیزین بەڵام لەگشت جیهاند دەنگی داوەتەوەو زۆربەی کارنامەکانیشی بە شێوەیەکی فراوان گۆڕاون بۆ زمانەکانی تر، ئەو شانۆگەرییانەیشی زۆر بە پەرۆشەوە دەخوێنرێتەوەو لە زۆر وڵاتاندا پێشکەش دەکرێن.

○



# ئادم سمیث

١٧٢٣ ز – ١٧٩٠ ز

**Adam Smith**

ئادەم سمیث... ئەو مەردە پێشەنگە لە بواری بیردۆزە ئابووریەکاندا ساڵی ١٧٢٣ ز لەشاری (کیرکاڵدی) سەر بە سکۆتڵەندە لە دایك بووە. لە تەمەنی لاوێتیدا لە زانکۆکانی ئۆکسفۆردو کامبرج خوێندویەتی. ساڵی ١٧٥١ ز تا ١٧٦٤ ز بۆتە ئوستادی فەلسەفە لە زانکۆی گلاسکۆ. لەو دەمەی‌را یەکەم پەڕاوی بڵاوکردەوە بە ناوی (بیردۆزەی ویژدانی ڕەوشت). بەم پەڕاوەی ناوبانگی پەیداکرد لە نێو کۆمەڵگای زانستدا، بەڵام ئەوەی کە زیاتر گرنگ‌و کاریگەر بوو، وە ناوبانگی هەمیشەیی پێ پەیداکرد پەڕاوە مەزنەکەی بوو بە ناوی

(پرسین دەربارەی سروشت‌و هۆیەکانی سامانی گەل)، سالّی ١٧٧٦ ز بلّاوبووەوەو برەوێکی بێ‌هاوتای وەدەست هێنا.

سمیث تا دوازیانی زۆر بەهێزاو بەرێزانە گوزەرانی دەکردو هەر بە رەبەنیش مایەوە تا سالّی ١٧٩٠ ز لە زادگاکەی خۆیدا مرد.

ئادەم سمیث وەنەبێت یەکەم کەسێك بووبێت بیرو هۆشی تەرخان کردبێت بۆ لێکۆڵینەوەی بیردۆزە ئابووریەکان بەڵام بە یەکەمین زانایەك دادەنرێت لە سازاندنی جۆرە بیردۆزەیەکی وا فراوان لە ئابووریدا بە چەشنێك کە ببێتە بناغەی پێشکەوتن بۆ دوارۆژی ئابووزانیی، لەبەر ئەوە دەشێت گەر بلێین پەراوی (سامانی گەل) بزەوتی لێکولّینەوەی نوێ‌بوو لە ئابووری رامیاریدا. جا یەکێ لەو دەسکەوتە مەزنانەی کە خۆی لەم پەراوەیدا دەنوێنێت ئەوەیە کە زۆر رشتەو بابەتی گومانگراوی کۆنی تیادا روون کراوەتەوە.

سمیث هەمیشە لە دژی بیردۆزەی بازرگانیی کۆن دەوەستا کە بریتی بوو لە بایەخ پێدان‌و دەست بەسەراگرتنی دەوڵەت بەسەر گەنجێکی[1] زۆر لە دارشتەی زێردا. هەروەها بەربەستی ئەو تێروانینانەی دەکرد کە زەوی بە (مایە)ی کانێکی سەرەکی دادەنێن. لە بری ئەمانە زۆر گرنگی دەدا بە (کار)و زۆر کردنی بەرهەم بە هۆی دابەشکردنی کارەوە. بۆ ئەم مەبەستەی زۆر شالّاوی دەبردە سەر دارودەستەی ئەو دەوڵەتە کۆنەپەرستانەی کە بووبوونە کۆسپ‌و ئاستەنگ لە رێی فراوانبوونی پێشەزییدا. ئەو بیرە سەرەکیانەی سمیث کە لە (سامانی گەل) دا یەکالّای دەکاتەوە دەڵێت: بازاری ئازاد هەر لە خۆیدا کارێکی میکانیکی رێکە واتە هەر لە خۆیەوە (ئۆتۆماتیکانە) دەبێتە مەڵبەندێك بۆ بەرهەم هێنانی برو جۆری

پڕتاڵ[٢] و بابەتی گەوارو داخواز... وە بەرەواج لەنێو گەلدا. بۆ نموونە: بابەتێك لەو بەرهەمە خواستراوو برەوانە کەم دەکات... بێگومان لەم بارەدا کارێکی سروشتی دەبێت گەر نرخەکەی بەرزبێتەوە. ئەم نرخ بەرزبوونەوەیە سوودو قازانجێکی بەجگار زۆر دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کەسانەی ئەم جۆرە شتومەکانە دەهێننە بەرهەم. جا بە هۆی ئەم قازانجە زۆرەوەرا کەسانی تریش دێنە پێشەوەو دەکەونە بەرهەم هێنانی ئەم جۆرە شتومەکە. زۆرکردنی بەرهەمەکەیش لە نرخی گرانی ئەو بابەتە دەهێنێتە خوارەوە. لەسەرو ئەمانەیشەوە فرەبابەت و خۆبرکێ ی[٣] فرەجۆر لە نێوان کارمەندانو سازمەنداندا لە نرخی بابەتەکە کەم دەکاتەوەو دەهێنێتەوە سەر نرخی سروشتی. هیچ کەسێك دەسپێشکەری لە پڕکردنەوەی ئەم کەمو کوڕییانە ناکات لە نێو گەلدا کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا هەر لەخۆیەوە چارەسەر دەکرێت و ڕەوتی سروشتی خۆیان دەگرنەوە.

ئەگەر بە گوێرەی ووتەکانی سمیث بێت ئەوا لەم گوزەرو بوارەدا: (هەر یەکێك لە بازاردا دەیەوێت قازانجی دەسکەوێت بێ ئەوەی بزانێت جڵەوی ئەم کارە بە دەست کێوەیە... کێ هانی ئەدات و پاڵهێزێتی... کێ دەیبات بەرێوە بۆ گەیشتن بە نیازو ئامانجی بە بێ ئەوەی ئەو نیازەی مەبەست بوو بێت. خۆ هەڵپەی بەرژەوەندو خواستە تایبەتییەکانی ئەوەندەی تر داخوازی کۆمەڵ دەچەسپێنێت، بگرە بەشێوەیەکی زیاتریش کاریگەرتر دەبێت پتر لەوەی کە خۆی مەبەستیەتی و دەیەوێت).

ئەم تێڕوانینانەی ئادەم گەر لە جێی خۆیدا بێت یانە... یاخود کاریگەر بوو بێت یانە بۆسەر ئەو بیردۆزە ئابوورییانەی کە لە دوای

خۆی دەردەکەوتن... بەو کێشە سەرەکیانەی کە خستبوونیە روو تەواو کاری کرد بووە سەر رێبازی یاسادانان و رامیاری وولاتەکان.

ئەم پەراوەی (سامانی گەل) کە زۆر بە بلیمەت و لێزانانە نووسیویەتەوە چەنێك رەوان و بەپێزە ئەوەندەیش بیرەکانی کاریگەر بوون بۆ بێدار کردنی دەوڵەتان. ووریایان دەکاتەوە کە خۆیان نەدەن لە قەرەی بازرگانی و کار، هەروەهایش پێویستە باج و میرانە کەم بکەنەوە.

ئەم بیرو رایانەی لە سەرانسەری سەدەی نۆزدەمدا بە گشتی کاریکردبووە سەر رێبازی رژێمی دەوڵەتان، هەتاکو ئێستایش تا رادەیەك هەست بەو کاریگەیە دەکرێت.

بەڵام هەرچۆنێك بێت... زوربەی بیردۆزە ئابووریەکان و تێروانینەکانی کۆن بووە، ئێستا زۆر لەو بیردۆزە نوێیانە جێیان گرتۆتەوە. جا لەبەر ئەوە گرنگی ئادەم سمێث تەنها لەوەدا خۆی دەنوێنێت کە یەکەم دامەزرێنەری بیردۆزە ئابووریەکان بووە، هەر ئەوبوو کە ئاوری لەو بیردۆزانە دایەوەو خستیە ئاستی لێکوڵینەوەو کارپێکردن لە ژیانی رۆژانەی مەردومدا.

---

(١) گەنج: خەزنە

(٢) پرتاڵ: شتومەك

(٣) خۆبڕکی: منافسە



# تۆماس
# ئەدیسۆن...

١٨٤٧ ز - ١٩٣١ ز

**Thomas Edison**

تۆماس ئەلفا ئەدیسۆنی بلیمەتو داهێنەرو فرەزان... سالّی ١٨٤٧ ز لەشاری (میلان ئۆهایۆ)ی سەر بە وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەدایك بووە. لەپاش سێ مانگ بەسەر یاددانو خوێندنی دا بۆ مامۆستاکەی دەرکەوت کە کورێکی دەبەنگو چەپلۆسەو هیچ بۆ خوێندن ناشێت.

لە تەمەنی ٢١ سالّیدا یەکەمین داهێنانی وەدەرکەوت کە بریتی بوو لە ئامێرێکی تۆمار بۆ ناونووسی ئەو کەسانەی بەشدارییان دەکرد لە هەلّبژاردنی گشتی لە وولاّتە یەکگرتووکاندا، بەلاّم ئەم داهێنراوەی

نەفرۆشرا لەبەر ئەوە دەستی دایە ئەو داهێنانانەی کە چاوەڕوان دەکران فرۆتیان یەکسەر هەبێت لە بازاردا. پاش ماوەیەکی کەم دەزگایەکی تەلەگرافی داهێنا بۆ نووسینی نرخەکانی بۆرسە، ئەمەی بە نزیکەی ٤٠ هەزار دۆلار فرۆشت کە پارەیەکی یەجگار زۆری ئەو دەمە بوو، دوابەدوای ئەوە چەند داهێنراوێکی تری هێنایە کایەوە. ڕەنگبێت فۆنوگراف (Phonograph تۆماری دەنگ) بە والآترین داهێنراوی ئەدیسۆن دابنرێت، بەلآم ئەو داهێنراوە گرنگەی بۆ جیهان... گلۆپی کارەبا بوو کە لە ساڵی ١٨٧٩ زدا دایهێنا. هەر چەند ئەدیسۆن بە داهێنەری یەکەم دانانرێت لە ڕووناکی جادەکاندا بەلآم بلیمەتیەکەی لەوەدا دەردەکەوێت کە کارامانە توانی بیخاتە گەڕ نەك، تەنها هەر لە ڕووناکی جادەکاندا بەڵکو وای کرد کە بگاتە هەموو ماڵێکیش.

لە ساڵی ١٨٨٢ زدا کۆمپانیاکەی کەوتە بەرهەم هێنانی کارەبای ماڵان لە شاری نیۆیۆرك، پاشان زۆر بە خێرایی سەرانسەر جیهانی گرتەوە.

بە دامەزراندنی کۆمپانیاکەی لە پەخشی کارەبایی‌و گەیاندنی تەزووی بە هەموو ماڵێکدا... بۆمان دەردەکەوێت کە ئەدیسۆن زەمینەیەکی پیشەسازی گەورەی نوێی دانا بە ڕادەیەك کە هەموو ئامرازە کارەباییەکانی ناوماڵ بگرێتەوە، ئیتر هەر لە تەلەفزیونەوە بیگرە تا ئامێری بەرگ شتنی کارەبایی، هەروەها هاریکاری کردنی لە پەرەپێدانی کامێرای سینەمایی‌و ئەو ئامرازانەی کە نیگار جێگیر دەکەن لەسەر پەردە، هەروەها دەستی خستە چاکردنی تەلەفون‌و تەلەگراف‌و ئامێری چاپ‌و ئامێری کۆپی‌و ئامێری قسەکردن (بڵندگۆ)و پاتری ناوەڕۆپر، جگە لە چەندین داهێنراوی تر کە دەگەنە نزیکەی هەزار

داهێنراوی جۆراوجۆر... ئەم ژمارەیەیش لەوانەیە زۆر کەس بخاتە گومانەوە!!!

یەکێ لەو هۆیە هاندەرانەی کە ئەدیسۆنی کردە مەردێکی فرەزان و بلیمەت دامەزراندنی ئەو مەڵبەندە بوو لە (مینۆل پارك) لە شاری نیوجەرسی کە چەندین شاگردو کارزان کاریان تیادا دەکرد. ئەم مەڵبەندە بووە پێشەنگێکی بێ هاوتا لە تۆژینەوەو لێکوڵینەوەی گرنگ. هەر لە دواییشدا دەزگا پیشەسازییە گەورەکانی تری لێوەی ڕا دامەزرا .

ئەدیسۆن نەك تەنهاهەر داهێنەربوو بەڵکو وەك کارمەندێکیش لە زۆر کۆمپانیا پیشەسازییەکاندا کاری دەکرد. چەندین کۆمپانیای پیشەسازی تری دامەزراند کە لە دواییدا بە کۆمپانیای گشتی کارەبا ناودەبرا، لە ساڵی ١٨٨٢ زدا لە دۆزینەوەی دیاردەیەکی کارەباییدا هاریکاری کرد کە ئەویش گەیاندنی ووزەی کارەبایە لە نێوان دوو سیمی نەبەستراو بە یەکەوە لە بۆشاییدا، بەم دیاردەیەیش دەووترا دیاردەی ئەدیسۆن Edison Phenomena ئەم کارەمەزنەی بووە هۆی پەرەپێدانی لوولەی بەتاڵ لە هەوا و دامەزراندنی پیشەسازی ئەلەکترۆنیك .

ئەدیسۆنی مەزن گوێ گران بوو، بەڵام فرەزانی و کارە مەزنەکانی جێ ی ئەو نەنگییەی گرتبووەوە. دووجار لە ژیانیدا ژنی هێناوە، لە هەر ژنێکی سێ منداڵی بوو، بەڵام ژنی یەکەمی بە جوانەمەرگی سەرینایەوە، خۆیشی ساڵی ١٩٣١ ز لە (وێست ئۆرەنج) سەر بە نیوجەرسی کۆچی دوایی کرد. ئەدیسۆن بە خاوەن بەهرەیەکی بێچون و مەزنترین داهێنەر دادەنرێت کە لە سەر ئەم زەویە ژیابێت .



# ئەنتۆنی ڤان لیڤۆن هوك

١٦٣٢ ز – ١٧٢٣ ز

Antony Van Leeuwen Hoek

ئەنتۆنی ڤان لیڤۆن هۆك... ئەو کەسە مەزنە بوو کە میکرۆبی دۆزییەوە. ساڵی ١٦٣٢ ز لەشاری (دلفت)ی سەر بە وولاتی هۆڵەندە لەدایك بووە. لە نێو بنەماڵەیەکی مامناوەندیدا گوزەرانی کردووە. زۆربەی ژیانیشی هەروەك فەرمانبەرێکی بچوك لە میرییدا بردۆتە سەر.

هەر لە منداڵییەوە زۆر سەودای ووردبینکاریی هەبوو بە میکرۆسکۆپ، سەردەمێك بەر لەدایك بوونی ئاوێتە میکرۆسکۆپ Compound Microscope داهێنرابوو وەهاتبووە کایەوە بەڵام ئەم هەر بە تەنها توانی چەندین هاوێنەوا Lens کورتیان هەبێت، لەپاش ماوەیەکی

تر هەستا بە دروستکردنی بەهێزترین میکرۆسپێکی ئەو سەردەمە. یەکێ لەو هاوێنانەی کە دروستی کردبوو تا ئێستایش ماوە، هێزی گەورەکردنی دەگاتە (٧٠) جار، بەڵگەیش هەیە کە گوایە هاوێنەی لەوە بەهێزتری دروستکردووە.

لیڤۆن هوك مەردێکی وورد بین سەرنج ڕەوان... بە ئارام و زرنگ بووە، خاوەن بینیارێکی تیژبووە، زۆر حەزی بە زانین کردووە. هەر بەم هاوێنە دەسکردانەی چەندین شتی جیاوازی دەبینی هەر لە مووی مرۆڤەوە تاکو تنۆکی بارانو مێشو مەگەزی زۆر بچوك، ڕیتاڵی ماسولکەو ئەتەمی پێستو چەندین نموونەی تر، هەر چییەکیشی کە دەبینی سەرنجی گرنگی خۆی بە نیگارەوە لەسەر دەنووسی.

لە سەرەتای ١٦٧٣ز وە پەیوەندی کرد بە چفاتی شاهانەی ئینگلتەرەوە کە تاکە چفاتێکی زانستی ئەو سەرەتاییانەی هەبووە، تەنها هەر هەر زمانی خۆیشی زانیوە) هەڵبژێرا بە ئەندامێك لەو چفاتە، لە ساڵی ١٦٨٠ زدا بووە ئەندامێکی پەیامنێر لە ئاکادیمیای زانستەکان لە پاریس.

ئەنتۆنی هۆك دووجار ژنی هێناوەو شەش منداڵی هەبووە، مرۆڤێکی بەخۆو تەندروست بووە بە ڕادەیەك کە تا دواساڵانی ژیانیشی هەر لەکارکردندابوو. زۆر لە سەرداران و پێشەوایان دیدەنییان دەکرد وەك پەترۆسی گەورەو شابانۆی ئینگلتەرە. لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا هەر لە زادگای خۆیدا (شاری دلفت) ساڵی ١٧٢٣ز لە هۆلەندە کۆچی دوایی کرد.

لیڤۆن هۆك چەندین دۆزینەوەی زۆر بە نرخی بە ئەنجام هێنا. یەکەم کەسێك بوو کە تۆوی نێرەSpermatocytes و خڕۆکە سوورەکانی

خوێنی پەسن کرد. بەربەستی بیردۆزەی خۆزایین دەکرد Obiogenesis Theory لە شێوە سەرەتاو نزمەکانی زیندەوەردا، تەنانەت زۆر بەڵگەی سەلمێنراویشی دەهێنایەوە بۆ پووچانەوەی ئەم بیردۆزەیە. هەروەها زانستانە دەریخست کە ئەسپێ وەك مێروو باڵدارەکان هەمان ڕێگای زایینیان هەیە. لە ساڵی ١٦٧٤ زدا مەزنترین دۆزینەوەی بەدی هێنا کە بە یەکەم ئاوڕدانەوەیەك دادەنرێت لە میکرۆبەکاندا. ئەو تێبینیو سەرنجانەی بە یەکێ لە مەزنترین دۆزینەوە دادەنرێت لە بنەڕەتی پەرەپێدانی مێژوودا.

هۆك لەناو تنۆکێکی ئاودا بۆی دەرکەوت کە جیهانێکی نوێی پڕ لە ژیانی تێدایە. ئەو دۆزینەوەیەیشی بە بیری هیچ کەسێکدا نەدەهات. هەر ئەو زیندەڵە ووردانەیشن کە ژیانو مردنی مرۆڤیان خستۆتە ژێر دەسەڵاتیانەوە. بۆ زیاتر فرەزانیو شارەزایی میکرۆبەکانو لێکۆڵینەوەیان، هەستا بە وەرگرتنی چەند کشتێك[1] لە زۆنکاوو بیرو باراناوەکاندا، ناودەمو ڕیخۆڵەکانی مرۆڤ... لەمانە چەندین جۆر بەکتریای بە گوێرەی فەوارەیانی پەسن کرد.

بێگومان ئەو شاکارە مەزنانەی لیڤۆن هۆك کە بە ئەنجامیدا هەروا پێچرایەوەو هیچ کەسێك کاری پێ نەدەکرد تاکو لویس پاستۆر هات، پاش نزیکەی دوو سەدەیەك واتە سەدەی نۆزدەم پاش ئەوەی کە ئەو میکرۆسکۆپانە بە شێوەیەکی باشتر پەرەی پێدرا. بەڵام نابێت لاریمان لەوە هەبێت کە لیڤون هۆك دۆزەری میکرۆب بووە چونکە زانایان بە هۆی ئەوەوە توانییان لە بوونی میکرۆب بزانن و ئاگادار بن.

هەندیَ کەس گازندەیان لەوە هەیە کە گوایە بەختو شانس ـەگەڵ لیڤۆن هۆکدا بووە بۆ ئەو دۆزینانەی. بەلاّم ئەم جۆرە ووتانە هیچی لە جیّی خۆیدا نیەو زۆر نادروستیشە چونکە دۆزینەوەی ـزیندە میکرۆسکوپیەکان لە پاش ئەرکێکی بیّووچانو سەختو وورد سەرنجیی لیڤۆن هۆك هاتە ئەنجام، بیّگومان ئەم کارانەیش تەنها هەر ـە توانای زانایەکدایە کە بەڕاستی زانا بیّت. دۆزینەوەی میکرۆبیش یەکێکە لەو دۆزینەکەمانەی کە دەبەستریّت بە تاکە کەسیّکەوە. ڵیڤۆن هۆکیش یەکێکە لەو کەسانەی کە هەر بە تەنها ڕەنجی کێشا. دۆزینەوەی سپیّرم Spermatozoon و بەکتریا بە بیری کەسدا نەدەهات، هەر ئەم دۆزینانەوەیش... یافتێکی مەزنیانَ بەجیّهێشت لە زیندە زانستگەریەکاندا.

---

(١) کشت : زرعة: Culture.



# ئەفلاتون...

٤٢٧ پ ز - ٣٤٧ پ ز

Plato

فەیلەسوفی یۆنانی مەزن بە خاوەن نوێشکی (١) فەلسەفەی سیاسی دادەنرێت لە وولاَتانی خۆرنشیدا. سەرەڕای ئەوەیش کە بە پێشەنگی رۆشنبیرو بیری میتافیزیکی دادەنرێت. ئەو بیرو ئەنگارانەی (٢) دەربارەی ئەم ڕشتەو بابەنەیدا... بۆتە سەرزارو ڕێبازێکی ٢٣٠٠ ساڵە لە ژیانی مەردومدا، لەبەر ئەوە بە پێشەنگ‌و کەڵەمێرێکی بیرکردنەوەی رۆژاوایی دەژمێررێت.

ئەفلاتون لە بنەماڵەیەکی ئەثینایی تایبەت ساڵی ٤٢٧ پ‌ز لە دایك بووە، لە تەمەنی لاویتی‌دا خۆی ناساند بە فەیلەسوفی مەزن سوکرات کە لە دواییدا بووە شاگردو دۆستی.

له ساڵی ٣٩٩ پ زدا سۆکرات له سێداره‌درا به تاوانی ئه‌وه‌ی که بۆته گێره‌شێوێن‌و تێکدانی بیرو هۆشی لاوانی ئه‌ثینا. فلاتونیش ده‌رباره‌ی مامۆستاکه‌ی هه‌ڵیدایه‌و ووتی «هۆزاکترین و ڕێکزانترین‌و چاکترین مرۆڤ بووه که له ژیانمدا ناسیومه». له سێداره‌دانی سۆکرات وای له فلاتون کرد که زۆر ناره‌زاو بێزار بێت به‌رامبه‌ر به ڕژێمی دیموکراسی، ئه‌وه‌بوو له پاش مردنی سۆکرات به ماوه‌یه‌کی که‌م فلاتون ئه‌ثینای به‌جێ‌هێشت. له‌و دوانزه ساڵه‌ی پاش به‌جێ‌هێشتنی به گه‌ڕان بردیه سه‌ر به‌لام له نزیکه‌ی ٣٨٧ پ ز گه‌ڕایه‌وه بۆ ئه‌ثینا، له‌وێ خوێندگایه‌کی به ناوی (ئه‌کادیمیا) دامه‌زراند، ئه‌م ئه‌کادیمیایه بۆ نزیکه‌ی ٩٠٠ ساڵ دوای خۆی مایه‌وه .

زوربه‌ی ئه‌و چل ساڵه‌ی ژیانی که له ئه‌ثینا بردیه سه‌ر هه‌ر به یاددان‌و نووسینی فه‌لسه‌فه‌وه خه‌ریك بوو. یه‌کێ له‌و شاگرده زرنگانه‌ی که لای پێ‌گه‌یی‌و ناوبانگ بوو زانای فره‌زان (ئه‌ره‌ستۆ) بوو که له ته‌مه‌نی ١٧ ساڵیدا خۆی گه‌یانده ئه‌و ئاکادیمیایه، ئه‌وده‌مه‌یش فلاتون له ته‌مه‌نی ٦٠ ساڵیدا بوو .

ساڵی ٣٤٧ پ ز کۆچی دوایی کرد پاش ئه‌وه‌ی ته‌مه‌نێکی ٨٠ ساڵه‌ی برده‌سه‌ر، له پاش خۆی نزیکه‌ی ٣٦ په‌ڕاوی به پێزو نایابی به‌جێ‌هێشت، زوربه‌ی نووسینه‌کانی له‌سه‌ر کێشه‌کانی سیاسه‌و خوره‌وشت ده‌دوێت جگه له‌وه‌ی **که بایه‌خێکی ته‌واوی ئه‌دا به میتافیزیك‌و لاهوت ..... هه‌ر چه‌نده سه‌خت‌و** گرانه کارنامه‌کانی تا له‌م ئاسته‌دا به ته‌واوی بزانرێت، به‌لام هه‌رچۆنێك بێت ڕه‌نگه بتوانرێت هه‌ندێك له یاداشت‌و بیرنامه‌کانی به کورتی له‌سه‌ری بدوێین له په‌ڕاوه‌که‌یدا به ناوی (کۆمار) که

ڕەنگدانەوەی ڕژێمێك دەخاتە ڕوو لە کۆمەڵگایەکی ئارمانیدا (ئایدیالی) .

فڵاتون پێشنیاری ئەوەی دەکرد باشترین شێوە لە شێوەکانی دەسەڵات بریتی‌یە لە دەسەڵاتی ئەرستۆکراتی بەڵام نەوەك ئەرستۆکراتیەکی وەچەزایی‌و شاهانە بەڵکو ئەرستۆکراتیەکی شیاوو شایست، واتە دەسەڵات بەدەست دادوەرترین‌و چاکترین کەسەوە بێت، ئەو کەسانەیش وەنەبێت بە دەنگدانی هاوولاتیان هەڵبژێررێن بەڵکو لەسەر بناغەی سەر پشکی [1] هەڵبژێرین. جا ئەو کەسانەی کە دەبنە ئەندام لە ئەنجومەنی ڕاسپێراندا (فەرمانڕەوایاندا) کەسانی تر پەسەند دەکەن کە بینە ئەندام بە مەرجی لێهاتوویی‌و تواناییان .

فڵاتون لەو بڕوایەدا بوو کە پایەتە هەموو کەسێك چ نێر بێت یاخود مێ ڕێیان بۆ خۆش بکرێت تاکو یاراو چوستی خۆیان دەربخەن‌و ببنە ئەندام لە ئەنجومەندا (لەم ڕۆژنەوە دەردەکەوێت کە فڵاتون یەکەم فەیلەسوفێك بوو بێت دانی بە یەکسانی ئافرەت‌و پیاو هێنا بێت. جا بۆ جێگیرکردن‌و ڕاگرتنی ئەم یەکسانییە پێشنیاری دەکرد کە پێویستە میری پێش هەموو هەنگاوێکی ڕاهێنانی وەرز شکاری بخاتە گەڕ، نایشبێت بیرکاری و هونەری مۆسیقاو وانەکانی تر ئاستی بکرێت. هەروەها پایەتە لێپرسینەوەیەکی فراوان‌و تاقیکردنەوە دابنرێت لە فرەهەرەتێکی جیاوازدا. جا گەر ئەو کەسانەی کە ئاستی دەرچونیان لەم تاقیکردنەوانەدا تا ڕادەیەك بێت... ئەوا تەرخان دەکرێن بۆ کاروباری ئابووری لە نێو کۆمەڵدا. ئەوانەیش کە زرنگ‌و زۆر سەرکەوتوون... ئەوا لەسەر خوێندن‌و یاددان دەمێننەوە. بێ‌گومان ئەو فەلسەفەی کە فڵاتون مەبەستی بوو بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر قووڵ.

ئەگەر ئەو کەسانەی کە لە تەمەنی ٣٥ ساڵیدا توانای خۆیان سەلماند لە زانینی بنەڕەتە بیردۆزەکاندا... ئەوا ڕێیان دەدرێتی بۆ ١٥ ساڵی تر تاوەکو بە تەواوی سەرشتەو شارەزاو فرەزان بن لە کاروباری ژیاندا. لەسەر ئەو ئاستەو پلە بەرزەیشیاندا وەنەبێت **لـە دوا دەسـتەی ئەنجـومەن هـەر وەربگیرێن ، بەڵکو دەبێت شارەزایی**وفرەزانییان بە تەواوی بخەنە گەڕو بیچەسپێنن لە کارو باری ژیانیانداو ڕاستی ژیانی‌گشتی بخەنە ڕووو‌بتوانن چارەسەری بکەن، یاخود بڵێین ئەو کەسانە دەچنە ئەو دەستەیەوە کە بە ڕوونو ئاشکرا تەواو گرنگ‌و بایەخ ئەدەن بە بەرژەوەندی گشتی گەل .

بێگومان بۆ هەموو کەسێکیش دروست نیە ببێتە ئەندام لە ئەنجومەنی ڕاسپێراندا، هەروەها مەرجیش نیە ئەو کەسەی کە دەبێتە ئەندام دەوڵەمەند بێت. ئەوانەی کە دەبنە ئەندام بۆیان هەیە تا ڕادەیەك دارندەبن و موچەیەکی براوەیشیان بدرێتێ بەلام زۆرنا...، نابێت زێرو زیو دار بن، هەروەها فرە خێزاندار بن .

بێگومان پاداشت‌و خەلاتیشیان نابێت پوول‌و پارە بێت بەڵکو خەلاتێکی گیانی بێت واتە ڕەزابوونێکی ویژدانی ودەروونی کە ئەمەیش لە خزمەتگوزاری گەلەوە دەبێت .

هیچ وولاتێکی ئەورووپا نەیتوانیوە باوەڕو تێڕوانینەکانی فلاتون لە پێکهێنانی ڕژێمیدا بهێنێتە دی، بەلام دەتوانین ئەوە بخەینەوە یادمان کە لە چاخی ناوەڕاستدا کەنشتەی کاتۆلیك لە دەستەیەکی ڕۆشنبیر لە پیاوانی ئایینی پێکهاتبوو. ئەو دەستەیە بە ڕۆشنبیرییەکی فەلسەفەیی گونجاو سەرشتە بوو بوون، ئەو پیاو ئایینیانە خۆیان دەگرتەوە لە ژن‌و ژنخوازی، جگە لەوەیش کە ڕێ نەئەدرا بە پیاوانی دەوڵەت‌و دنیایی

ئامۆژگاریو سەرپەشتیان بکەن .

لە لایەکی تریشەوە سەیر دەکەین بیرو راکانی فلاتون تا رادەیەك کاریگەر بووە بۆسەر وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، بۆ نموونە هەندێك بەند هەیە لە دەستووری ئەمەریکاییدا کە گشت هۆو گوشادیەك تەرخان دەکات بۆ دۆزینەوەو رێزگرتنی ئارەزووەکانی گەل .

ئەو بیرو رایانەی فلاتون پتر لە ٢٣ سەدە کاریگەرو گرنگ بووە بۆ سەر پسات، سەرەرای ئەوەیش کە زۆر لە فەیلەسوفانی تر هەمان رێبازی خو رەوشتو سیاسەتیان گرتبووە بەر ژیانیاندا .

---

(١) نوێشلك : سەرەتای بیرکردنەوە .

(٢) ئەنگار : تصور .

(٣) سەرپشکی : اختیار .

○



# جۆجليلمۆ مارکۆنی...

١٨٧٤ز - ١٩٣٧ز

**Guglielmo Marconi**

جۆجليلمۆ مارکۆنی داهێنەری ڕادیۆ... ساڵی ١٨٧٤ ز لە شاری (پۆلۆنا)ی ئیتاليا لە نێو خێزانێکی دارمەندەو خانەداندا لەدایك بووە، ڕۆشنبیریو سەرپشتەیی لە چەند مامۆستایەکی لێهاتووو شارەزا وەرگرتووە. لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا بوو نووسراوێکی (هنریگ هێرتز)ی زانای خوێندەوە کە پێش چەند ساڵێك بە تاقیکردنەوە بە ئەنجامی دابوو. ئەم تاقیکردنەوانەیش دەربارەی بوونی هەندێك شەپۆلی کارۆ موگناتیسیی دەدوێت کە بەنێو هەوادا بە خێرایی ڕۆشن دەجوڵێتەوە.

مارکۆنی دەسبەجێ کەوتە ئەو بیرو ئەندێشەیەی کە ئەم شەپۆلانە

دەتوانرێت بخرێتە زێر بارو بەکار بهێنرێت بە ناردنی کۆدی تەلەگرافی Telegraphic Code بێسیم بۆ جێگای زۆر دوورو بەرین، بێگومان ئەم کارە مەزنە دەرفەتێکی زۆر بەربلاوبوو بۆ ئەو هاتوو چۆو رێگەو بانانەی کە لە توانای تەلەگرافدا نەبوو هەستێت بەم کارە وەك ناردنی پەیام بۆ ئەو کەشتییانەی کە لە پانتایی دەریادان .

لە ساڵی ١٨٩٦ زدا پاش رەنجو تێکۆشانێکی بێ ووچانی یەك ساڵەی گەیشتە ئەنجامێکی سەرکەوتوو لە تۆمارکردنی داهێنانە نوێکەیدا لە ئینلگتەرە، هەر لە ساڵی دواییشدا توانی چەند پەیامێکی بێسیم بە کەناڵی ئینگلیزی را رەوانەبکات، بەڵام لە ساڵی ١٩٠٠ زدا نەبێت ئەو داهێنانەی بۆ تۆمار نەکرا. مارکۆنی پاش زەبرو کۆڵنەدانێکی سەخت لە چەند داهێنانێکی چاکاری گرنگدا توانی پەیامێکی بێسیم لە ئینگلتەرەوە بە ئوقیانووسی ئەتلەسی‌را بگەیەنێتە (نیوفۆندلاند) .

گرنگی داهێنانەکەی مارکۆنی بە شێوەیەکی درامی لە ساڵی ١٩٠٩ زدا زیاتر دەرکەوت، کاتێ کە پاپۆڕی (کۆماری) خۆیدا بە پاپۆڕێکی ترداو لەوەدا بوو بە تەواوی زێر ئاو بکەوێت، دەسبەجێ بە ناردەیەکی بێسیم هانای بۆ پاپۆڕەکانی نزیکی برد تاکو فریای بکەونو رزگاری بکەن، بێگومان هانایان پێ‌گەیشتو هەرچی لە پاپۆڕەکەدا بوو رزگاریان بوو لە مردن تەنها شەش کەس نەبێت .

مارکۆنی لە دۆزینەوەو داهێنانی ئەم کارە مەزنەیدا لە ساڵی دواینیدا خەلاتی نۆبلی پێ‌بەخشرا، هەر لە ساڵی دواییشدا توانی ئەو پەیامە بێسیانە لە ئیرلەندەوە بگەیەنێتە ئەرجەنتین کە نزیکەی دوو هەزار میل لە یەکترەوە دوورن، ئەو پەیامانەیش کە رەوانە دەکران بە پێی رژێمی (مۆرس) بوو لە تەلەگرافدا (واتە — ، داش خاڵ).

هەرچەندە دەیشزانرا کە دەنگ بە هۆی رادەیۆوە دەگەیەنرێت بەلاَم ئەم کارە لە دوای سالَی ١٩١٥ زدا بە ئەنجام درا. پاش ئەوە ئیتر رادیۆ بە رادەیەکی بێ سنوورو زۆر بە خێرایی بلاَوبووەوە لە نێو کۆمەلَدا .

هەر چەندە مارکۆنی مافی داهێنانەکەی بە ناوی خۆیەوە تۆمارکراو بروانامەکەی لەسەر وەرگرت بەلاَم لەگەلَ ئەوەیشدا دووچاری بەرەنگاریو گێرمەو کێشەیەك بوو بە هۆیەوە لە دادگا. هەبوو خۆی لە مارکۆنی بە پێشتر دادەنا لە مافی ئەو داهێنانە بەلاَم لە دواییدا هەر دەرکەوت کە مارکۆنی خاوەنو پێشکاری ئەو داهێنانەیەو ئافەرینیش هەر بۆ ئەو دەگەرێتەوە .

مارکۆنی لەو دوا رۆژانەی ژیانیدا خەریك بوو بە لێکۆلینەوەو رەبازێکی بێ ووچان دەربارەی شەپۆلە کورتەکان (پەیوەندی شەپۆلە هەرەووردەکان) بەلاَم ئەم ئاواتەی بۆ نەهێنرایە دی چونکە لە سالَی ١٩٣٧ زدا لە رۆما کۆچی دوایی کرد .

گەر راوێژی خۆمان بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە مارکۆنی تەنها وەك داهێنەرو بایەخ پێدەرێك لە بواری رادیۆدا ناوبانگی دەرکردوە . بەلاَم دەبێت ئەوەیش بزانین کە داهێنانی رادیۆ سەرەتایەك بوو بۆ دەرکەوتنی تەلەفزیۆن، لەبەر ئەوە رەوایە گەر بلێین دۆخێکی بالاَی هەبووە لە پەرەپێدانی تەلەفزیۆنیشدا - نەك داهێنانی - روونو ئاشکرایشە کە پەیوەندی بێسیم چەند گرنگە لەکاروباری زانستگەری‌ی وسەربازی‌ی و کاری پۆلیسییدا، سەرەرای ئەوەیش کە بۆچەندین مەبەستی‌تر بەسوودە .

هەرچەندە تەلەگراف پێش ڕادیۆ بەنیوەسەدەیەك داهێنراو پاش چەند چاکارییەك هاتەکایەوە بەڵام ناگات بەگرنگیو بێهاوتایی ڕادیۆ، هیچ شتێکی تریش جیی ناگرێتەوە چونکە گرنگی زۆر زۆر بەربڵاوی لێبەدی دەکرێت... لە ئۆتۆمۆبێل، کەشتی دەریایی، فڕۆکەو تەنانەت کەشتی ئاسمانیش. هۆیەکی تریش کە ڕادیۆ زۆر گرنگترە لە تەلەفون ئەوەیە کە ئەو پەیامانەی بەهۆی تەلەفونەوە دەنێررێن دەتوانرێت بە هۆی ڕادیۆیشەوە بنێررێن بەڵام ئەو پەیامانەی کە بە ڕادیۆ دەنێررێن ناتوانرێت بە تەلەفون بنێررێن.



# لۆدڤیگ ڤان بیتهۆڤن...

١٧٧٠ ز - ١٨٢٧ ز

Ludwig Van Beethoven

مەزنترین مۆسیقازان لۆدڤیگ ڤان بیتهۆڤن لە ساڵی ١٧٧٠ زدا لە شاری (بۆن)ی سەر بە ئەڵەمانیا لەدایك بووە. بەهرەوەری و زرنگی هەر لەمنداڵییەوە لی ی دەرکەوتووە، یەکەم کاری هونەری دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٨٣ ز. لەتەمەنی لاویتی‌دا دیدەنی ڤیەننای کردو خۆی ناساند بە مۆسیقازانی بلیمەت مۆزارت بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم بوو.

لە ساڵی ١٧٩٢ زدا گەڕایەوە بۆ ڤیەننا و چووە لای مامۆستاکەی کە ناوی (هایدن) بوو، یەکێك بوو لە ناوبانگیرین پێکهێنەری مۆسیقایی ئەو سەردەمە لە ڤیەننا (مۆزارت بەر لە ساڵێك کۆچی دوایی

کردبوو). ئیتر بەم چەشنە بیتهۆڤن ناچار بوو کە تادوازیانی لە ڤییەنا بەرێتەسەر.... پایتەختی جیهانی مۆسیقایی ئەو سەردەمە.

سۆزی هونەری بیتهۆڤن وەك پیانۆژەنێك کاریکردبووە سەر ئەوانەی لێیان دەبیست، بەرەبەرە بە ژەنەرو مامۆستایەك ناوی دەرکرد تاوای لێهات بووە پێکهێنەرێکی مۆسیقایی فرەبەر. ئەوەندە ناسرا... بەئاسانی بەرهەمەکانی دەفرۆشراو بەزوویی بڵاودەبووەوە.

کاتێ کە تەمەنی گەیشتە ٣٠ساڵ، نیشانەی کەری لێوەدەرکەوت و بەهێواشی زۆری بۆ دەهێنا هەتاوەکو چەند جارێك دەیویست خۆی بکوژێت لەداخا.

ساڵانی ١٨٠٢ ز تا ١٨١٥ ز بەهەرەتێکی نێوەند دادەنرێت لە ژیانی هونەری بیتهۆڤندا، لەو ساڵەنەیشدا کەری زۆری بۆهێناو بەرەبەرە خۆی لەپەیوەندی کۆمەڵایەتی ئەتەکاندەوە. خەڵك بەم کردارەی وایاندەزانی نائومێدو توورەیە لەژیان، هەر لەودەمەیشدا پەیوەندییەکی درامی بەست لەگەڵ خاتون گەلێکی ناسکۆلەدا بەڵام هەمووی بە ناخۆشی کۆتایی پیهات و ئیتر هەروا بەرەبەنی مایەوە.

هەرچەندە کەری زۆری بۆهێنابوو بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بەرهەمە بەپێزەکانی لەوپەڕی ئاستی بەرزو بڵندی هونەریدا بوو. لەکۆتایی چلەکاندا ئیدی بەتەواوی کەربووو نەیدەتوانی لە ئاهەنگە گشتیەکاندا بەشداری بکات، خۆی دەکێشایەوە لەکۆمەڵ و کارە هونەرییەکانیشی

بەرەوکەمی دەچوو بەلاّم تێگەیشتن‌و بۆچوونی زۆر خەست‌و بەپیت بوو لەبەرئەوە سەیرنیە گەر بڵێین مۆسیقای بۆخۆی‌و نەوەی ئارمانی (ئایدیاڵی) دوارۆژ دادەنا، هەروەکو لیٚ‌ی دەگێرنەوە کە گوایە بەرەخنەگرێکی ووتبوو: (من مۆسیقا بۆ ئێوە لێنادەم بەڵکو بۆ نەوەکانی دوارۆژ).

ئای گەردوون چەند کەچرۆوە!!! ئاوابتوانێت مەزنترین پێکهێنەری مۆسیقا تووشی کەری‌بکات... بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا راستی لە ئەندێشە بڵندترو مەزنترە.... ئەو کارە هونەریانەی کە لەو دەمەی ژیانیدا بە ئەنجامی هێنا بەگرنگترین‌و نایابترین... باڵاترین‌و واڵاترین هونەری مۆسیقا دادەنرێت.

بەرهەمەکانی بیتهۆڤن... بریتین لە ٩ سەمفۆنی‌و ٣٢ سۆناتای پیانۆ، ٥ کۆنشەرتۆی پیانۆ و ١٠ سۆناتای پیانۆ و کەمان... لەگەڵ چەندین مۆسیقای ژێدەری‌و مۆسیقای دەنگی‌ی‌و مۆسیقای شانۆگەری‌ی‌و بەرهەمی تر، چۆنیەتی‌و جۆری مۆسیقا کانی زۆرمەزنترن لە برو چەندیان. ئەو هونەرکارییەی... تێکەڵاوی هۆش‌و هەست دەبێت لەگەڵ دانان‌و نەخشاندنیدا.

بیتهۆڤن لەو مۆسیقاکاریانەیدا تەواو گرنگی‌و بایەخی‌دەدا بە مۆسیقای ئاواز کە لەم بوارەدا ئەم چەشنە مۆسیقایەی گەیاندبووە بڵندترین پلەی هونەری.

بیتهۆڤن مۆسیقازانێکی خاوەن نەریتبووە. ئەو فرەگۆرانکارییانەی کاریگەرێکی هەمیشەیی‌ی هەبووە بۆ سەر تیپە مۆسیقاییەکانو زۆربوونی مۆسیقاژەنەکان تیایدا.

هەروەها درێژەیدا بەکانی سیمفۆنی جگە لەوەی کە توانای پیانۆی بەشێوەو شێوازێکی فراوانتر هێنایە پێشەوەو ئاستی گرنگی بلندکردنەوە لەنێو ئامێرە مۆسیقاییەکانی تردا. ئەو کارە مەزنانەی دادەنرێت بەپەیوەستێك لەنێوان مۆسیقای کلاسیکی‌و رۆمانسیدا، هەروەها بووەتە سەرچاوەی خورپەی زۆر لەبلیمەتە رۆمانسیەکان.

ئەو مۆسیقازانە مەزنە لەساڵی ١٨٢٧ زدا لەشاری ڤیەننا دواسەری ژیانی نایە ژێرخاك پاش‌ئەوەی تەمەنێکی ٥٧ ساڵەی بە تاڵی‌و بێ‌کەسی بردەسەر.

○



# ڤێرنەر هایزنبرگ..

١٩٠١ز - ١٩٧٦ز

**Werner Heisenberg**

لەساڵی ١٩٣٢ زدا خەڵاتی نۆبڵ بەخشرا بە زانای فیزیاگەری ئەڵەمانی ڤێرنەر هایزنبێرگ لە ڕێساندنی میکانیکای کوانتەمدا Quantum Mechanic کە بە یەکێك لە گرنگترین دەسکەوتەکانی مێژووی زانستەکان دادەنرێت.

زانستی میکانیك (میکانیکزانی ی) چارەسەری ئەو قانونە گشتیانە دەکات کە زاڵە بەسەر جوڵانەوەی تەنەکاندا، بەڵام لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا گریمانو بیردۆزەی گەوارتر هاتەکایەوەو بەرەبەرە ئاشکراو دەرکەوت کە ئەو قانونانەی بۆ زانستی میکانیك دارێژرابوو نارادەیەك بۆ پەسنی تەنە هەرەدرشتەکان نەدەگونجا وەك ئەتۆمو ئەو

تەنۆکانەی کە لە ئەتۆم بچوکترن. ئەو راستیە زۆر سەخت‌و گران بوو لەوەی کە چارەسەر بکرێت چونکە ئەو قانونانەی کە دەزانرا زۆر لەبارو شێیاو بوون بۆ تەنە میکرۆسکوپیەکان «ئەو تەنانەی کە زۆر زۆر لە ئەتۆمەکان گەورەترن». لە ساڵی ١٩٢٥ زدا هایزنبێرگ شێووگێکی نوێی لە فیزیکدا پێشنیار کرد کە لە رەچەڵەکدا لە چەمکی سەرەکییەوە لەگەڵ شێووگە کلاسیکیەکەی نیوتن‌دا جیاوازە.

ئەم بیردۆزە نوێیە «پاش دەسکارییەکی کەم لەلایەن زانایانی دوای هایزنبێرگ» برەوییەکی یەجگار زۆر بڵندی بەدەست‌هێنا. بەرادەیەکیش پەسەندە لەم رۆژانەماندا کە هەرچی رژێم‌و یاسا فیزیکەکان هەیە دەیگرێتەوە... ئیتر جۆرو قەوارەی هەرچۆنێ بێت، جا لەبەر ئەوەی کە بیردۆزەکەی زۆر کاریگەرە دەتوانرێت بیرکارییانە ئەو رژێمە میکرۆسکوپیانە «ئیتر هەرچۆنێك بێت» پیشان بدرێن‌و بۆشمان دەربکەوێت کە پێشبینی لە میکانیکای کوانتەمدا چەند جیاوازییەکی تەواوی هەیە لەگەڵ میکانیکای کلاسیکدا بەچەند برێکی ئەوەندە بچوك کە ناتوانرێت بپێورێت. هەر لەبەر ئەمەیشە کە میکانیکای کلاسیك بەرێگەی بیرکارییانە زۆر زۆر ئاسانترە لە میکانیکای کوانتەم. ئەو تاقیکارییانەیش زانستانە دەریخستووە کە بۆچوونی کوانتەم میکانیك لە رژێمی دوورکییەکانی(١) ئەتۆمدا چەند راسترو پەسەنترە لەم بارو دۆخەدا.

یەکێ لە ئەنجامە گرنگەکانی بیردۆزەی هایزنبێرگ (بنەرەتی سنورێتی Priciple of Determinancy) کە لە ساڵی ١٩٢٧ زدا بەخۆی دایرشت. ئەم بنەرەتە یەکێکە لەو بنەرەتە گرنگانەی کە تەواو رەگی داکوتاوە لەگشت زانستەکاندا. ئەوکارەی کە بنەرەتی سنورێتی پێی

هەڵدەسێت بریتی‌یە لە دانانی سنوورێکی دیاری‌کراو بۆبیردۆزەیەك کە تواناماں بەسەر کرداری پێوانکاریدا ببێت.

گەر ئەو قانونە سەرەکییانەی فیزیك بەربەستی جیهان بکەن بۆ گەیشتن بەووردزانینی ئەو ڕژنمەی هەوڵی بۆدەدرێت‌و لەسەریشی بکۆڵرێتەوە ئەوا ڕەفتارو ڕەوتی ئەو ڕژنمە کە زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە... نە دوارۆژدا ناتوانێت پێشبینی لێبکات.

سەربارەت بەم بنەرەتە سنوورەیش هیچ چاکارییەك نەکراوە لە ئامرازو دەزگا پێوانەییەکاندا تاکو بەسەر ئەو کۆسپانەدا زاڵ‌ببین، ڕێبازو بنەرەتی سنورێتی دەریدەخات کە زانستی فیزیك تەنها لە پێشبینیە ئامارکارەکاندا دۆخی خۆی دەبینێت، ئیتر توانای بەسەر کاریکی‌تردا نیە.

ئاشکرایشە لەرووی بیرکارییەوە لەوانەیە بیردۆزەی کوانتەم بوارێکی مەزنترو فراوانتری هەبێت لەبیردۆزەی خزمایەتی، جگە لەوەی کە گۆڕانکارییەکی تەواوی خستە چەمکی سەرەکیمان لەجیهانی فیزیکدا.

لەو کارەمەزنانەی کە خرایەگەڕ بەهۆی ئەم بیردۆزەوە... دروستکردنی میکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنیك، تیشکی لێزەر، ترانزستۆر، هەروەها خرایە گەڕ لەفیزیکی ناووکی‌و ووزەی ئەتۆمیدا، بناغەی زانستی شەبەنگزانییە، کاری‌پێدەکرێت لە ستێرناسی‌ی‌و کیمیاگەرییدا، لەپێکهاتنی ناوەوەی ستێرەکانداو موگناتیسی‌ی ئاسن‌و سروشتەکانی شلەی هیلیۆم‌و چەند بیرکارگەرییەکی‌تر.

هایزنبێرگ ژیانی هەر لە ووڵاتی ئەڵەمانیادا بەسەربرد، هەرلەوێش لە ساڵی ١٩٠١ز لەدایك‌بووە. پلەی دکتۆرای لە ڕشتەی بیردۆزەی

فیزیکدا ساڵی ١٩٢٣ ز لە زانکۆی میونیخدا وەرگرت: لەساڵانی ١٩٢٤ز وە تاکو ١٩٢٧ز لەگەڵ فیزیاگەری دانیمارکی بەناوبانگ (نیلزبۆر) دا کاریدەکرد لەشاری کۆپنهاگن.

لە ساڵی ١٩٢٥ زدا یەکەمین نامەی زانستی‌ی لەرشتەی میکانیکای کوانتەمدا چاپکرا، لە ساڵی ١٩٢٧ زدا بیردۆزەی بنەرەتی سنوریتی داڕێژا.

هایزنبێرگ خاوەنی حەوت زارۆڵابوو، ساڵی ١٩٧٦ز لە تەمەنی ٧٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

واباوەرە کە هایزنبێرگ زانایەکی باڵاو لێپرساوبێت لە پەرەپێدانی میکانیکای کوانتەمدا... لەبەرئەوە شایانی ئەوەیە کە ئاستو پلەیەکی بەرزی بدرێتی لەم لیستەدا.

---

(١) دوورك: بُعد Diamention.



# ئەلەکساندەر گراهام بێڵ..

١٨٤٧ ز - ١٩٢٢ ز

**Alexandar Graham Bell**

ئەلەکساندەر گراهام بێڵ داهێنەری تەلەفون، ساڵی ١٨٤٧ ز لەشاری ئەدەنبرەی سەربە سکۆتلەندە لەدایكبووە. چەند ساڵێکی لەخوێندگا میرییەکان بردەسەر و پاشان بەسەرشتەیی خۆیو دارندەیی بنەماڵەکەی توانی ئاستێکی باش لە رۆشنبیریدا پەیدا بکات.

باوکی شارەزاو کارزانێکی باڵابوو لە یەکالاکردنەوەی دەنگی مرۆڤو راستکردنەوەی ووتەو یاددانی کەرولاڵ. ئەمیش (بێڵ) کە لەگەڵیادا بوو کەتبووە خولیای ئەو کارەی باوکیەوە جا لە ساڵی ١٨٧١ زدا کاتێك کەچوو بۆ بۆستن لە (ماساشوسس)ی سەر بە ووڵاتە

یەگگرتووەکانی ئەمەریکا لەسەرەتادا بەرنامەیەکی بۆ ئەو دۆزینکارانەی دانا تا گەیاندیە داهێنانی تەلەفون. ئەوەبوو پاش چەند هەفتەیەك لەشوباتی ١٨٧٦ زدا داهێننامەی پیێبەخشرا لەسەر ئەو کارە مەزنەی.

سەیر ئەوەیە کەسانی تریش لەمبوارەدا کەوتبونە کارەوەو چاوەڕوانی بڕوانامەکانیان دەکرد لەهەمان ڕۆژدا بەڵام بێل پێش ئەوان بە کاژێرێك پێشنیارەکەی وەرگیراو پەسەندکرا.

پاش ئەوەی داهێننامەکەی پێدرا، یەکەمین تەلەفون خرایە ڕوو لە پێشانگایەك لەشاری فلادلفیا. زۆر سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاو لەهەموو لایەکەوە پیرۆزباییان لێدەکردو ئافەرینیان دەکرد کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا کۆمپانیا یەکگرتووەکانی بروسکەی ڕۆژاوا ڕازی نەبوو ئەم داهێنراوە بە ١٠٠و٠٠٠ دۆلاریش بکرێت. لەبەرئەوە بێل و هاوکارەکانی لەتەموزی ١٨٧٧ زدا کۆمپانیایەکیان بۆ خۆیان پێکهێنا. ئەم کۆمپانیایە بووە بەردی بناغەی کۆمپانیای تەلەفونو بروسکەی ئەمەریکای ڕۆژاوا کە تائێستایش ناوبانگی هەرماوەو بە برەوترین کۆمپانیای کەرتی تایبەتی دەژمێررێت لەجیهاندا.

بێل و ژنەکەی لەو کۆمپانیایەدا ١٥٪ ی بەشیان هەبوو. نەیاندەزانی قازانجو سودی کۆمپانیا کە چەند دەبێت، هەر لە ماوەی مانگێکدا نرخی لە (بۆرسە) گەیشتە ٢٥٠ دۆلار، پاشان لە مانگی تشرینی دووەمدا بەرزبووەوە گەیشتە ١٠٠٠ دۆلار بۆ هەر بەشێك (ژنەکەی بێل پێش چەند مانگێك داوای دەکرد کە بەشەکەی بە ٦٥ دۆلار بفرۆشێت، نەیدەزانی نرخی بەشێك ئا بەم شێوەیە بەرز دەبێتەوە).

لەساڵی ١٨٨١ زدا ڕەمەکیانە سیێیەکی بەشەکەی تری فرۆشت کە هەر ئەو بەشە لە ساڵی ١٩٣٣ زدا گەیشتە نزیکەی یەك ملیۆن دۆلار. ئەگەرچیش بێلّ بەو داهێنانەی ئەوەندە دەوڵەمەند نەبوو بەلاّم بەکارەزانستەکانیەوە هەر خەریك‌بوو. ئەوەبوو چەند داهێنانێکی بەسەرکەوتووانە بەدی‌هێناو زۆر بایەخی پێ‌ئەدان. بەلاّم بە شێوەیەکی سەرەکی بەڕانمایی کەڕولاڵانەوە خەریك‌بوو.

لەوژنەیشی کە کەڕ بوو و یاددی ئەدا دوو کوڕ و دوو کچی لیّ‌بوو بەڵام هیچیان بۆ نەمایەوە و هەر بە منداڵی مردن، خۆیشی (واتە بێلّ) کە لە ساڵی ١٨٨٢ زدا ڕەگەز نامەی ئەمەریکایی درایێ، لە ساڵی ١٩٢٢ زدا کۆچی دوایی کرد.

سەربارەت بەپۆلاندنی لەم لیستەداو بەراووردکردنی بە مارکۆنی سەیردەکەین لە پلەیەکی نزمتر دایە، ڕاستی‌یەکەیشی ئەوەیەك تەلەفون دوو سروشتی تایبەتی تیادا بەدی دەکرێت یەکەمین:ئەوەیە کە ناکرێت هەرچی ئێستگە تەلەفونیەکانی جیهانە بگوڕێت بە ئێستگە ڕادیۆیەکان.

دووەمین:ئەو ڕێگا سەرەکییەی کە گراهام بێلّ گرتبوویەبەر بۆ پەیداکردنی دەنگ لە تەلەفوندا لەوەپێش لەسەر دەستی داهێنەرانی ئامێری بلندگۆ و ڕادیۆ و تۆمارکەر و چەند ئامێرێکی‌تر بە ئەنجام درابوو. جا ئەمانەیش بووبوونە ڕێخۆشکەرێك بۆ داهێنانی تەلەفون، لەبەرئەوە ئەلەکساندەربێلّ بە کەسێکی ناسراو لە دوای مارکۆنی دادەنرێت.



# ئەلەکساندەر فلێمنگ...

١٨٨١ ز – ١٩٥٥ ز

Alexandar Fleming

دۆزەری پەنسلین Penicillin ئەلەکساندەر فلێمنگ... ساڵی ١٨٨١ ز لەشاری (لۆشفیلد) ی سەر بە سکۆتلەندەلەدایك بووە. لە بیمارخانەی خاتو قەشە ماری لەلەندەن کۆلێژی پزیشکی ی تەواوکرد. پاشان کەوتە کاروزانستگەری لە دیاردەکانی بەرگری Immunity نەخۆشی و هۆیەکانی. لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بووە پزیشکێکی سوپایی. لەو دەمەی کە خەریك بوو بەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی زامە تەنیوەکان سەیری کرد زوربەی ئەو مادە پاکژەرانەی Disinfectants کە بەکاردەهێنرێن زیاتر ئازاری خانەکانی لەشی مرۆڤ دەدەن وەك لەوەی کاریگەر بن بۆ میکرۆب. لەمەوە هەستی کرد کە پزیشگەری پێویستی

بەدەرمانێك هەیە بەکاربێت بۆسەر بەکتریاو ئازاری خانەکانی لەش نەدات. لەپاش جەنگی جیهانی فلێمنگ گەڕایەوە بۆ بیمارخانەکەی خاتو قەشە ماری، هەر لەو ساڵەی ۱۹۲۲ زدا لەو کاتەی کە خەریك‌بوو بە زانستگەریەکانیەوە مادەیەکی بەناوی (لیسۆزایم Lysozyme) ی دۆزییەوە. ئەم پێکهاتووە کە لەشی مرۆڤ دەریدەکات لە پەردەی چلْمین (Mucous Membrane) و فرمێسك‌دا هەیە. ئەم مادەیەیش وەنەبێت زیانبەخش بێت بۆخانەکانی لەش بەڵکو هەندێ میکرۆب دەکوژێ کە هیچ زیان بە لەشی مرۆڤ ناگەیەنین. ئەم دۆزینەوەیە هەرچەندە نوێ‌بەخش‌و خۆشنوود بوو بۆی بەڵام ئەوەندە بایەخی نەبوو:

لەساڵی ۱۹۲۸ زدا فلێمنگ توانی ئەو دەسکەوتە مەزنەی بەدی‌بهێنێت ئەویش لە ئەزمونگاکەیدا کاتێ بە تاقیکارییەوە خەریك‌بوو بەرێکەوت شکارتەیەکی بەکتریای بەهۆی جۆرە کەڕوویەکەوە پیس‌بوو، سەرنجی‌دا ئەو پاژەی کە لە نزیك کەڕووەکانەوەیە هیچ بەکتریای تێدا نەماوە. لەمەوە بۆی دەرکەوت کە کەڕوو مادەیەکی ژارو کوشندە دەردەکات، بۆ ئەو بەکتریانە، دەسبەجێیش توانی ئەو مادەیە بدۆزێتەوە کە رێ لە فراژێ بوونی چەندین جۆر لەو بەکتریا زیانبەخشانە دەگرێت، ئەو مادەیەیشی ناونا پەنسلین (لەسەر کێشی پەنسلیۆمە کە جۆرێکە لە کەڕووە تورەکەییەکان Ascomycetes Class) کە بریتیە لە مادەیەکی سوودبەخش بۆ لەشی مرۆڤ‌و بوونەوەرەتەباکان. بەم شێوەیە فلێمنگ لە ساڵی ۱۹۲۹ زدا ئەنجامی ئەو زانستگەرییەی بڵاوکردەوە بەڵام بایەخێکی ئەوتۆی

پیێنەدرا، فلێمنگ پێشنیاری ئەوەی دەکرد کە پەنسلین دەشێت لەپزیشکەرییدا بەکاربهێنرێت بەلاّم نەیدەتوانی چۆنی روونی بکاتەوەو چۆن رێگەیەکی تەکنیکی بگرێتەبەر بۆ پاکژێنی پەنسلین!!! ئابەم چەشنە ئەم دەرمانە ئەفسونیە بۆ ماوەی دەسالێك هەروا سەرینرایەوە بەبێ ئەوەی بەکاربهێنرێت.

لە کۆتایی ساڵانی ۱۹۳۰ زدا دووپزیشکی بەریتانیای ناسراو بە (هاوارد فلۆریو ئایرنست تشین) بەرێکەوت نامەکەی فلێمنگیان دەربارەی پەنسلین خوێندەوە. ئەم دووزانایە زۆر بەووریاییو تاقیگەری ریێی ئەم کارە مەزنەیان گرتەبەر تاکو راستییان هێنایەدی. ئینجا کەوتنە بیرو لێکۆڵینەوەی ئەوەی کە چۆن ئەم مادەیە (پەنسلین) پاکژێنن .

پاش ئەوەی کە لەسەر تەبایەکی ئەزمونیدا ئەم مادەیان تاقیکردەوە، لەساڵی ۱۹٤٥ زیشدا بەسەر مرۆڤێکی نەخۆشدا تاقیکرایەوە. دەرکەوت کە ئەم کارە ئەنجامێکی زۆر چاكو کاریگەر دەهێنێتەدی.

پاش ئەم دەسکەوتە مەزنە دەسبەجێ کۆمپانیا دەرمانسازەکانی بەرتیانیا و ئەمەریکا هاتنەکایەوە و هەر بەخێرایی کەوتنە دۆزینەوەی رێکارێك بۆ بەرهەم هێنانی بەرادەیەکی زۆر.. بەلاّم لەساڵی ۱۹٤٤ زدا بەتەواوی بەکارهێنانی کەوتە بازارەکانی بەریتانیاو ئەمەریکاوە. کاتی کە جەنگیش کۆتایی پیێهات لە ساڵی ۱۹٤٥ ز ئیتر سەرانسەر بەجیهاندا بڵاوبووەوە.

هەرچەندە دۆزینەوەی پەنسلین هاندەرێك بوو بۆ بایەخدانو وێڵبوون بۆدۆزینەوەی دەرمانی سەیرتر بۆ بنبڕکردنی چەندین میکرۆبی تر بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا پەنسلین هەر بەکاریگرترین دەرمانی میکرۆب کوژ دادەنرێت لەبەرئەوەی کە لە هەموویان زیاتر بەفراوانی بەکاردەهێنرێت.

یەکێ لەو هۆیانەی کەپتر برەوی‌دا بە پەنسلین ئەوەیە کە زۆر بەکارو چالاکە لەدژی پۆلێکی زۆر لە زنیدە میکرۆسپیە زیانبەخشەکان. بونموونە... بەکاردەهێنرێت بۆتیمارکردنی نەخۆشی فەرەنگی Syphilis، سووزەنەك gonorrhea، سوورەگرانەتا Scarlatina، خروزەك Diphtheria، هەروەها بەکاردەهێنرێت بۆ نەخۆشی گەشکە Meningitis، جومگاوسان (ئاوسانی جومگە) Arthritis، پەمینی ئێسك Osteitis، بیین‌سووتانەوە Bronchopneumonitis، خوێن‌ژەهراوی‌بوون Blood Venenation، دومەڵ Furuncle سنگ‌خێزان (پزو) Pnemonia، گانگرین Gangrene، چەندین نەخۆشی‌تر...

لەو سوودە گرنگانەی پەنسلین ئەوەیە کە توانایەکی یەجگار فراوانی هەیە لە سارێژکردنی نەخۆش گەر ۰۰۰ر۵۰ یەکەیەکی C.C بدرێتێ. خۆهەتاکو ۱۰۰ ملیۆن یەکەیش لەرۆژێکدا هەر ئەنجامێکی زۆر باش دەدات، هەرچەندە کەم کەس هەیە سەوایی Allergy پەنسلینی هەبێت بەڵام زوربەی کەس زۆر بە سەرکەوتوویی بەکاری‌دەهێنن وە تەندروستیشیان زۆر بەرەو چاکی دەچێت. لەبە رئەوەی کە پەنسلین

بووە سەرفەرازی ملیۆنان کەس لە چەندین نەخۆشی... ئەوەندەی تر شکۆمەندی دا بەفلێمنگ. بێگومان زانایان (فلۆری و تشین) یش شایانی ئەو شکۆمەندییەن، بەڵام بەهەرچۆنبێت شایستەی ئەو کارە مەزنە هەر دەگەڕێتەوە بۆ فلێمنگ چونکە ئەگەر ئەو نەبووایە لەوانەبوو چەندین ساڵیتری بوویستایە بۆ دۆزینەوەی ئەو مادەیە.

فلێمنگ ژیانێکی زۆر خۆشبەختو کامەرانی لەگەڵ خێزانەکەیدا گوزەران کرد لە ساڵی ١٩٤٥ زدا خەڵاتی نۆبڵی پێدرا بەهاوبەشی لەگەڵ فلۆریوتشین، لە ساڵی ١٩٥٥ زدا کۆچی دوایی‌کردو منداڵێکی لەپاش بەجێما.



# سیمۆن بۆلیڤار...

١٧٨٣ ز - ١٨٣٠ ز

**Simon Bolivar**

زۆر جار سیمۆن بۆلیڤار... ناودەبرێت بەجۆرج واشنگتۆنی ئەمەریکای باشوور لەبەر ئەو دۆخە کاریگەرەی کە گێرای لەسەربەخۆیی پێنج وولاتی ئەمەریکایی لەژێر دەسەلاتی ئەسپانیا کەبرێتی‌بوون لە (کۆلۆمبیا، ڤەنزوێلا، ئەکوادۆر، پیرۆ، بۆلیڤیا). کەم گوردی سیاسی وەك سیمۆن بۆلیڤار توانیویەتی کارێکی بالای وابگێرێت لەسەرانسەری کیشوەرێکدا.

بۆلیڤار سالی ١٧٨٣ ز لەکاراکاس - ڤەنزوێلا... لەبنەمالەیەکی ئەرستۆکراتی ئەسپان‌نەژاد لەدایك‌بووە، لەتەمەنی ٩ سالاندا بە هەتیوی مایەوە. لەتەمەنی لاوێتیدا زۆر وولاتانی ئەوروپا گەڕاو ئەو بیرە

ئارمانانەی کردە ڕێبازی تایبەتی خۆی کە لە بزوتنەوەی ڕۆشنبیری فەلسەفەی فەڕەنسایدا بەدی‌دەکرا لەسەدەی هەژدەم. ئەوبیرمەند و فەیلەسوفانەیش کە بۆلیڤار کارنامەکانیانی دەخوێندەوەو سەودایان بوو بوو جان‌لوك، جان‌جاك ڕۆسۆ، ڤۆڵتێر، مۆنتیسکیۆ... بوون.

لەو گەشتەیدا کاتێك کە لە ڕۆما بوو سالی ١٨٠٥ ز لەسەر گردی (لاڤنتین) دا تەوس ئەیبردەوە... بەڵێنی بەخۆیدا کە لە ژیانیدا هەرگیز نەسرەوێت‌و خۆشی نەبینێت تاکو سەربەخۆیی وولاتەکەی لەجەوروستەمی ئەسپانیا نەسەنێت.

لەساڵی ١٨٠٨ زدا ناپۆلیۆن هێرشی بردەسەر ئەسپانیاو یەکێ لە براکانی‌کردە فەرمانڕەوای ئەسپانیا، ئەم کارە هەل‌و دەرفەتێکی چاکی ڕەخسان بۆ ئەو وولاتە ژێردەستانەی ئەمەریکای باشوور تاکو دەستی خۆیان بوەشێنن‌و سەربەخۆیی وەدەست‌بێنن.

سەرەتای شۆڕش دژ بە ئەسپانیا ساڵی ١٨١٠ ز لە ڤەنزویلاوە هەڵگیرسا. فەرمانڕەوا هێنرایە خوارەوەو ئالای سەربەخۆیی لەساڵی ١٨١١ ز هەڵکرا. هەر لەو ساڵەدا بۆلیڤار بووە ئەفسەرێك لە لەشکری شۆڕشگێری ڤەنزویلا بەلام لە ساڵی ئایندەدا تیپە سەربازییەکانی ئەسپانیا هاتنەوە بۆگەڕانەوەی دەسەلاتیان، ئەوەبوو توانییان جارێکی دی ڤەنزویلا داگیربکەنەوەو سەرکردەی شۆڕشی (فرانسیسکۆ میرانا) بگرن‌و بیخەنە زیندانەوە بۆلیڤاریش هەر ئەوەندەی توانی هەڵبێت‌و دووربکەوێتەوە لەووڵات.

لەو ساڵانەی دواییدا ڕەچە جەنگێکی کاریگەر بەرپابوو، ئەم جەنگ‌و ئاژاوەیە تا ساڵی ١٨١٩ ز درێژەی کێشا، لەو دەمەدا بۆلیڤار خۆی گورج‌کردەوەو سەرگوردی سوپایەکی بچوکی کرد، کەوتە

چالاکی لەنێو دۆڵو بێشێکان هەتاکو چیا بڵندەکانی (ئاندس) یشی گرتەوە. ئەم بزوتنەوەیە بەرەبەرە ترسی خستە نێو ئۆردوە ئەسپانیەکان لە کۆڵۆمبیا. بۆ دواجار ڕیزەکانی خۆی گردکردەوەو هێرشو شالأوی بردەسەر تیپە سەربازییەکان تابەتەواوی جەنگێکی سەخت لە ئابی ١٨١٩ زدا ڕوویداو سەرکەوتنی بەدەستهێنا، پاشان ساڵی ١٨٢١ ز ڤەنزوێلای ئازادکرد، ئینجا لە ساڵی ١٨٢٢ زیشدا ئەکوادۆر ئازادکرا.

هەر لەو دەمەیشدا (جۆس دی سان مارتین) کە مەردێکی نیشتمان پەروەربوو توانی ئەرجەنتینو شیلی لە جەوروستەمی ئەسپانی ڕزگار بکات، داینابوو کە پیرۆیش ڕزگار بکات، بۆ ئەم مەبەستە هەردوو ئازادیخواز لەشاری (جوایاکیل) ی ئەکوادۆر لە هەینی ١٨٢٢ زدا بە یەكگەیشتن بەلأم نەیانتوانی ڕێك بکەون لەسەر چۆنیەتی هاریکاری و گەلەکۆمەکردنو ڕێکخستنی شیرازەی بڕستو توانایان لە دژی ئەسپانیا. ئەنجامی ناکۆکییان گەیشتە ڕکوکینەو هەڵگیرساندنی جەنگ لەنێوانیاندا بەلأم ئەوەندەی نەخایاند هەستی بەوەکرد کە ئەو ناکۆکییە لە بەرژەوەندی ئەسپانیادایە لەبەرئەوە خۆی کشانەوەو وازی لەسەرکردایەتی هێناو بەتەواویش دەسبەرداری ئەمەریکای باشووربوو.

لە ساڵی ١٨٢٤ زدا سوپاکانی بۆلیڤار وولأتی پیرۆی ئێستایان ڕزگارکرد، ساڵی ١٨٢٥ ز هێزەکانی ئەسپانیای ڕاشکاندو توانییان پیرۆی سەرویش (پۆلیڤیای ئێستا) ڕزگار بکەن. هەرچەندە ساڵأنی دوا ژیانی بۆلیڤار بەرەو ئاوابوون دەچوو بەڵام هەر بەئومێدی یەکگرتنی وولأتەکانی باشورەوە بوو هەروەك وولأتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

لەڕاستیدا ڤەنزوێلا، کۆڵۆمبیاو ئەکوادۆر کۆمارێکی یەکگرتوویان پێکەوەناو بۆلیڤاریش بووە سەرەك کۆمار بەلأم لەبەدبەختی.. ئەو هێزە

چەواشانەی کە لە ئەمەریکای باشووردا جموجوڵیان هەبوو بەهێزتربوون لەو ناوچە داگیرکراوانەی باکوور کە لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا بوون. لە ساڵی ١٨٢٦ زدا کاتێك بانگەوازی کۆنگرە بەستنی بلاوکردەوە لە نێوان وولاتەکانی ئەمەریکای لاتینی تەنها چوار وولاتو یانکی ئامادەبوون، لەباتی ئەوەی یەکانگیریو چوینەکی سازبێتو وولاتە نوێکان بێنە ژێر ئالاّی کۆماری کۆلۆمبیای گەورەوە. کەچی ئەو کۆمارە بەرەبەرە پووکایەوەو گەیشتە ئەو رادەیەی جەنگی میللی بەرپاببێت. لە ساڵی ١٨٣٠ زدا ڤەنزوێلا و ئەکوادۆر لە کۆماری گەورەکشانەوە، لەو گێرمەو کێشەیەیشدا چەند جار هەوڵی کوشتنی بۆلیڤار درا. ئەمیش کە زانی بۆتە کۆسپو تەگەرە لەرێی ئاشتیدا وازی لەهەموو کارێکی هێنا. هەر لە ساڵی ١٨٣٠ زدا بەتەواوی لەباری سیاسی خۆی دوورخستەوە، هەر لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵیشدا بە ژیانێکی هەژاریو زۆرنائومێدو دوورلە وولات (ڤەنزوێلا) ئەسپەردەی خاك‌کرا.

بۆلیڤار مەردێکی زۆر پێشبین و چوست و پێشکەوتووخواز بوو. لەبەر پێویستی ئەو سەردەمەی ناچاربوو دیکتاتۆرانە رەفتار بکات بەلاّم کاتێك کاروباری گەیشتە رادەی تاقیکردنەوە و هێنانەدی ئامانجی بزوتنەوەکەی وازی لەو رێرەوە هێنا و ئارەزووی خۆی دامرکاندەوە بۆ بەرژەوەندی گشتی و دیموکراسی نموونەیی، هەر لەدواییشدا بە یەجگاری وازی لەهەموو دەسەڵاتە دیکتاتۆریەکانی هێنا هەتاوەکو جارێکیش پێشنیاری پاشایەتیان لێکرد بەلاّم پەسەندی نەکرد، هەستی بەوە دەکرد کە نیشانەی (ئازادیخواز) زۆر مەزنتر و شایستەترە لەتەختی پاشایی.



# ئۆلیڤەر کرۆموێڵ...

**١٥٩٩ز – ١٦٥٨ز**

**oliver cromwell**

ئۆلیڤەر کرۆموێڵ... ئەو سوپاسالارە هەڵکەوتوە بوو کە سوپا کانی پەرلەمانی بەرەو سەرکەوتن برد لە جەنگە ناوخۆییەکانی ئینگلیزیدا. بەیەکەمین دامەزرێنەری رژێمی پەرلەمانی دیموکراسی دادەنرێت لە دەوڵەتی ئینگلیزیدا. ساڵی ١٥٩٩ز لە شاری (هانتنگدون) ی ئینگلترەدا لەدایك‌بووە.

لەسەردەمی لاوێتی‌دا ستێزەو فرەبەرەکی ئایینی... ئینگلتەرەی لاوازکردبوو. پاشایەکیش لەو سەردەمەدا فەرمانرانی دەکرد هەر باوەڕی بەئارەزو و نیاز و ویستی خۆیی هەبوو. (کرۆموێل) یش وەك کشتیارو پیاوێکی گوندەکی... خاوەن ڕێبازگەیەکی ئایین

.بیوریتانی بەپەرۆش گوزەرانی دەکرد (بیوریتان تیپێکی ئایینی پرۆتستانتی پەرگرە) ، لە ساڵی ١٦٢٨ زدا بووە ئەندام لە پەرلەماند بەلاّم بۆ ماوەیەکی کەم چونکە لە ساڵی دواییدا شارل شای یەکەم هەر بە ئارەزووی بڕیاریدا بە بلاّوەپێکردنی پەرلەمان تاکو خۆی بە تەنہ فەرمانڕانی وولاّت بکات .

ئیتر پاشا داوای پێکهێنانی پەرلەمانێکی تری نەکردەوە هەتا ئەو دەمەی کە پێویستی پوولّو دەرامەت بوو بۆ بەکارهێنانی لە جەنگی دژ بە سکۆتلەندەکان ، بەلاّم ئەم جارەیان کە پەڕلەمان کاری کاریگرتە دەست بە توندی داوایان لە پاشا کرد کە واز لە سەلاّتی ستەمکاری بهێنێت ، بەلاّم پاشا ئامادە نەبوو ئەو داخوازییانەی پەڕلەمان جێبەجێ بکات لە لەبەر بووە ناکۆکیو جەنگ لە ساڵی ١٦٤٢ زدا لە نێوانی سوپاکانی سەر بە پاشاو سوپاکانی سەر بە پەڕلەمان ، (کرۆموێلّ) یش سەر کە بە بەرەی پەرلەمان بوو گەڕایەوە بۆ زادگەی خۆی (هانتنگدون) و تیپێکی لەوەندی پێکەوەنا بۆ شەڕ لە دژی پاشا .

لەو ماوەی شەڕەدا کە چوار ساڵی خایاند کرۆمویلّ توانی هێزو لێهاتوویی سەربازی خۆی دەربخات ، پەڕلەمانیش باوەری ئەواوپێکرد پاش ئەوەی دووکارزاری بردەوە یەکێکیان لە (مۆر) ساڵی ١٦٤٤ ز ، ئەوی تریان ساڵی ١٦٤٥ ز بوو لە (ناسپی)، لەمەی دواییەیاندا پاشای ئەواو بەزاندو هێزەکانی تێکشکاندو پاشای بە دیل گرت ، خوێشی بووە سەرداری سەرانسەر ئینگلتەرە.

بە کۆتایی ئەم جەنگە ناوخۆییانە وەنەبێت ئاشتی بەدەمەوە بێتو سەرانسەری وولاّت ئاسایشی تیّبکەوێت چونکە ئەندامانی پەڕلەمان لە نێوان خۆیاندا بووبوونە چەند دەستەیەکی دژوار لە هێنانەدی

ئامانجیاندا . ئەم ناکۆکییە هەل‌و دەرفەتێکی بۆ پاشا ڕەخساندەوە بۆ هەڵگیرساندنی چەنگێکی ناوخۆیی‌تر. هەر لە ماوەی ساڵێکرا پاشا توانی ڕابکات‌و سوپاکانی کۆبکاتەوە ئاگری جەنگ هەڵبگیرسێنێتەوە . بەڵام (کرۆمویڵ) ی یارا بەزەبرو خۆڕاگرتن جارێکی‌تر توانی ڕایانشکێنێتەوەو پاشا بە دیل بگرێتەوەو بیداتە دەست دادگا . لە کانوونی دووەمی ١٦٤٩ زاد فەرمان‌درا بە سێدارەدانی پاشا، ئینگلتەرەیش بووە ڕژێمی کۆماری‌و ئەنجومەنێکی کاتی‌ی بە سەرۆکایەتی کرۆمویڵ سازکرا ، بەلام شادۆستەکان دیسان دەسەڵاتیان لە ئیرلەندەو سکۆتلەندەوە گردکردەوەو بوونە پاڵپشتی کوڕی شارل شای یەکەم (کوژراو) کە لەدواییدا نازناوی شارڵی دووەمی درایە . ئەنجامی ئەو ستێزەو بەربەرەکانیە بە شالاوێکی سەرکەوتووانەی کرۆمویڵ کۆتایی هات ، لە ساڵی ١٦٥٢ زدا بە تەواوی کۆتای بە جەنگی (گەل) ی هات‌و شادۆستەکان تەفروتوونا بوون . ئیتر کاتی ئەوە هاتە پێشەوە کە شیرازەی دەسەلاتی نوێ بگیرێتەوە، بەلام شێوەی دارشتنی دە ستوور بووە کێشەیەك بۆ ئەم ڕژێمە تەنانەت بە درێژای دەسەلاتی کرۆمویڵیش هەروا مایەوە ، ئەو سەرکردە سالارە بیوریتانییە بەو هەموو دەسەلات‌و زرنگ‌و لێهاتووییەوە نەیتوانی ئەو ناکۆکییە لە نێوان لایەنگیرانیدا چارەسەر بکات‌و بە هەرەوەزی دەستووری نوێ بخەنە گەڕ لە کاروباری ڕژێمی نوێدا ، هەر ئەم ناکۆکییەیش... بووە پەیدابوونی کێشەو مشت‌و مڕ لە نێوان پرۆتستانتەکانو دامەزراندنی چەند بەرەیەکی جیاوازو دژوار لە ڕێچکەیاندا هەروەك لە کەنشتەی کاثۆلیکدا بەدی دەکرێت .

کرۆمویڵ لە ژیانیدا سێ‌جار پەرلەمانی لە کارخست ، لە ساڵی

١٦٥٣ زوه تا ١٦٥٨ ز دەسەڵاتی ئینگلتەری گرتبووە دەست : هەر لەو دەمەیشدا رژێمی فەرمانڕانیی زۆر بە باشیو ڕیکوپێکی بەرێوە دەبرا زۆر لە قانونە نارەواکانی ڕاستکردەوەو دەسکاری کرد . زۆر بە گرنگییەوە بایەخی بە خوێندنو ڕۆشنبیری ئەدا .

گرنگی کرۆموێلّ لەوەدا خۆی دەنێنێت کە زۆر بە تەنگ رژێمی دیموکراسییەوە دەهات و زۆر بە توندی بەرگری لێدەکرو . چەند جار داوای ئەوەیان لێدەکرد کە دەسەڵاتێکی شانشینی دابنێت هەروەکو چۆن لە سەرانسەری ئەورپادا دەسەڵاتی مۆنارشی[1] تیایدا باو بوو . بەڵام کرۆموێلّ پەسەندی نەدەکرد . هەر ئەو دیموکراسییەی (کرۆموێلّ) یش بوو کە کارێکی سەرەکی کردە سەر وەڕار[2] و تیگەیاندنی بزوتنەوەی ڕۆشنکەرەوەی فەلسەفی لە سەدەی هەژدەمدا ، داکوتانی رەگی ئەو رژێمەیش لە شۆرشی فەرەنسایی... هەر دوابەدوای ئەویش وولاتە دیموکراسییەکان لە ئەورووپای رۆژاوادا ، ئاشکرایش کە سەرکەوتنی ئەو هێزە دیموکراسیانەی ئینگلتەرە دۆخێکی یەجگار باڵاو بڕێوی گێرا لە دامەزراندنی رژێمی دیموکراسی لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئەو وولاتانەی کە لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بوون.

---

(١) مونارشی : Monarchi واتە دەسەلاتی تاکرەوی

(٢) وەڕار : گەشاندن

# جۆن لۆك.....

١٦٣٢ ز - ١٧٠٤ ز

John Locke

جۆن لۆك ئەو كەڵەنووسەرە بوو كە بیرە سەرەكییەكانی دیموكراسیی دەستووری لە نووسینەكانیدا كۆكردەوە . ئەو بیرانەی كە كاریگەریك بوون بۆ سەر دامەزرێنەرانی رژێمی وولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكاو بۆسەر زوربەی فەیلەسوفەكانی بزوتنەوی رۆشنبیری فەرەنسایی لە سەدەی هەژدەمدا .

جۆن لۆك سالی ١٦٣٢ ز لەشاری رنگتون - ئینگلتەرە لە دایك بووە. خوێندنو رۆشنبیری لە زانكۆی ئۆكسفۆردا وەرگرت ، لە تەمەنی لاوێتیدا زۆر خولیای زانستەكان بوو و زۆریش بە گرنگییەوە بایەخی پێدەدا . لە تەمەنی ٣٦ سالیدا بە ئەندام هەڵبژێرا لە چفاتی شاهانە ، هەر لەویێش دۆستایەتی پەیداكرد لەگەڵ ئیسحاق نیوتن .

گۆرانی باری ژیانی جۆن لۆك لەوكاتەوە دەست پێدەكات كە خۆی ناساند بە (ئایرڵ شافتیبێری) كە بیرمەندێكی ئازادیخواز بوو . بە هۆی چالاكیە سیاسیە ئازادییەكانیەوە تووشی چەندین ئازارو چەوسانەوە بوو تا گەیشتە ئەوەی كە شارڵ شای دووەم بیخاتە زیندانەوە ، دوای

هەڵات بۆ هۆڵەندە ، جۆن‌لۆکیش کە داوی ئەو ڕێبازەی کەوبتوو دەسبەجێ بەدوایدا چوو بۆلای لە هۆڵەندە .

ئەو نووسراوەی کە بووە هۆی ناوبانگی جۆن‌لۆك... (ووتارێك دەربارەی چەمکی مرۆڤانە) بوو کە لەسەر ڕەچەڵەك‌و سروشت‌و سنووری زانیاری پسات دەدوێت . ئەو تیروانینانەی کە هەیەتی زیاتر لەسەر ڕاهێنانێکی ڕاست‌و ڕەوانە ، بە ئاشکرایش کاریگەری فرانسیس باکۆن‌و دیکارت لە بیروراکانیدا دیارە . هەر لەمیشەوەرا زۆر لە بیرمەندان ڕێبازی جۆن لۆکیان گرتەبەر و پەیرەوییات دەکرد وەك جۆرج بێرکلێ ، داڤید هیوم ، عەمانوێل کانت . هەر چەندە ئەو نووسراوەی بە نەرێترین نووسراوی جۆن لۆك دادەنریت‌و بەگرنگترین پەڕاوی فەلسەفە کلاسیکیەکان دەژمێررێت بەڵام ئەوەندەی پەڕاوە سیاسیەکانی کارێکی بالأی ئەوتۆی نەگێڕا لە گۆڕانکاریە مێژوویەکاندا .

لەیەکێ لە پەڕاوەکانی تریدا بەناوی (پەیامێك لەبارەی سیاسەتی لێخۆشبونی ئاینیەوە) کە زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی دەوڵەت نابێت دەست بژنێتە کاروباری نەرێتە ئاینیەکانەوە ، جا سوور بوونی لەسەر ئەم بیروڕایانەی زۆر کاریکردە سەر ئاوەزو هۆشی مەردوم . بەرەبەرە پەرەیسەندو بلأوبووەوە بە ڕادەیەکی وا کە تەشەنەی کردە نێو نادیانەکانیشەوە . هەروەکو جارێك دەیووت نابێت موسوڵمان‌و جوولەکەو بتپەرستان ئاوارتە بکرێن لە مافە شارستانیەکانیان بە هۆی

ڕێبازگەیانەوە. بەڵام کاثۆلیکەکانی لەمان ئاوارتە تر کرد ئەویش لەبەرئەوەی کە ئەمان پەیڕەوی دەسەڵاتێکی بیگانە دەکەن (واتەپاپا)، هەروەها بێ‌خواکانیشی ئاوارتە کرد.

مەزنیو بەپێزی نووسینەکانی زیاتر لە لێخۆش‌بوونی ئایینیدا دەردەکەوێت تەنانەت زۆر لەو کۆمەڵگایانەی کە ئاوارتەیش کرابوون (بە گوێرەی جۆن لۆك) هەر پەیڕەوییان دەکرد.

ئەو دوو ووتاریەیشی دەربارەی (میری) کە لە ساڵی ١٦٨٩ زدا بەدەرکەوت بیرورا سەرەکیە شاراوەکانی دەخاتە ڕوو کە لە پاڵ دیموکراسییەکی دەستووری‌ی سەربەستدا خۆی دەنواند. ئەو بیروڕایانەی کارێکی زۆر مەزن‌و قووڵی هەبوو بۆسەر مەردوم. هەروەکو دەری دەخات کە مەردوم نەك هەر تەنها مافی ژیانی هەیە کە یەکێکە لەو مافە سروشتیانەی خۆی، بەڵکو سەربەستی خۆیی‌و سەربەستی موڵکداریشی هەیە، سەرەرای ئەوەیش کە دووپاتی دەکردەوە دەوڵەت بایەتە سەربەستی‌و سامانی هاووڵاتیان بپارێزێت‌و بە هەموو جۆرێك پشتگیرییان بکات.

لۆك (مافی خوایی پاشا) پشی لا پەسەند نەبوو کە ئەودەمە زۆر لە ئەورپادا باو بوو. داوای ئەوەی دەکرد کە ئەو فرمانڕەوایانە بە ئارەزوو خوایشتی گەل دەسەڵات بگرنە دەست، هەروەها بڕوای بە جیاجیایی

دەسەڵات نەبوو لە دەوڵەتدا . لەو بڕوایەدا بوو کە دەسەڵاتی یاسادانان دەبێت باڵاتر بێت لە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن وە باڵاتریش بێت لە دەسەڵاتی دادوەری (کە دایناوبوو بە بەشێك لە دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن)، لەبەر ئەوە بەرەنگاری دادگاکان ڕادەوەستا کە نابێت مافی بیانوو گرتنیان هەبێت لەسەر ئەو قانونە ڕەوایانەی کە دەسەڵاتی یاسادانان دایدەنێت . ئەم کارەی بە کارێکی نادەستووری ناڕەوا دادەنا .

جۆن لۆك بەو بیرورا مەزنە کاریگەرانەی بۆسەر مەردوم بە تایبەتی بۆسەر شۆڕشی ئەمەریکایی و دامەزرێنەرانی وەك جیفەرسۆن بەر لە سەدەیەك، هەروەها بۆسەر بیرمەندانی فەرەنسایی بەر لە بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسا ... توانی جێی خۆی بکاتەوە و هەرگیز لەیاد نەچێت .



# میکایل ئەنجیلۆ...

١٤٧٥ ز - ١٥٦٤ ز

Michel Angelo

هونەرمەندی چەرخی ڕاپەڕین میکایل ئەنجلۆی مەزن... بە مەرذێکی هەڵکەوتوو دادەنرێت لە مێژووی هونەرە بینراوەکاندا . نیگاکێشێکی زەیتی ،... پەیکەرتاش ،... ئەندازیارێکی ساختمانی ی واڵاکار بووە .

ئەو کارە نایابانەی کە بۆی بەجێی هێشتووین بەرادەیەك ئەوەندە مەزنە کە زیاتر لە چوارسەدە یەك دەبێت کاری کردۆتە سەر بینەران ، دوخێکی زۆر کاریگەری هەبووە لە پەرەپێدانی هونەری نیگارکێشان و پەیکەرتاشین لە سەرانسەری ئەوروپادا . ئەم هونەرمەندە مەزنە ساڵی

١٤٧٥ ز له شاری (کاربیس) له ئیتالیا ... له دایك بووه که نزیکەی ٤٠ میل له فلۆرەنساوه دووره . بلیمەتیو بەهرەیی هەر له یەرانی تەمەنیدا دەرکەوتووه ، له تەمەنی ١٣ ساڵیدا بووه شاگرد لای هونەرمەندی نیگارکێشی بەناوبانگ (جیرلاندایۆ) له فلۆرەنسا. له تەمەنی ١٥ ساڵیدا (لۆرەنزۆ) ی میری فلۆرەنسا هێنایه کۆشكو له نێو بنەماڵەکەیدا دانیاو گوزەرانی دەکرد. ئیتر هەر لەوێ مایەوه و زۆر به نازەوه خزمەتیشەوەو دڵنەوایی دەکرا . زوربەی ڕۆژانی بەهاتوچۆی رۆماو فلۆرەنسا دەبردە سەر. بەرەبەره ناوی کەوته ناوانەوه تا وای لێهات پاپاو میرو دەسەڵاتدارەکان داوایان لیدەکرد بۆ نەخشاندنی کاره هونەرییەکانی .

ئائەم چەشنەو به رەبەنی ژیانی گوزەران دەکرد تا له شاری رۆمە کۆچی دوایی کرد بەر لەوەی مۆمی هەشتاو نۆساڵەی به کەمێك هەڵبکات .

هەرچەنده میکایڵ ئەنجلۆ زۆر باڵاو هەڵکەوتوو بوو، بەلام نەدەگەیشته پایەو هونەری لیۆنارد داڤنشی که ئەویش یەکێك بوو لەو کەلەهونەرمەندانەی ئەو سەردەمەو هاوچەرخی میکایڵ ئەنجلۆ بەلام به تەمەن گەورەتر.

فرەهونەرییەکانی میکایڵ گەیشتبووه رادەیەك که سەرنج راکێشتربێت له لیۆنارد داڤنشی چونکه تاکه هونەرمەندیك بوو که گەیشتبووه ئەوپەری بەرزی له چەند بوارێکی هەمه جۆردا . گەر رەچاوێکی کاره مەزنەکانی بکەین بۆمان دەردەکەوێت که له نیگاری زەیتیدا لەوپەری بڵندیدا پۆلێنراوه ئەویش لەبەر جۆرو به پێزی کاره نەمرەکانیو رەنگدانەوەی بۆسەر هونەرمەندانی دوای خۆی . ئەو

کۆمەڵە گەچ نیگارییانەی کە لەسەر دیوارەکانو بنمیچەکانی (کە ناسراوە بە فریسکۆ) کە نشتەی (سیستین) دا لە روما کردوویەتی بە یەکی لە مەزنترین دەسکەوتە هونەرییەکانی گشت سەردەمێك دادەنرێت . لەگەڵ ئەمانەیشدا پەیکەرتاشێکی زۆر لێهاتوو بووە، زۆر لە رەخنەگرانی هونەر بە مەزنترین پەیکەرتاشی دادەنێن تا ئێستا ، ئەو پەیکەرانەی داودو موساو (بیتا) ی بە ناوبانگ لە فاتیکان بەڵگەیەکن بۆ مەزنی ئەم هونەرمەندە بێهاوتایە .

میکایێل ئەنجلۆ بە ئەندازیارێکی ساختمانیش دەناسرێت ، لەو دەسکەوتە مەزنانەی لە ساختماندازییدا (ئەندازەی ساختمانی ی)[1] نەخشاندنی کەنشتە بەناوبانگەکەی (ئال مەدیشی) یە لە فلۆرەنسا، چەند ساڵێکیش مایەوە بە ئەندازایارێکی کارا لە نەخشاندنی کەنشتەی قەشە پەترۆس لە رۆما .

هەروەها بە هۆزان نووسێکی ناسکی بەزر دادەنرێت ، لە ژیانیدا چەندین چامەی داناوە ، ئەوەی کە پێان گەیشتێ خۆی دەدا لە نزیکەی ٣٠٠ چامە ، هێندێکی تری هەروا بە بلاونەکرایەوەیی مایەوە تاپاش مردنی، ئەو هۆنراوانەی وای دەردەخەن کە شاعیرێکی باڵای بەهرەداریش بوویێت .

---

(١)ساختماندازیی : هندسەی معاري .

# پاپا ئەربانی دووەم...

١٠٤٢ ز - ١٠٩٩ ز

**Pope Urban II**

کەم کەس هەیە پاپا ئەربانی دووەمی بیستبێت لەگەڵ ئەوەیشدا کەم کەس هەیە ئەوەندەی ئەو کاریگەر بووبێت بۆ سەر مێژووی مەردووم . چونکە هەر ئەوبوو کە بانگەوازی جەنگی خاچەکانی Crusades لە نێو جیهانی دیاندا بلاوکردەوە بۆ ڕزگارکردنی گۆڕی عیسا .

پاپا ئەربان ساڵی ١٠٤٢ ز لە نزیك شاری (تشایلون سەرمارن) لە فەڕەنسا لەدایك بووە ، لە بنەماڵەیەکی خانەدانو ناودارانی فەڕەنسا هاتۆتە خوارەوە . بەشێکی زۆری لە خوێندنو ڕۆشنبیری وەرگرتووە . بەرلەوەی بە پاپا هەڵبژێرڕێت لە ڕۆما ساڵی ١٠٨٨ ز بۆ ماوەیەك کاردینال بووە .

پاپا مەردێکی بەیاراو کاریگەرو سیاسیمەند بوو ، جا وەنەبێت پلەی پاپاێی بووبێتە هۆو ڕێخوشکەرێك بۆ ئەوەی بخرێتە ڕیزی ئەو سەد کەسانەوە بەڵکو ئەو کارە گرنگانەی کە گێڕای لە هاژاندنی گەلو کۆمەڵدا .

سەرەتای دەست پێکردنی لە کۆڕێکی کەنشتەدا بوو کە لە شاری (کلێرمۆنتی) فەرەنسایی گێرای لە ٢٧ ی تشرینی دووەمی ١٠٩٥ زدا . ئەویش بەرامبەر بە هەزاران کەس ووتارێکی خوێندەوە ، گڕو سۆزێکی وەهای خستە ناویانەوە کە بۆ چەند نەوەیەکی تری دوای خۆیشی هەر کاریگەر بێت .

لەو سوخەنرانەیدا هاواری دەکرد تورکە سەلجوقییەکان خاکی پیرۆزیان پێشێل کردووەو شوێنەوارە پیرۆزەکانی دیانیان کردۆتە وێرانە ، تەنگ بە دیانەکان هەڵدەچنن‌و شەڕیان پێدەفرۆشن . بەم ڕەفتارو شێوازە... هانی هەموو جیهانی دیانی ئەدا کە بەشداری بکەن لەو جەنگە پیرۆزە، واتە بە هەڵمەتی خاچی‌ی نەبێت خاکی پیرۆز هەرگیز ڕزگار ناکرێت‌و ناگەڕێتەوە دەست دیانان . بەلام پاپا ئەربان کە زۆر زارا[1] و زرنگ بوو لە بانگەوازەکەیدا هەر تەنها لایەنە ئایینییەکەی نەگرتبوو بەڵکو هاواری ئەوەیشی دەکرد کە خاکی پیرۆز زۆر زەنوێرو بە پیت‌و سامانە ، بگرە زۆر لەو خاکە پڕ لە دانیشتوانانەی ئەوروپا بە سامانترە . ئینجا لە دواییدا ئاشکرای کرد کە ئەوەی بەشداری لە جەنگی خاچەکان بکات ئەوا ئەو جەنگە دەبێتە بالاً گەردانیوو پۆشاکێك بۆ ئەو گوناهانەی کە کردویەتی . ئابەم جۆرە جەنگاوەرە خاچەکانی دڵنیا کرد لەوەی کە لە هەموو گوناهێکیان پاك دەبنەوەو خودای مەزنیش دەیانبەخشێت .

پاپا بەو ووتارەی خرۆش‌و بزێوی خستە نێو گەلەوە، بە ڕادەیەك

هێشتا لە ووتارەکەی نەبووبووەوە هەموو بەیەك دەنگ هاواریان دەکرد کە (ئەمە فەرمایشتو ئارەزووی خودایە). هەربەو بانگەوازو هاوارە دەسبەجێ دەنگی زوڵاڵی جەنگی خاچ بڵند بووەوە . هەر ئەوەندەیشی نەبرد کە لە ماوەی چەند مانگێکرا جەنگاوەران ئامادەکرانو هێرشیان خۆشکردو بەرەو جەنگ بەرێ کران . لەو جەنگە دوورو درێژەدا چەند هەڵمەتێکیان بە ئەنجامدا کە دەگەیشتە نزیکەی هەشت هەڵمەتی سەرەکیو چەندێکی لابەلاییش .

ساڵی ١٠٩٩ ز لە یەکەمین هەڵمەتی خاچەکاندا توانیان بارەگای پیرۆز داگیربکەنو بچنە ناویەوە بەر لە دوو هەفتەی سەرکەوتنیان پاپا ئەربان مردو ئەو مزگێنییەشی پێنەگەیشت .

لێرەدا گەر لەو جەنگە خاچانە بکۆڵینەوە سەیر دەکەین کە هەروەك جەنگەکانی تری مێژوو وایە لە کاری ڕاستەوخۆی بۆسەر بەشدارانو دانیشتووە شارییەکانو تووشبوونیان بەو جەنگانەوە .

بە هەر چۆن بێت بایەتە ئەوە بزانین کە جەنگی خاچەکان کارێکی باڵاو گرنگی گێڕا لە نزیکاندنو ئاشنایەتییەکی ڕاستەوخۆ بۆ ئەوروپای ڕۆژاوا لەگەڵ ژیاری بیزەنتیو ئیسلامی کە زۆر پێشکەوتوو تر بوون لە ئەوروپای ڕۆژاوای ئەو سەردەمە .
هەر ئەم نزیك بوونەوەیەیش بوو کە بووە هۆی چەلاندنو ڕاژەنینی

ڕاپەڕین لە ئەوروپادا کە لێوەیڕا بووە هۆی بوژانەوەو گوشادییەکی سەرانسەر لە ژیاری ئەوروپای نوێدا .

گەر ڕابیری خۆمان بکەینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە جەنگی خاچەکان هەرگیز نەدەبوو گەر وێزەو هاندانو پاڵهێزی پاپا ئەربانی دووەم نەبوایە ، هەر ئەو دەمەیش زۆر لە بارو گونجاو بوو بۆ پاپا چونکە ئەگەر ئیمپراتۆری ئەڵەمانیا ئەم کارەی بکردبایە لەوانەبوو هیچ کەسێك لە ئەوروپای ڕۆژاوادا دوای نەدەکەوت. جا تا کە مەردێکی بوێرو ئازا کە شیاوبوو بەم کارەگرنگە هەستێتو مەبەستەکەی سەرکەوتوانە بخاتەگەڕ بەنێو گشت پاشاو میرانی ئەوروپادا... پاپائەربانی دووەم بوو.

---

(١) زارا : ناطق

# عومەری کوڕی خەتاب (خ.ر)..

٥٨٦ ز - ٦٤٤ ز

**Omer Ibn khattab**

عومەری کوڕی خەتاب (خ . ر ) بە دووەمین خەلیفەی مەزن، دەشێت بە هەرە مەزنترین خەلیفەی ئیسلامیش دابنرێت ، هاوچەرخی پێغەمبەر (د . خ) بووەو کەمێکیش بە تەمەن لەو بچوکتر بووە . لە شاری مەککە لە دایك بووە . هەر چەندە تەواو ساڵی زایینی نازانرێت بەڵام ڕەنگبێت ساڵی ٥٨٦ ز لە دایك بووبێت .

عومەر (خ . ر ) لەسەرەتادا یەکێك بوو لە هەرە دوژمنە سەرسەختەکانی موحەممەد (د.خ) بەڵام لە پڕێکدا موسوڵمان بوو و بووە یەکێك لە پاڵپشتە بەهێزو دڵسۆزەکانی..

ساڵی ٦٣٢ ز ... کاتێك کە موحەممەد (د . خ) کۆچی دوایی کرد چ کەسێکی وا دەست نیشان نەکرا کە ببێتە جێگری ، بەڵام عومەر دەسبەجێ دەنگ‌و ویژەی خۆی دایە پاڵ ئەبو بەکر (خ . ل) (یەکێك بوو لە هەرە دڵسۆزەکان‌و حەزووری پێغەمبەر) کە هەڵبژێرێت بە خەلیفەی ئیسلام . ئەم هەڵبژاردنەی ئەبو بەکر ناکۆکی نێوان موسوڵمانانی دوورخستەوە، ئەمیش بە زرنگی‌و لێهاتوویی... خۆی

دەریخست کە شیاوی ئەوەیە کە ببێتە یەکەمین خەلیفەی ئیسلام بەڵام پاش دوو ساڵ کۆچی د وایی کرد ، پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات عومەری لە جێی خۆی دانا . هەر بەم چەشنەیش ناکۆکیو دووبەرەکی دوور خرایەوە لە نێو موسوڵمانانەدا .

ساڵی ٦٣٤ ز عومەر (خ . ل) بووە خەلیفەی ئیسلام تاکو ساڵی ٦٤٤ ز ، لەو دواساڵەدا کۆتایی بە ژیانی هات لە مەدینە بەدەستی کۆیلەیەکی فارسی . بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات شەش کەسی دانا کە لە نێو خۆیاندا یەکێك هەڵبژێرن بە خەلیفەی ئیسلام ، ئەو دەستەیەیش عوسمانی کوری عەففانیان بە سێهەمین خەلیفەی ئیسلام هەڵبژارد. ئەمیش لە ساڵی ٦٤٤ زوە تاکو ساڵی ٦٥٦ ز پیشەوایەتی ئیسلامی پێ سپێررا .

سەردەمی عومەر (خ . ل) گرنگترین رووداو لاپەرەکانی مێژووی ئیسلامی رازاندەوە ، هەر لە سەرەتایدا سوپاکانی ئیسلام چوونە فەڵەستینو سوریا (ئەو کاتە سوریا لەژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریتی بیزەنتیدا بوو) ، لە ساڵی ٦٣٦ زدا لە کارزاری یەرموك ئیسلامەکان جەنگیان بردەوە ، هەر لەو ساڵەیشدا دیمەشق کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیسلامەوە پاش دوو ساڵیش خانەگای پیرۆز. (بیت المقدس) کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیسلامەوە. لە ساڵی ٦٤١ ز سەرانسەری سوریاو فەڵەستین بەتەواوی کەوتە ژێر رکێفی ئیسلامەوە. ئینجا هێزیان بەرێ کرد بۆ ئەو وولاتەی کە ئێستا پێی دەڵێن تورکیا . ساڵی ٦٣٩ ز سوپای ئیسلام هێرشی بردە سەر میسر کە ئەمیش دیسان سەر بە ئیمپراتۆریتی بیزەنتی بوو . بە ماوەی سێ ساڵ سەرانسەری میسریان گرت .

هێرشی ئیسلام بەرە وعێراق دەستی پێکرد ، کە ئەمیش بەشێك

بوو لە ئیمپراتۆریێتی ساسانی، جەنگێکی سەخت ڕوویدا لە نێوان سوپاکانی ئیسلام‌و ساسانیەکان لە کارزاری قادسیەدا .

بەر لە ساڵی ٦٤١ ز سوپاکانی ئیسلام سەر کەوتوانە جەنگیان بردەوەو عێراقیش بە تەواوی کەوتە ژێر دەسەڵاتیانەوە .

وەنەبێت ئیسلامەکان ئیتر پاڵیان لێ‌دابێتەوەو وەستابێتن. بەڵکو سوپایان بەرێ کرد بەرەو وولاتی فارس ، هەردوو سوپا لە کارزاری (نەهاوەن) دا بەرەنگاری یەکتر وەستان ، ئەنجامی جەنگەکە بە سەرکەوتنی ئیسلام کۆتایی هات ، هێزە فارسیەکان سەرتاپا شکستیان هێنا ، لە ساڵی ٦٤٢ زدا بە تەواوی تەخت وتاراجیان ڕوخێنرا . لە نزیك کۆچی دواییدا بوو کە بە تەواوی هێزەکانی ئێرانی باختەری بەزین‌و کەوتنە ژێر دەسەلاتی ئیسلامەوە. جاوەنەبێت بە نەمانی عومەر (خ . ل) گوڕ و تەوژمی ئیسلام ساردبوبێتەوە بەڵکو لە پاش کۆچی دواییشیدا ئێرانیان سەرانسەر گرت ، لەلایەکی تریشەوە سوپایان بەرەو باکووری ئەفەریقا بەرێکرد .

گرنگی و مەزنی عومەر لە بەردەوامی‌ی کارەکانیدا خۆی دەنوێنێت ، بەرادەیەکی وا کە تاکو ئێستا شوێنەواری دیارە . بۆ نموونە : ئێران هەرچەند بە موسوڵمانی مانەوە، بەلام سەربەخۆیی خۆیان لەدواییدا وەرگرتەوە، یان سوریاو عیراق‌و میسر... ئەمانیش تاکو ئێستاش‌هەر ئیسلامن.

عومەر (خ . ل) هاتە سەر ئەو بیرەی کە ڕژێمێك دابنێت بۆ ئەو خاکانەی بە دەستیانەوەیە . بڕیاری‌دا کە دەبێت موسوڵمانەکان مافێکی تایبەتی خۆیان هەبێت چونکە سوپایەکی جەنگاوەرن لەو ناوچانەی کە بە دە ستیانەوەیە، دەبێت دووریش بژین لە دانیشتوانی شارەکان ئەو

دانیشتوانەیش بایەتە (جزیە) یان پێبدەن ، ئەمانیش لە بری ئەوە پێویستە ژیانیان بپارێزن‌و نایشبێت بە زۆر بکرێن بە ئیسلام .

لێرەدا گرنگی‌و مەزنی عومەر دەردەکەوێت کە چۆن کارێکی زۆر گەورەو بالأی گێڕاوە؟ چۆن مەردێکی زرنگ‌و سەرەکی بووە لە بلأوکردنەوەی ئیسلامدا پاش موحەمەد (د . خ) .

گەر عومەر نەبایە لەوانە بوو بکەوتینایە گومان‌و دوو دڵییەوە لە بلأوبوونەوەی ئیسلام ، بۆ سەلماندنی ئەمەش ئەوەتا ... زوربەی ئەو وولأتانەی کە خرانە ژێر دەسەلأتی ئیسلامەوە تا ئێستا هەرماون . هەر چەندە زۆر روون‌وئاشکرایە کە مەزنی‌و شایستەیی دەگەرێتەوە بۆ موحەممەد (د .خ) لەم رووەوە بەلأم هەڵەیەکی زۆر گەورەیشە گەر عومەر لەیاد بکەین ، چونکە ئەو کارانەی کە لە سەردەمی ئەودا روویدا هەرچەندە لەوانەبوو بێ ئەویش روویبدایە بەلأم ئەم شێوەی ئێستای نەدەبوو گەر سەرکردایەتی وپێشەوایەتی عومەری بلیمەت‌و هوشیاری لە پاڵدا نەبوایە .

لای رۆژاواییەکان کە عومەر ئەوەندە ناناسن سەیریشە لایان کە ئەگەر لە پلەیەك دابنرێت بەرزتر لە هەندێك ناودارانی رۆژاوایی وەك شارلمان‌و قەیسەر. بەلأم رەوایە ئەگەر بڵێین ئەو دەسەلأتەی کە عەرەب لەسەردەمی فەرمانرەوایی عومەری کوری خەتاب دا (خ . ل) هەیبووە بە چەندو چۆن‌و بەو بەردەوامیەوە ... زۆر گرنگتربووە لە یۆلیۆس قەیسەرو شارلمان.

# ئازۆکا...

**٣٠٠ پ‌ز - ٢٣٢ پ‌ز**

**Asoka**

بە گرنگترین پاشا دادەنرێت لە مێژووی هینداو سێهەمین پاشایە لە بنەچەی مۆریا.

ناوی (چاندرا گۆپتا موریا) یە . ئەو سەرکردە نەبەردە بوو کە توانی زوربەی باکووری هیند داگیر بکات ، ڕێکەوتی ئەو ساڵانەی شالاوەکانی ئەسکەندەری گەورە دەکات . بەم کارەی بووە یەکەمین دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتێکی گەورە لە هیندا . هەر چەندە ساڵی زایینی زۆر باوەڕ پێکراو نیە . لەوانەیە لە ساڵی ٣٠٠ پ زدا بووبێت و لە ساڵی ٢٧٣ پ زاینییشدا هاتبێتە سەر تەختی پاشایی .

لە سەرەتای دەسەلاتیدا وویستی چەند هەنگاوێکی توند ڕەوانە بنێت ، وویستی بە زەبری پۆلایین و سەربازانە دەسەلاتی خۆی و ئیمپراتۆریەتەکەی فراوانتر بکات ، بەلام کاتێ کە بینی نزیکەی سەد هەزار کەسێکی کوژراو و ژمارەیەکی یەجگار زۆری بریندار... بونەتە قوربانی ئەو مەرام نیازەی ئیتر زۆر لەو کارە درندانەی پەشیمان بووەوەو

بڕیاریدا کە هەرگیز هێرش‌و دەسەڵاتی ناهەموارانەی نەخاتە کارو ئازاری کەس نەدات . ئینجا باوەڕی هێنا بە فەلسەفەی بوزایی‌و هەوڵی ئەوەیشی ئەدا کە ئەرکەکانی دراما بەجێ بهێنێت (دراما نەریتێکی جەوهەرییە لە ئاینی بوزاو بریتی‌یە لە ڕاستی‌و بەزەیی‌و ناتوندی) لە سەر ئەو ڕێبازەی وازی لە ڕاوشکارو گۆشت خواردن هێناو بووە مرۆڤێکی ڕووەك خۆر ، چەندین بەیتاڵخانەو لانەی بۆ ئاژەڵ‌و تەباکێویەکان کردەوە . ڕێگاوبانی دروست‌کردو هانی ئاودێری ئەدا. چەند فەرمانبەرێکی دانا بە ناوی (فەرمانبەرانی دراما) کاریان تەنها ئەوە بوو ڕۆشنبیری ئایینی‌و بروای پتەو بلاوبکەنەوە ، هەروەها هانی کاروبارو پەیوەندی خۆشەویستی‌و دڵنەوایی بدەن لە نێو مەردومدا. هەر چەندە مەردێکی بەخشندە بوو لەگەڵ گشت ئاینیەکاندا بەلام شێوەیەکی تایبەتی زۆر هانی بوزایی ئەدا. هەر ئەوەیش بووە هۆی ئەوەی کە لای خەڵك پتر خۆشەویست و بەڕێز بێت .

ئازۆکا لە سەردەمیدا دەستە دەستە فێرکارانی دەناردە دەرەوەی وولات . ئەم فێرکارانە ڕێبازیان بە شێوەیەکی تایبەتی سەرکەوتوو بوو لە سیلان (وولاتی سیریلانکای ئێستا) .

فەرمانی دا هەرچی دەستوورو هەڵسوکەوتی ژیان‌و سیاسەتی هەیە لە سەر تاوێرو تەلە بەردەکاندا هەڵبکەنرێت‌و بنەخشێنرێت هەروەها پەیکەری بۆ بکرێت لەسەر بەردەستونیەکان لە سەرانسەری ئیمپراتۆریەتەکەیدا کە تا ئێستایش ئەمانە زوربەی ماون . نەخشەی جوگرافی ئیمپراتۆریەتەکەی بییرکێکمان ئەداتێ لە بارەی فراوانی دەوڵەتی ئازۆکاوە، ئەو نەخش‌و نیگارو پەیکەرانەی کە ئێستا ماون

سەرچاوەیەکی سەرەکین بۆ زانینی گوزەرانی ژیانیو کارەکانی، ئەو بەردە ستونیانەیش بە کارێکی هونەری زۆر نایاب دادەنرێت .

پاش پەنجا ساڵ بە سەر مردنی ئازۆکادا ، ئیمپراتۆریەتی مۆریا پووکایەوەو بێ‌هێز بوو . بەڵام لەبەر ئەوەی کە پاڵپشتێك بوو بۆ بڵاوکردنەوەی رێبازگەی بوزایی بۆمان دەردەکەوێت کە دەسەڵاتی ئازۆکا بۆ سەر جیهان زۆر بە کاریگەر بووە .

کاتێك هاتە سەر تەختی شاشانی ئاینی بوزا ئاینێکی ناوخۆیی بوو وە ئەوەندەیش گرنگ‌و بایەخی نەبوو لەناوخەڵکدا ، هیچ پەیرەوانی نەبوو تەنها لە باکووری رۆژاوای هینددا نەبێت ، بەڵام گەر سەرنج بدەین دەبینین پاش مردنی ، پەیرەوکەرانی ئاینی بوزا زۆر بوو لە سەرانسەری جیهاندا .

لێرەدا ئازۆکا بە لیپرسراوی یەکەم پاش گۆیتا دادەنرێت لە پەرەپێدانو بڵاوکردنەوەی ئاینی بوزاو کردنی بە ئاینێکی جیهانیی زۆر بڵاو .



# قەشە ئۆگەستین...

٣٥٤ ز - ٤٣٠ز

ST. AUGUSTINE

قەشە ئۆگەستین... هاوچەرخی رماندنو داکەوتنی ئیمپراتۆریێتی رۆمان. بە مەزنترین زانای لاهوتی ئەو سەردەمە دادەنرێت. کارنامەکانی کاریگەرێك بوون بۆ سەر ئەو بڕواو هەڵوێستە ئایینیانە بە درێژایی سەدەکانی ناوەراستو بگرە تا ئەمرۆیش.

ئۆگەستین ساڵی ٣٥٤ ز لە شاری تاگاسی (ئێستا بازاری ئەحرەسی پێدەوترێت لە جەزایر) دایك بووە. باوکی کابرایەکی بتەوان بووە، دایکی دیانێکی سەرسەختی پەرگر[١] بووە، لە بەر ئەوە بە منداڵی داشۆریان[٢] نەکرد.

زیرەکی و چاپووکی هەر لە منداڵیەوە لێدەرکەوتووە ، لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا نێررا بۆ قەرتاجە بۆ خوێندن ، لەوێ هاوسەری ژیانی پەیدا کردوو منالێکی زۆڵیان خستەوە . لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا بریاریدا کە بکەوێتە خوێندنی فەلسەفە بەلاّم دەسبەجێ بایدا بەلای ئایینی (مانی ی)دا . لە سەرەتاییدا بروای بەهێز نەبوو بە ئایینی دیان . باوری وابوو کە هیچ خۆشنوودییەك ناداتە مێشك ، بەلاّم لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا کاتێك کە چوو بۆ رۆماو میلانۆ - باکووری ئیتالیاو بووە ئوستادی زانستی رەوانبێژی و ووتاربێژی... لەوێ دەکەوێتە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی ئیفلاّتونی نوێ (دەقێکی راستکراوەی فەلسەفەی ئیفلاّتونی یە) . هەر لەوێیش (شاری میلانۆ) خۆی ناساند بە قەشە ئەمبروس گەورەی قەشەکانی ئەو سەردەمەی میلانۆ . زۆر بە تەوسو هوشیارییەوە گوێ بۆ راوێژو ئامۆژگاریەکانی دەگرت دەربارەی ئایینی دیانی لە شێوەو روالەتێکی بە سوودو بەچێژو جواندا ، ئیتر لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا ئەم پیاوە دوودڵە بووە دیانێکی دڵسۆزو زۆر چوست . لە ساڵی ٣٨٧ز دا قەشە ئەمبروس بە دەستی خۆی داشۆری کردو لەپاشان گەرایەوە بۆ جەزایر .

ئۆگەستین لە ساڵی ٣٩١ زدا بووە یاریدەری گەورەی قەشەکانی هیپۆ ، پاش پێنج ساڵ ئەمبروس مردو ئۆگەستین جێ ی گرتەوە ئیتر هەر لە سەر ئەو کارو فەرمانەی مایەوە تا دوا ژیانی .

هەر چەندە هیپۆ شارێکی بچوك بوو بەلاّم زرنگی و رۆشبیری و فرەزانی ئۆگەستین لای هەمووان دەنگی دابووەوە تا وای لێهات بووە یەکێ لە پێشەوا باوەر پێکراوەکانی کەنشتە .

ئۆگەستین پیاوێکی بەژن لاواز بوو بەڵام ئاوەزێکی بەپێزو زرنگی هەبوو، بە یارمەتی نووسەرێکی توانی چەند ژمارەیەك لە پەڕاوی ئایینی دابنێت . ئەوەی کە ئێستا مابێت خۆی ئەدا لە نزیکەی ٥٠٠ نامەی موچیارو ٢٠٠ نامیلکە . لەو پەڕاوانەی کە زۆر بایەخی پێدەدا پەڕاوی (شاری خودا)و (پێلێنانەکان) بووە بەڵام ئەمەی دواییینیان کە لە ساڵانی چلەکانی ژیانیدا نووسییەوە بە بەچێژترین‌و بەپیت‌ترین پەڕاوی دادەنرێت .

زوربەی ئەو پەیام‌و موچیارانەی ئۆگەستین بریتی‌بوون لە پوچاندن‌و رەخنە بۆ سەر ئایینی مانی‌ی‌و گشت تیپە دیانە فرە بەرەکان ، هەروەها بەشێکیش بوون لە ڕوونکردنەوەی ڕێبازگەو بڕوای ئایینی ئۆگەستین خۆی .

بیلاجیۆس کە تەرسایەکی ئینگلیزی بوو لە ساڵی ٤٠٠ زدا هاتە رۆما ، لەوێ چەند ڕێبازێکی لاهوتی سەیری پێش‌کەش کرد . دەیگوت : کە مرۆڤ بێگوناهە ... ئازادیشە لە هەڵبژاردنی کردەوەی چاك‌و خراپ ، هەر بە ژیانی لە چاکەو فەرو کردەوەی خاس لەوانەیە سەرفرازی دەسکەوێت . بەڵام ئۆگەستین خاوەن دەسەلاٚت توانی بە نووسین‌و کۆڕگرتن بەرپەرچی ڕێبازەکانی بیلاجیۆس بداتەوەو بەرایی(٣) خوانەناسی بۆ دەربکات . بێ‌بەری کرد لە هەموو کاروبارێك‌و ئینجا لە رۆمایش شار بە دەری‌کرد .

بە بیروڕای ئۆگەستین بێت هەموو کەس بە گوناهی ئادەمەوە

گیرۆدەیە ، بە ڕێژەن[٤] و ئافەرینی خوایی نەبێت... هیچ کەسێك بە کارە چاکە تایبەتیەکانی سەرفەراز نابێت ، پێشتریش ئەم بیروڕایانەی ئۆگەستین هەبوو بە پەرت و بلاوی بەلام ئۆگەستین بە زرنگی ئەو بیرانەی لە بڕواو ڕێبازگەی دیانیدا چەسپاند.

بیرو بڕوایەکانیشی سەبارەت بە (با)... کارێکی زۆر مەزنی گێڕا بۆ سەر ئەو هەلوێستانەی سەدەکانی ناوەڕاست. ئۆگەستین پاش ئەوەی باوەڕی خۆی گۆڕی و هاتە سەر ئاینی دیانی خۆی لە باکاری تەکاندەوە هەروەك لە نووسینەکانیدا دیارەو ئاشکرای دەکات و دەڵێت : «هیچ شتێك وەك باو باتێکەڵی نیەکەهەروا بەئاسانی بتوانرێت خۆمانی لێ دوور بخەینەوە» . جا باتێکەڵی ڕەنگبێت بۆ ئۆگەستین زۆر سەخت و زەحمەت بووبێت بەلام خەباتی بێ ووچانی و دان بەخۆداگرتن و دوورە پەرێزی تایبەتی لە باتێکەڵی و بیروڕاکانی لە بارەیەوە... زۆر بە ووردی لە پەڕاوەکەیدا (پێلێنانەکان) ڕوون و شی دەکاتەوە.

ئیمپراتۆرێتی ڕۆمان لە ژیانی قەشە ئۆگەستیندا بەرەو ڕماندن و داکەوتن دەچوو ئەو نووسینانەی هۆیەك بوون بۆ تێچوونو گواستنەوەی زۆر لەو فەلسەفە یۆنانیانە بۆ ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەتایبەتی فەلسەفەی ئیفلاتونی نوێ و فەلسەفەی دسکارتس (دیکارت) کە دەڵێت لە یەکێ لە ووتەکانیدا (من بیردەکەمەوە .. کەواتە من هەم ..)
ئۆگەستین بە دوازانای لاهوتی دیان دادەنرێت تا دواسەدەکانی

ناوەڕاست . نووسینەکانی زۆر کاریگەر بوون بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست هەروەها کاریگەربوون بۆ سەر زۆر لە پیاوانی ئاینیی بەناوبانگ وەك تۆماس ئاکوئیاس و لۆثەر و کالڤن .

ئۆگەستین سالی ٤٣٠ زدا لەشاری هیپۆمرد ، پاش ئەوەی ژیانێکی ٧٦ سالەی بەسەربرد. لەو سالأنەی مردنیدا خێلە فندالیە بەربەریەکان گەمارۆی شاری هیپۆیان داو شارەکەیان سەرانسەر وێرانکردو سوتان بەلام تەنها کاتێدرایی ئۆگەستین ونووسینەکانی لە سوتاندن ڕزگاریانبوو .

---

(١) پەرگر : سەهەند: منعطف

(٢) داشۆری : جۆرە شتێکی تایبەتیە لە نێودبانیدا .

(٣) بەرایی : فتوا

(٤) ڕێژەن : بەرەکەت .



# ماکس پلانك

١٨٥٨ز - ١٩٤٧ز

**Max Planck**

له کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٠ زدا فیزیاگەری ئەڵمانی ماکس پلانك... بە گریمانە مەزنەکەی جیهانی زانستی هاژاند .

ووزەی رۆشنایی یان شەپۆلە ووزەکانی رۆشنایی... رەوتێکی رەوەندانەی[١] نیە بەڵکو پێکهاتووە لە لەرزە Frequency کان کە پێی دەوترێت کوانتەم Quantum واتە چەندە . ئەم گریمانەی کە نەدەگونجا لەگەڵ بیردۆوزە کلاسیکیەکاندا (رۆشنایی Lightو کارۆموگناتیسی electromagnatism) زەمینەیەکی بەپیتی لە گۆرانکاریدا چەلاند[٢] بۆ ئەو بیردۆزە فیزیکیانەو هەروەها بیرکردنەوەیەکی قووڵتریشی هێنایە کایەوە لە چەمکی سروشتی ماددەوتیشکدانەوەدا .

پلانك سالی ١٨٥٨ زدا له شاری (كیل)ی سەر به ئەڵمانیادا له دایك‌بووه له زانكۆكانی بەرلین‌و میونیخ‌دا خوێندویەتی، له تەمەنی ٢١ ساڵیدا دكتۆرانامەی فیزیكی له زانكۆی میونیخ وەرگرت، هەر لەو زانكۆیەدا بۆ ماوەیەك به مامۆستایی مایەوه ، پاشان بووه ئوستاد له زانكۆی بەرلین ، ئیتر هەر لەوێ تاساڵی ١٩٢٨ ز مایەوەو له تەمەنی ٧٦ ساڵیدا خانەنشین بوو .

پلانك زۆر گرنگی ئەدا به ڕشتەی تیشكدانەوەی تەنەرەشەكان (Black-body radiation) . ئەو ناوەی سەپاند به سەر ڕشه خەڵوزینەكاندا كه له كاتێكدا گەرم دەكرێن تیشكدانەوەیان لێدەردەپەرێت «تەنی ڕەشی خەڵووزین بەو تەنه دەوترێت كه هیچ رۆشناییەك ناداتەوه بەڵكو هەر رۆشناییەكی داكەوتوو لەسەری بێت هەڵیدەمژێت» .

فیزیاگەره تاقیكارەكان هەستان به پێوانێكی زۆر ووردی ئەو تیشكه دەرپەڕیوانه كه لەم تەنه ڕەشانەوه دەردەپەڕێت .

یەكەم هەنگاوی بەكار و گرنگی پلانك هاوكێشەیەكی جەبری دارشت كه به شێوەیەكی ڕێكوپێك پەسنی تیشكدانەوەی تەنه رەشەكان دەكات بەلام ئەو هاوكێشەیەی پلانك نەدەسازا لەگەڵ ئەو قانونه فیزیكانەی كه پەسەندكراوبوون لەو سەردەمەدا .

پلانك زۆر چووە ژێر باری ئەم كێشەیەوە تا لە كۆتاییدا رێی بۆ بیردۆزەیەكی نوێ خۆش‌كرد بۆ چارەسەركردنی ئەم هاوكیشەیە كە دەلێت : ووزەی تێشكدانەوە Energyradiation تەنها بە چەندانەیەكی تەواوو وورد دەردەپەڕێت كە لە چەند یەكەیەكی سەرەتایی پێك دێت، ئەمەی ناونا (چەندە)یان كوانتەم. ئەگەر بە بیردۆزەی پلانك بێت ئەوا ئەنجامی برەرۆشنە لەسەر لەرەرۆشنە یان رەنگی... رادەوەستێت . هەروەها لەسەر ئەو برە فیزیكە ڕادەوەستێت كە پلانك ناوی دەبات بە هێمای (h) كە ئێستا پێی دەووترێت جێگری پلانك .

هەرچەندە ئەم بیردۆوە بە پێچەوانەی ئەو بیردۆزە فیزیكانە بوو كە دەزانران بەلام لەگەل ئەوەیشدا كە خستیەكار توانی كێشەی ئەو تەنە رەشانە یەكلابكاتەوە .

بیردۆزەكەی پلانك لەوەدا بوو كە بەرەوپووچانەوەو سرانەوە بچێت گەر چوست‌و كاری بێووچان‌و ناوداری خودی پلانك نەبوایە . جا زاناكان لە یەكەم جاردا بە ئەفسانەیەكی فیزیكیان دادەنا، بەلام پاش چەند سالێك دەركەوت كە چەندە بیردۆز Quantum theory چەند گرنگەو چۆن لە تیشكدانەوە رۆشنایەكانیشدا كاری پێدەكرێت ، هەتا وەكو ئەنشتاینیش لە سالی ١٩٠٥ زدا كاری پیێدەكرد لە لێكۆڵینەوەی ئەنجامەكانی نیگاركێشانی كارەباییدا، هەروەها زانای مەزن بۆر لە سالی ١٩١٣ زدا لە روونكرونەوەی بیردۆزەكەیدا دەربارەی پێكهاتنی ئەتۆمدا كاری پیێدەكرد .

پلانْك لە سالی ١٩١٨ ز كە خەلاتی نۆبلی وەرگرت دلنیا بوو لەوەی كە گریمانەكەی لە سەدا سەد تەواوەو كاریكی زۆر گرنگ دەگیریت لە بیردۆزە فیزیكییەكاندا .

بەربەرەكانی پلانك و نارەزایی بۆ دەسەلاتی نازی هۆیەك بوو بۆ ئەوەی ژیانی بكەویتە مەترسییەوە، سالی ١٩٤٥ ز كورەكەی لە سیدارەدرا لەبەر ئەوەی كە دەستی هەبوو لە پیلانگیرانیكدا دژی هیتلەر بەلام پلانك خۆی لە سالی ١٩٤٧ زدا مرد .

پەرەپیدانی میكانیك (واتە كوانتەم) مەزنترین رووداوی فیزیكییە لە سەدەی بیستەمدا ، هەتاكو لە بیردۆزەكەی ئەنشتاینیش گرنگترە .

---

رەوەند: ئینسپاب: streamling.

(٢) چەلاند: ئامادەكرد.



# جۆن كاڵڤن

١٥٠٩ز - ١٥٦٤ز

John Calvin

زانای لاهوتو ڕەوشتزان جۆن کاڵڤن... بەیەکێ لە پیاوە بەرزەکان دادەنرێت لە مێژووی ئەورووپادا، یاداشتو ڕازەکانی لە زۆر ڕشتەو بابەتی جیاوازدا شۆڕشێك بوون بۆ سەر ژیانی سەدان ملیۆن کەس بە درێژایی پتر لە ٤٠٠ ساڵ. ئەو ڕەبازو لێکۆڵینەوە بەپێزە جیاوازانەی لە زانستی لاهوتو فەرمانڕانیو، ڕەوشتی خۆیی مەردومو ڕەفتاری بەکاردا ...بووە کاریگەرێك بۆ سەر جیهان لە سەردەمێکدا.

جۆن کاڵڤن ساڵی ١٥٠٩ ز لە شاری نویۆن - فەڕەنسا لە دایك

بووه. له سەرەتای ژیانیدا پلەیەکی باشی له خوێندندا تەواوکرد. پاش خوێندنی له کۆلێژی پاریس چووە کۆلێژی ئۆرلیانس بۆ خوێندنی قانوون، ماوەیەکیش له بۆرگاس‌دا قانوونی خوێند.

لەو کاتەی کە مارتن لۆثەر ٩٥ بێزارنامە کەی لەسەر دەروازەی کەنشتەی ووتنبرگدا هەڵواسی کالڤن لە تەمەنی ٨ ساڵیدا بوو. لە هەرەتی لاویدا خۆی خستە ئامێزی ڕێبازگەی پرۆتستانتییەوە. جا بۆ ئەوەی تووشی ئازارو لێدان نەبێت ناچاربوو پاریس جێبهێڵێت‌و لە شاری پالْ. سویسرە جێنشین ببێت . لەوێ ناسناوێکی بۆ خۆی دانا بۆ ئەوەی کەس نەیناسێتەوە. زۆر بەخەست‌و قووڵی کەوتە خوێندنی زانستی لاهوت. کە گەیشتە تەمەنی ٢٧ ساڵی ناوبانگترین پەڕاوی بڵاوکردەوە بە ناوی «دامەزراوەکانی ئایینی دیان» . لەم پەڕاوەیدا ناوەڕۆکی بڕواکانی ڕێبازگەی پرۆتستانتی پەسن دەکات‌کەبەشێوەیەکی ژیرانەو پەیڕەوانە نووسیویەتەوە .

ساڵی ١٥٣٦ ز دیدەنی شاری جنێڤ - سویسرای کرد... شارێك بوو پرۆتستانتی تیایدا لە گەشەکردن‌و بەهێزیدا بوو تکایان لێکرد کە لە جنێڤدا بمێنێتەوە وەك ئوستادو ڕابەرێك بۆ کۆمەڵگای پرۆتستانتی بەڵام ئەوەندەی نەبرد ناکۆکی کەوتە نێوان کالڤنی بیورتیانی‌و دانیشتوانی جنێڤەوە لە ساڵی ١٥٣٨ زدا زۆری لێکرا کە شاری جنێڤ جێبهێڵێت، بەڵام لە ساڵی ١٥٤١ زدا جارێکی تر تکایان لێکردەوە بۆ گەڕانەوە . ئەم جارەیان نەك هەر بە پێشەوایەکی ئایینی شارەکە ناسرا بەڵکو بووە پێشەوایەکی سیاسیش‌و خاوەن دەسەڵاتێکی تەواو تا دوازیانی.

له شاری جنیڤدا ئەنجومەنێکی ٢٥ ئەندامی فەرمانڕانی شارەکەیان دەکرد بە ڕێگەی هەڵبژاردنو مافی دەنگدان ، ئەم ئەنجومەنە بەرپرسیاربوو له دەسەلاتی سیاسی شارەکە ، کالڤنیش وەنەبێت ئەندام بووبێت لەو ئەنجومەنەدا چونکە لەهەر کاتێکدا بوایە دووچاری سزا دەبوو بە بڕیاری ئەنجوومەن، هەروەکو چۆن له ساڵی ١٥٣٨ زدا دووچاری بوو. هەرچەندە ئەمجارەیشیان کە گەڕایەوە ئەندام نەبوو لەو ئەنجومەنەدا بەلاّم بە گەورەو دەسەلاتدارێکی شارەکە ناوی دەبرا بەتایبەتیش له سالەکانی دوای ١٥٥٥ ز وە ئیتر بووە تا کە فەرمانڕانێکی ئۆتۆکراتی سەرانسەری شارەکە .

جنێڤ له ژێر دەسەلاتی کالڤندا بووە گرنگترین مەڵبەندی پرۆتستانتی له ئەوروپای ناوەڕاستدا ، زۆریش هەولّو هانی ئەدا بۆ بلاّوکردنەوەی له وولاّتەکانی تردا بەتایبەتی له فەرەنسادا هەتاوەکو وای لێهات جنێڤیان ناودەبرد بە (ڕۆمای پرۆتستانت) .

کالڤن له بڕوای ئاینیدا لێخۆشبوونی نەبوو ، بە دەستێکی ئاسنین ئەوانەی سەرکوت دەکرد، کە سەرپێچییان له فەرمانی دەکرد لەوانەیش (میکایل سێرفیتۆس) پزیشکێکی ئەسپانیو زانایەکی لاهوتی بوو کە هیچ باوەڕی بە سیێتێن (١) نەبوو. جا هەرکە سێرفیتۆس هاتە جنێڤ دەسگیرکراو تاوانی خوانەناسی درایە پالّو بە فەرمانی سوتاندن سزادرا ، فەرمانەکەیش له ساڵی ١٥٥٣ زدا جێبەجێ کرا .
کالڤن ئافرەتێکی کردە هاوسەریو منداڵێکیشان بوو بەلاّم

دەسبەجێ مرد ، ساڵی ١٥٤٩ ز ژنەکەیشی مرد، خۆیشی لەساڵی ١٥٦٤ زدا مرد.

گرنگی کاڵڤن وەنەبێت لە چالاکی ڕاستەوخۆی سیاسیدا بێت بەڵکو لە دامەزراندنی ئەو ڕێبازانەو گەشەپێدانی ئینجا ئاشکراکردنو بلاۆکردنەوەی بە شێوازێکی ژیرانە .

کاڵڤن زۆر توندڕەو بوو لەدەسەلاّتو بایەخ پێدانی بە سیارەی پیرۆز، ئەمیش هەر وەك مارتن لۆثەر لە مل ملانێدابوو لەگەلّ دەسەلاّتی کەنشتەی کاثۆلیك لە ڕۆمادا .

---

(١) سیێتی: باوەڕ بە سێ کردگار Trinitarianism.

○



# ولیەم مۆرتۆن...

١٨١٩ ز - ١٨٦٨ ز

William T. G. Morton

زۆر لە خوێنەواران لەوانەیە ئەوەندە گوێیان نەدابێتە ناوی ولیەم مۆرتۆن، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بایەتە بیخەینەوە یادمان کە مۆرتۆن چ مەردێکی کاریگەر بووە پتر لە زۆر ناودارانی‌تر چونکە بە لێپرسراوی یەکەم دادەنرێت لە بەکارهێنانی دەرمانی سڕی یاخود تەزین (بەنج) لە کاری نەژداریدا.

کەم داهێنان بڕەو و ناوبانگی هەبووە ئەوەندەی داهێنانی بەنج بەکارهێنان لە نەژدار کاریدا. ئەم داهێنانە گۆڕانێکی تەواوی پەیدا کرد لە باری ژیانی مرۆڤدا.

جاران کارێکی زۆر ستەمو سامناك بوو بۆ زامدارێك کە بە بێداریو هۆشیارییەوە ناچاربێت بەرگەی ئەو ئازارو ئێشە بگرێت کاتێك کەنەژدار بە هەرەیەکەوە[1] دەهاتو دەنیشتە سەر برینەوەی ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەشی. بێگومان هەر توانایەك گەر بێتە کایەوەو بخرێتە گەڕ بۆ دانانی سنورێك بۆ ئەم ئێش و ئازارە ئەوا دەبێت مەزنترین شاباش و خۆشنوودی بێت کە بەدیاری پێش‌کەش بکرێت بۆ خزمەتگوزاری مرۆڤو مرۆڤایەتی.

مۆرتۆن سالی ۱۸۱۹ ز لە شالتۆن ماسا شوستس لە دایك بووە لە تەمەنی لاویدا خۆی گەیاندە زانکۆی بلتیمۆر بۆ خوێندنی پزیشکی دان. لە سالی ۱۸٤۲ زدا دەستی کردە پیشەی پزیشکی‌دان، پاشان بە دوو قۆلی لە تەك پزیشکێکی تردا بەناوی (هەوراس ویلز) کەوتنە کار، ئەمیش هەروەك مۆرتۆن خولیای لە بەنجکاریدا هەبووە زۆر بایەخی پی‌ئەدا.

ویلز لە سەرەتایدا ئۆکسیدی نایترۆجینی بەکاردەهێنا (کە زانراوە بە گازی پێکەنەر) بۆ بەنجکاری، بەڵام مورتۆن دەیویست مادەیەکی بەکارتر لە ئۆکسیدی نایترۆجین بدۆزێتەوە... ئەو مادەیەی کە هاوکارەکەی بەکاری دەهێنا بۆ سڕکردنی دانی نەخۆشەکانی.

مۆرتۆن هەولی بەکار هێنانی ئیثەری Either ئەدا، پێشەکی لەسەر سەگەکەیدا تاقیکردەوە ئینجا بەسەر خۆیدا. پاشان تاقیکردەوە بەسەر دانکێشانی (کاکیلە)ی یەکێك لە نەخۆشەکانی، سەرنجی دا لەوەی کە نەخۆشەکە هیچ هەست بەئازار ناکات. ئیتر ئابەم چەشنە مۆرتۆن ئەو شۆڕشە سەرکەوتووەی بەچاوی خۆی بینی، هەرچەندە نەژدارکارییەکە سەرکەوتوانە بە ئەنجامدرا بەڵام سەرنجی ڕۆژنامەکانی

رانەکێشا تاکو ئەو هەواڵە گرنگە بڵاوبکەنەوە. ئەم کارە مەزنە پێویستی بە پڕۆپاگەندەیەکی گەورەتردە بوو. بۆ ئەم مەبەستە مۆرتۆن لەگەڵ یەکێ لە پزیشکە بەناوبانگەکاندا ڕێکەوت کەناوی دکتۆر (وارن) بووو سەرنەژداری بیمارستانی بۆستن بوو. ئەو ڕیکەوتنەی تەنها بۆ ئەوە بوو کە لە نەژدارکاریدا ئیثەر بەکاربهێنێت تاکو ببێتە پڕوپاگەندەیەك بۆ ئەم داهێنانە نوێیەی.

بێگومان کارەکەی دکتۆر (وارن) سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا، دیسان لە نەژدارکارییەکی تردا ئیثەری بەکار هێنا بۆ لابردنی لوویەك لە گەردنی یەکێك لە نەخۆشەکانی.

ئابەم کارە مۆرتۆن بەهۆی کاریگەی ئیثەرەوە ناوبانگی دەکرد، هەر لە ڕۆژی دواییندا داهێنانامەی پێ بەخشرا، بەڵام ناحەزانی بۆ پەیدابووو بوونە کۆسپ لە ڕێیدا. هەرچەندە مۆرتون بڕوای وابوو کە بە هۆی ئەم دۆزینەوەوە سامانێکی زۆری دەست دەکەوێت بەڵام هاتوو چۆی دادگاو پارەدان بە پڕۆپاگەندەی دۆزینەوەکەی زۆرکەوت لە سەری... سەرەڕای ئەوەیش پزیشکەکانی تر بەرادەیەکی زۆر بێمنەتانە ئیثەریان بەکار دەهێنا لە کاری نەژدارییاندا، دڵنیایش بوون لەوەی کە ئیتر لەوەدا نەماوە مۆرتۆن بتوانێت مافی ئەو بەکارهێنانەیان لێ بسەنێتەوە. هەرچەندەیش تەواو دەیانزانی کە مۆرتۆن بە دۆزەری یەکەم دادەنرێت لە پەنجکاریدا.

ئاوەها مۆرتۆنی بەدبەخت هەروەك چەندین ناودارانی تر بەزەبونیو نائومێدی لە تەمەنی ٤٩ ساڵیدا ساڵی ١٨٦٨ ز لەشاری نیۆیۆرکدا گیانی بە خاك سپارد.

---

(١) هەرە: مشار



# ولیەم هارڤی...

١٥٧٨ ز - ١٦٥٧ ز

William harvey

پزیشکی ئینگلیزی بەناوبانگ ولیەم هارڤی دۆزەری سووڕی خوێن و فەرمانی دڵ سالّی ١٥٧٨ ز لە شاری فولکستون - ئینگلتەرە لە دایك بووە.

ناوبانگترین نووسراوی لە سالّی ١٦٢٨ زدا بلّاوکردەوە بەناوی (ووتارێکی توێکاری دەربارەی بزوتنەوەی دڵ و خوێن لە گیانەوەراندا) کە بەڕاستی مافی ئەوەی درایە بە مەزنترین نووسراو دابنرێت لە مێژووی فیسیۆلۆجیدا، هەروەها ببێتە سەرەتایەك بۆ زانینی فیسیۆلۆجیای نوێ. گرنگی ئەم نووسراوەی وەنەبێت لە کارپێکردنە

راستەوخۆیەکاندا تەنها هەر خۆی بنوێنێت بەڵکو لەو چەشنە سەرشتەو تێگەیشتنەی کە پێش کەشی دەکرد و ڕوونی دەکردەوە لە چۆنیەتی فەرمانی لەشی مرۆڤ.

بەش بە حاڵی خۆمان ئا لەم ڕۆژەماندا دەزانین کە خوێن بە لەشماندا دەسووڕێتەوە. بە جۆرێك ئەم کەهیچ بەڵگەی ناوێ.

ئەم بیردۆزەی هارڤی بە تەواوی ئاشکرایە بەڵام ئەوەی کە ئێستە ئاشکرایە جاران لای زنیدەناسە کۆنەکان زۆر نەزانراو بوو، جا هێندێ لەو زانایانە چەند تێڕوانینو پێشنیارێکی هەڵەیان دەخستەروو وەك:

ا - خۆراك دەگۆڕێت بۆ خوێن لە دڵدا.
ب - دڵ وا لە خوێن دەکات کە هەمیشە گەرم بێت.
ج - خوێنبەرەکان پڕن لە هەوا.
د - دڵ... ئەو مادە نیانەبژێوە دروستدەکات (واتە خوێن).
هـ - خوێن لە خوێنبەرەکانو خوێنهێنەرەکاندا دەکەوێتە کێشەو خێزانەوە[1] هێندێ جار بەرەو دڵو هێندێ جاریش دوور لە دڵ.

گالینۆس کە پزیشکێکی ناسراوو هاوچەرخی هارڤی بوو پەیی بەوکردارە نەبرد (سووری خوێن)، هەتا وەکو ئەرەستۆیش هیچ بابەتێکی لەم بارەیەوە لە یاداشتەکانیدا نەنوسیوە. پاش بڵاوکردنەوەی پەراوەکەی (هارڤی)یش زۆر لە پزیشکان ئەوکردارەیان پێ سەیربوو. ڕازابوون لەوەی کە خوێن لە دڵەوە بە هێزێکی فشاری[2] چەسپاوی نەگۆڕ بە لەش دا... بە ڕژێمێکی داخراو بەهۆی دەزوولە خوێنینەکانەوە دەسووڕێتەوە.

نزیکەی حەوت ساڵی بردەسەر بە تاقیکردنەوە پێش ئەوەی بگاتە بیردۆزەی سووری خوین، تێیدا دەڵێت خوێنبەرەکان خوێن دوورەخەنەوە لە دڵ. ئەو سەردەمەیش میکرۆسکوپ نەبوو تاکو بوونی دەزوولە خوێنینەکان نیشان بدات، بەڵام هارڤی لەگەڵ ئەو کەموکوڕیەیشدا سوور بوو لەسەر بوونی دەزوولە خوێنینەکان. دڵنیابوو لەوەی کە بریتین لە دەزوولەی زۆر وورد خوێن لە خوێنبەرە هەرە موویینەکانەوە دەگوێزێتەوە بۆ خۆێنهێنەرەکان. ئەم تیروانینەی زۆر بە سەرکەوتووانە بە ئەنجامدا. پاش مردنی هارڤی بەچەند ساڵێك زانای ئیتالی (ماڵفیگێ) ئەوڕاستییەی ساغ‌کردەوەو توانی دەزوولە خوێنینەکان بدۆزێتەوە. هەروەها هارڤی فەرمانی دڵی یەکالا کردەوە کە بریتی‌یە لە هەڵێنجانی خوێن. بۆ ئەم مەبەستە زۆر نموونەی بە تاقیکردنەوەو مشت‌ومرێکی زۆر ووردو سەخت هێنایەوە بۆ پتەوکردنی سەرنج‌و تێڕوانینەکانی، بەڵام لەژیاندابوو کە زانایانی هاوچەرخی بەتەواوی بیردۆزەکەیان پەسەندکرد.

هارڤی پەراوێکی تری دانا لەساڵی ١٦٥١ زدا لەبارەی پێزەناسییەوە ئەم پەراوە بەسەرەتایەکی نوێ دادەنرێت لە پێزەناسی‌ی‌دا Embryology. هارڤی لەم ڕووەوە خۆی بەشاگردی ئوستادی یەکەم (ئەرەستۆ) دادەنا.

جاران هارڤی بروای بە بیردۆزەی ئافراندن(١) (ریساندن) Morphogenetic Theory. نەبوو کە دەڵێت گشت ئەندامانی پێزە Enbryo هەرلەبنەڕەتداههیە، بەرەبەرە پێدەگات‌و دواشێوەی خۆی

وەردەگرێت و گۆرانی بەسەردادێت.

هارڤی ژیانێکی درێژو خۆشگوزەرانی بردەسەر، کردیانە سەرۆکی کۆلیژی پزیشکی لەلەندەن بەڵام پەسەندی نەکرد لەو نەخۆشانەی کە هەیبوو دوو پاشای ئینگلتەرە بوو جێمسی یەکەم و شارڵی یەکەم.

فەیلەسوف مەزنیش فرانسیس باکۆن یەکێک بوو لەو نەخۆشانەی. ژنێکی هێنا بەڵام بەوەجاخ کوێری لەتەمەنی ٧٩ ساڵیدا لەشاری لەندەن دواسەری ژیانی نایەوە.

---

(١) کێشمەکێش: مدوجزر

(٢) فشار: هەڵێنجان



# ئەنتوان هێنری بیکۆرێڵ...

١٨٥٢ ز - ١٩٠٨ز

Antoine Henri Bequerel

ئەنتوان هێنری بیکۆرێڵ دۆزەری تیشکی ئەتۆمی... ساڵی ١٨٥٢ ز لە شاری پاریس - فەرەنسا لەدایك بووە. پلەیەکی باڵای بە دەست هێنا لە خوێنەواریدا. لە ساڵی ١٨٨٨ زدا دکتۆرا نامەی لەزانستەکاندا وەرگرت. لەساڵی ١٨٩٢ زدا بووە ئوستادی فیزیکی کارپێکردن (Applied Physics) لە مۆزەخانەی مێژووی سروشتی لە پاریس، جا ئەوەی کە سەیرە بیخەینەوە یادمان ئەوەیە کە باوکو باپیریشی هەر فیزیاگەر بوون لە هەمان مۆزەخانەدا. لە ساڵی ١٨٩٥ زدا بووە ئوستادی فیزیك لە خوێندگای پۆلی تەکنیك لە پاریس. ساڵی ١٨٩٦ ز

لەو خوێندگایەدا هەستا بە چەند تاقیکارییەکی بێ‌ووچان تاگەیشتە ئەو دۆزینەوە مەزنەی کە ناوبانگی پێدەرکرد. بەر لەو ساڵەیش ولیەم ڕۆنتگن تیشکی ئێکس (X- rays) دۆزییەوەو هێنایە بەرهەم بە هۆی لوولە — تیشکە کاثۆدەکانەوە Cathode rays - Tube کە جیهانی زانستی پێ‌هاژاند.

بیکۆرێڵ لەمەوە کەوتە مشت‌ومڕ لەگەڵ خۆیدا ودەیگوت ئاخۆ بکرێت ئەو تیشکانە بە بەرهەم بهێنرێت گەر لە چاوگێکی ترەوە بدرێنە بەر تیشك؟ لە ئەزمونگاکەیدا هێندێك کریستاڵی سولفاتی یۆرانیۆمی پۆتاسیۆمی $K_2UO(SO_4)_2$ هەبوو، پێشەکی دەیزانی کە ئەم ئاوێتەیە درەوشانەوەیەکی فۆسفۆرینی هەیە. هەستا بە چەند تاقیکردنەوەیەك، یەکەم جار پەڕەیەکی ڕەشی ئەستووری هێناو بە کارتێکی فۆتۆگرافییەوەی پێچاو داپۆشی بە شێوەیەکی وەها کە هیچ ڕۆشناییەکی نەگاتێ. پاشان کریستاڵە فۆسفۆرینەکەی هێناو خستیە سەر کارتەکەو ئینجا دایە بەر تیشکی خۆر. پاش گرتنەوەی فلیمەکە سەیری کرد نیگاری کریستاڵەکان دەرچووە. بیکۆرێڵ وایدەزانی لە پێشدا کە تاقیکردنەوەکەی تەواوەو چاوگێکی نوێی پەیدا کردووە بۆ بەرهەم هێنانی تیشکە ئێکسەکان، بەڵام لە دواییدا بەرێکەوت بۆی دەرکەوت کە ئاوێتەی یۆرانیۆمە ئەو تیشکە سمێنەرانە ئەداتەوە بێ‌ئەوەی بدرێتە بەر تیشکی خۆریش، بێگومان ئەم دیاردەیەی لە ڕۆژێکی هەورو تاریکدا بۆ دەرکەوت. هەستا جارێکی تر کریستاڵەکانی هێناو هەمان ڕێگەی دووپات کردەوە لەسەر کارتە فۆتۆگرافیەکە بێ‌ئەوەی بیداتە بەر تیشکی خۆر، پاش چەند ڕۆژێك گەڕایەوە سەری‌و فلیمەکەی شتەوە. ئەمجارە لە دەرچوونی نیگاری کریستاڵەکان لەسەر کارتەکەدا

زۆر هاژو سەرسام بوو. بیکۆریڵ لەم لیکۆڵینەوەیدا بۆی دەرکەوت کە ئەو درەوشە فۆسفۆرینەی لە تاقیکردنەوەی یەکەم جاریدا بە ئەنجامی دا بوو هیچ بەو نیازەی ناگەیەنێت. ئیتر دوای ئەوە خۆی تەرخان کرد بۆ رەبازو لێکۆڵینەوەی ئەو دیاردە نوێیەی کە بە رێکەوت دۆزیبویەوە، هەر دەسبەجێش بۆی دەرکەوت لەو تاقیکردنەوەیەدا کە ئەو تیشکانەی یۆرانیۆم ئەیداتەوە برێتین لە تیشکە ئێکسەکان (هەرچەندە ئەم تیشکانەیان بۆ دەمێك ناونابوو تیشکی بیکۆریڵ بەڵام ئەم تیشکدانەوەیە سروشتێکی تایبەتە بە توخمی یۆرانیۆمەوە Uranium). ئەم تیشکدانەوەیەش پەیدادەبێت بێ ئەوەی هیچ کارلێکێکی کیمیایی رووبدات، بیکۆریڵ لەمەوە بۆی دەرەنجام بوو کە تیشکدانەوەی ئەتۆمی وەنەبێت بە کارلێکی کیمیایی پەیدابێت بەڵکو یەکێکە لەو رەوشتە سروشتیانەی کە تایبەتە بە گەردیلەکانی توخمی یۆرانیۆمەوە.

بیکۆریڵ لەساڵی ١٨٩٦ زدا حەوت زانستنامەی بڵاوکردەوە دەربارەی ئەو دیاردەیەی کە دۆزیبویەوە. لەو زانایانەی کە زۆر گرنگی ئەدا بە نووسراوەکەی خاتوماری کۆری بوو، ئەمیش بۆی دەرکەوت کە توخمی ثۆریۆم Thorium هەمان رەوشتی تیشکدانەوەی هەیە. دواییش بە خۆیو مێردەکەی پییرکۆری دوو توخمی تریان دۆزییەوە پۆلۆنیۆم Polonium و رادیۆم Radium، ئەمانەیش هەمان رەوشتی تیشکدانەوەیان هەیە. ئەم دوو زانایە (مادام کۆریو مێردەکەی) یەکەم کەسێك بوون کە زاراوەی (تیشکدەر) یان بەکارهێنا بۆ پەسنی ئەم دیاردەیە.

ئیتر لەوە بەدوا زۆر لە زانایان هاتنە پێشەوە بییری خۆیان خستەکار

لەم بوارەدا، کەوتنە شیکردنەوەی تیشکی بیکۆرێلّ، بۆیان دەرکەوت کە لە سێ جۆر تیشکی جیا پێکهاتووە تیشکی ئەلفا، تیشکی بێتا. تیشکی گاما.

بیکۆرێلّ سالّی ١٩٠٣ ز خەلاّتی نۆبلّی لە فیزیکدا پێ بەخشرا. هەروەها (خاتوماریو پییر کوری)یش...

بیکۆرێلّ سالّی ١٩٠٨ ز لە شاری کرۆیزیك - فەرەنسا کۆچی دوایی کرد.

تیشکدانەوەی ئەتۆمی رشتەیەکی زۆر گرنگەو لە چەندین بوارد بایەخی پێدەدرێت وەك فرەکارپێکردنی لە چارەسەرکردنی نەخۆشی بە تایبەتی نەخۆشی کانسەر. هەروەها سوودی گرنگی لە زانسگەریەکاند یارمەتیان ئەدات بۆ گەیشتن بەو زانیاریانەی دەربارەی پێکهاتنی گەردیلە. تیشکناکان (detectors) بەکاردەهێنرێن لە زانستگەرییە زیندکیمیکەکاندا. هەروەها بەکاردەهێنرێن لە زانینی تەمەنو چۆنیەتی دروست بوونی تاوێرە بەردەکانو چینەکانی زەوی لە چاخە جیاوازکانی جیۆلۆجیدا.

○



# گریگۆری مەندڵ...

١٨٢٢ ز – ١٨٨٤ ز

**Gregory Mendel**

گریگۆری مەندڵ لەم ڕۆژانەدا کە ناسراوە بەو پیاوە مەزنەی قانونە بنەڕەتیەکانی زگماکزانی‌ی دۆزییەوە... ژیانی بە تەرسایی بردۆتە سەر. ئەو زانستگەرییانەی کە بە ئەنجامی هێنا لەو ڕشتەیەدا زۆر گرنگ بوو کەچی ئەوەندەیش بایەخیان نەبوو لە کۆڕی زانستاندا (چونکە سەریان لەو بنەڕەتیانە دەرنەدەکرد) .

مەندڵ ساڵی ١٨٢٢ز لەدایك بووە لە شاری (هایزندۆرف) کە ئەو دەمە سەربە ئیمپراتۆرێتی نەمسا بوو. لەساڵی ١٨٤٣ زدا خۆی گەیاندە دێرێکی نەمسایی لەشاری (برۆن) ، لە ساڵی ١٨٤٧ زدا ناوی

تەرسالی پیادابرا، لە ساڵی ١٨٥٠ زدا چووە تاقیکردنەوەوە بۆ ئەوەی بیێتە مامۆستا بەڵام تیادا شکستی هێنا لەبەرئەوەی کە پلەی نزمی وەرگرتبوو لە دوو ڕشتەی بایۆلۆجیاو جیۆلۆجیادا. لەگەڵ ئەوەیشدا لێپرسراوی دێرەکە ناردیە زانکۆی ڤییەناو وانەکانی بیرکاری‌و زانستەکانی پێ‌خوێند، بەمەیشەوە هەر نەیتوانی بڕوانامەی مامۆستایەتی دەسکەوێت. هەر چونێك بێت لەساڵانی ١٨٥٤ ز - ١٨٦٨ زدا دانرا بە جێگر مامۆستای زانستە سروشتیەکان لە خوێندگای (برۆن)ی نوێ.

سەرەتای کارەکانی لە ساڵی ١٨٥٦ زوە دەستی پێکرد. لەپێشدا دەستی کرد بە چەند تاقیکارییەکی گرنگ لە ڕووەك پەروەردە کردندا. لە ساڵی ١٨٦٥ زدا ڤانونە ناوبانگەکانی زگماکی بە ئەنجام هێناو بە نامەیەك پێش‌کەشی کۆمەڵەی مێژووی سروشتی کرد لە برۆن.

لەساڵی ١٨٦٦ زدا کارنامەکانی لە گۆڤاری کۆمەڵەکەدا بلاوکردەوە، هەرچەندە ئەم گۆڤارە ئەوەندە برەوی نەبوو بەڵام دەگەیشتە زوربەی نامەخانە گشتیەکان.

مەندل هەر کۆڵی نەدا، ڕوونوسێکی لە کارنامەکانی ناردبۆ زانای زگماکزانی بە ناوبانگ (کارل نیگلی). هەرچەندە ئەمیش ئەنجامەکانی ڕەچاو کرد بەڵام سەری لێدەرنەکردو نەیتوانی گرنگی ئەو دۆزینە مەزنەی مەندل بسەنگێنێت. کارنامەکانی لە نێو کۆمەڵگای زانستیشدا پشتگوێ خراو ئیتر هەروا بۆ نزیکەی ٣٠ ساڵ بە بێ بایەخ مایەوە.

لەساڵی ١٨٦٨ زدا بە سەرۆکی دێری تەرسالی دامەزرا، ئیتر لەوکاتەوە لەبەر کارو ئەرکە ئاینییەکانی دەرفەتی ئەوەی نەبوو، خۆیشی نەیدەپەرژایە سەرئەوەی کە ئاوڕێك بداتەوە لە تاقیکردنە

زانستەکانی .

لەپاش سالّی ١٩٠٠ زدا سیّ‌زانا لەیەك کاتدا دەرکەوتن‌و ئەوانەیان دۆزییەوە کە پێشتر مەندلّ خستبوویەڕوو، بەلاّم کاتێك کارنامەکانی (مەندلّ) یان خوێندەوە دانیان بەوەدانا کە ئافەرین‌و فرایستەی ئەو کارە مەزنە دەگەڕێتەوە بۆ بلیمەتی مەندلّ‌و هەر ئەویش بە خاوەنی ئەو دۆزینەوە دادەنرێت .

ڕاستیەکانی بیردۆزەی مەندلّ دەربارەی زگماکزانی‌ی لەوەدا دەردەکەوێت کە گشت زیندەوەرێك یەکە سەرەکیەکانی تێدایە پیّ‌ی دەووترێت (جینەکان Genes)، بەهۆی ئەم جینانەوە ڕەوشتە زگماکیەکان لە نێرومیّ‌وە دەگویزرێتەوە بۆ نەوە .

ئەو ڕووەکانەی کە مەندلّ لیّ‌دەکۆڵینەوە هەر یەکێك لە پەسنە تایبەتیەکانی وەك ڕەنگی تۆو، شێوەی گەلاّ بوو... دووان لەم جینانە دەبنە هۆی پەیدابوونیان، هەر جینێك لە نێرو هەر جینێك لەمیّ دەبنە هۆی پەیدابوونی دیاردەیەك، مەندلّ سەیری کرد گەر ئەم دوو جینەیەك ڕوخسار نەبن ئەوا یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا زالّ دەبێت‌و دەردەکەوێت .

مەندلّ پەیی بەوەبرد کەهەر خانەیەکی زەهابی Genital Cell ئیتر چ تۆوی نێرینە بێت Spermatocyte یان گەرای مێینە بێت Ovula (وەك لەمرۆڤدا). تەنها یەك جینی تێدا دەبێت کە بە ڕێکەوت دەگوێزرێتەوە لە پێشینانەوە بۆ پاشینان. بەهەر چۆن بێت قانونەکانی مەندلّ (بەچەند ڕاستکردنەوەیەکی کەم) بوونە دەروازەیەك بۆ زانستی‌ی زگماکزانی[1] نویّ .

---

(1) پزگاری: علم الوراثه



# جۆزیف لیستەر...

۱۸۲۷ ز - ۱۹۱۲ ز

Joseph Lister

جۆزیف لیستەر،ئەو پزیشکە مەزنەبوو کە لە سەرەتادا گیراوە پاکژەرەکانی بەکارهێنا لە نەژدارییدا. ساڵی ۱۸۲۷ ز لە شاری (ئایتۆن - ئینگلتەرە) لە دایك بووە. لە ساڵی ۱۸۵۲ زدا بڕوانامەی پزیشکی ی لە زانکۆی لەندەن وەرگرت، لە ماوەی خوێندنیدا بە زانکارێکی زۆر زرنگ ناوی دەرکردبوو. لە ساڵی ۱۸٦۱ زدا بووە نەژدارکار لە بیمارخانەی شاهانەی گلاسکۆ بۆ ماوەی ۷ ساڵ. هەر لەو ماوەیەیدا ئەو ڕێگەی دەربارەی خاوێن ڕاگرتنی برین Disinfected Surgery دۆزییەوەو خستیە ڕوو .

لیستەر کە لێپرسراوی قاوشێك بوو لە پەخشی نەژداری ئەو بیمارخانەیەدا، بۆی دەرکەوت ژمارەی مردن لە نەژدار گەریدا زۆر دەبێت. جا لە ئاکامی ئەو کارەدا نەخۆشەکان زوربەیان دووچاری زامێکی سامناك دەبن وەکو گانگرین Gangrene کە لە ناویاندا زۆر ڕووی ئەدا .

لیستەر هەر هەوڵ‌و تێکۆشانی ئەوەی بوو کە قاوشەکەی بە شێوەیەکی گشتی خاوێن بیهێڵێتەوە، بەڵام خۆ ئەمەی بەس نەبوو بۆ ئەوەی ڕێژەی زۆربوونی مردن کەم بکاتەوە. هەندێك پزیشکی بیمارخانەکە لە بیانووی ئەوەدا بوون کە گوایە ئەو پۆخ‌و هەڵمەی دەردەچێت لەو مادە زیانبەخشانە بەلەش دەبنەهۆی زۆر بوونی مردن .

بەڵام لیستەر بەم بیانووانە هەر دانەکەوت. لە دواییدا ساڵی ١٨٦٥ ز نامەیەکی زانستی لویس پاستۆری خوێندەوە کە لە کاتی خۆیدا نووسیبووی. ئەم نامەیە دەروویەکی ڕۆشنی بۆلیستەر کردەوەو بەو میکرۆبانەی ناساند کە دەبنە هۆی نەخۆشی .

لیستەر لەمەوە بۆی دەرکەوت کە هەر میکرۆبە دەبێتە هۆی تووش بوونی نەخۆشی‌و تەنینەوەی لە پاش نەژدارگەریی. باشترین ڕێگەیش بۆ ئەو میکرۆبانە ئەوەیە کە بکوژرێن پێش ئەوەی بگەنە سەر ئەو زامە دەمکراوانە. بۆ ئەم مەبەستە بایەخی دایە بەکارهێنانی ترشی کاربۆلیك (واتە فینۆڵ) C6H5OH بۆ کوشتنی ئەو میکرۆبانە. ئینجا هەستا بە جێبەجێ‌کردنی هەندێ خاوێنکاریی. وەنەبێت هەر تەنها دەستی بە دڵنیاییەوە خاوێن دەکردەوە بەڵکو زۆر سووریش بوو لەسەر خاوێنکردنەوەی ئەو ئامرازو کەرەساتەی کە بەکاردەهێنران‌و دادەنران

بۆ سارێژکردنی زامەکە. سەرەڕای ئەمانەیش کە دەیکرد، ژووری نەژدارگەریەکەی هەر بە ترشی کاربۆلیك دەپژاند .

لە ئاکامی ئەم کارانەیدا بۆی دەرەنجامبوو کە ژمارەی مردووان بە ڕادەیەکی درامی کەمبۆتەوە، سەرنجی‌دا ڕادەی مەرگەوەری Mortality لە قاوشی پیاواندا سالأنی ١٨٦١ز – ١٨٦٥ز گەیشتبۆوە ٤٥٪، بەلأم بەر لەسالی ١٨٦٩ز بە ڕێگەکەی لیستەر نە خاوێنکاریيدا کەمبۆتەوەو گەیشتۆتە نزیکەی ١٥٪ .

لیستەر لە سالی ١٨٦٧زدا یەکەم پەڕەی بلأوکردەوە دەربارەی زامخاوێنی Disinfection Surgery بەلأم ئەوەندە بەزوویی نە نێوپزیشکانو بیمارخانەکاندا پەسەندنەکرا .

پاش دەمێك داوای لێکرا ببێتە ئوستادی زامە ئەکلینکیەکان Clinical Surgery لە زانکۆی ئەدنبرە، لەو حەوت ساڵەی زانکۆد توانی بیرەکانی تەواو بخاتە ڕووو ناوی پێدەربکات.

لە سالی ١٨٧٥ زدا دیدەنیەکی ئەلەمانیای کرد، لەوێ چەند کۆڕێکی دەربارەی بیرەکانو شێوازەکانی لەم بوارەدا سازکرد، پاش چوو بۆ وولأتە یەکگرتووەکان هەربۆ ئەو مەبەستەی، بەلأم هێشت زوربەی پزیشکەکان ئەوەندە بایەخیان بە بیروراکانی نەئەدا .

لە سالی ١٨٧٧ زدا داوای لێکرا بە ئوستادی نەژداری ئەکلینکی لە کۆلێژی شاهانەی لەندەن، بۆ ماوەی ١٥ سال لەوێ مایەوە. لەو ماوەیەیدا بەرەبەرە ئەو بیرانەی دەربارەی زامخاوێنی زۆر گرنگی پی‌ئەدرا لە نێوەند پزیشکەکانی لەندەن‌دا، هەر بە یەجگاریش کاری پێدەکرا .

جا لە پاداشتی ئەو کارە مەزنو کاریگەرانەیدا گەلێ نەوازشو

شاباش کراو زۆر ڕێزی لیٚ گیرا. بۆ ماوەی پێنج ساڵیش دانرا بە سەرۆکی چفاتی شاهانەو بە پزیشکی تایبەتی خاتو فیکتۆرشا . .

ئەو زانا مەزنە بە وەجاخ کوێری بۆ ماوەی ٨٠ ساڵ ژیا. لە ساڵی ١٩١٢ زدا لە شاری والمد - ئینگلتەرە کۆچی دوایی کرد .

ئەم نوێکاریە گرنگانەی کە دکتۆر لیستەر دەستی دایەو بە ئەنجامێکی سەرکەوتوانەی برد، بە شۆرشێك دادەنرێت لە جیهانی نەژدارگەریداء وە بووە هۆی ڕزگاکردنی ملیۆنان کەس لە مردن. سەرەڕای ئەوەیش کە سامی ئەو پزیشکانەی شکاند کە جاران نەیاندەتوانی نەژدارریی بکەن لەترسی تەنینەوەی زامەکەو بلاوبوونەوەی بۆ ئەم و ئەو .



# نیکۆلاس ئۆگەست ئۆتۆ

١٨٣٢ ز - ١٨٩١ ز

**Nikolaus August Otto**

نیکۆلاس ئۆگەست ئۆتۆی مەزن ئەو داهێنەرە ئەڵەمانیە بوو کە بۆ یەکەمین جار مەکینەی ناوەتەقێن (١) بە چوار دەسك Four Pestles نەخشاندو دروست کرد. ئەم داهێنراوەی بە یەکەمین نموونەیەکی دروستکراو دادەنرێت بۆ سەدان ملیۆن لەو ئامێرانەی کە لەو سەردەمەوە دروستکراون تا ئێستا .

مەکینەی ناوەتەقێن داهێنراوێکی زۆر بە سوودە، لەو سوودانەی... بەکاردەهێنرێت بۆ هێزپێدانو جوڵە بە ئۆتۆمۆبێل و بەلەمە ئامێریەکانو موتۆرسایکلەکان. چەندین کاری پێدەکرێت لە پیشەسازییەکاندا. کەرەسەیەکی پێویستو بژێوە لە فڕۆکەسازییدا

بەلاّم کارپێکردنی لە جوولاّندنی ئۆتۆمۆبێلدا لە هەموویان زیاتر باوە .

پێش ئۆتۆ زۆر هەولّو تەقەللا دەدرا بۆ دروستکردنی ئۆتۆمۆبێلّ، بەلاّم هیچ داهێنەرێك نەیتوانی بگاتە ئەوەی جۆرێکی گەوار لەو مۆتۆرانە دروست بکات کە سەنگی سووك بێتو تواناییەکی زۆری هەبێت. لەوانەیشە ئەو داهێنەرانە توانیبێتیان چەند جۆرێکی بەهێزو باشتر دروست بکەن . بەلاّم سەدان ملیۆن لەو ئۆتۆمۆبێلانەی کە لەم سەدەی ئێستادا دروست دەکرێن ٩٩٪ یان مەکینەی ناوەتەقێنی چوار دەسکییان بۆ بەکاردەهێنرێت

مەکینەی (مازوت) یش کە شێوەیەکە لە شێوەکانی مۆتۆری تەقێنەر بەکاردەهێنرێت بۆ ئۆتۆمۆبێلی بارو پاسو پاپۆرەکان. ئەم مۆتۆرانە بە شێوەیەکی سەرەکی لە مۆتۆرەکانی (ئۆتۆ) دەچن واتە چوار دەسکییان بۆ بەکاردەهێنرێت بەلاّم سوتەمەنییەکەی دەچێتە قۆناخێکی جیاوازەوە .

زوربەی ئەو داهێنراوە زانستانە بێجگە لە چەکسازیو تەقەمەنی بۆ سوودو خزمەتگوزاری مرۆڤ هاتونەتەکایەوە. زۆر بە دەگمەن... بۆ نموونە هەلّدەکەوێت یەکێك هەستێت پێشنیاری سەرزەنشتی ی مرۆڤ بکات لە بەکارهێنانی پەنسلین یان ئەو ئامرازو دەرمانانەی کە لە تای‌لەشی مروڤ کەم دەکاتەوەو سنووردانان بۆ بەکارهێنانیان. بەلاّم لە بەکارهێنانی ئۆتۆمۆبیل بەرادەیەکی یەجگار زۆرو بلاّو سەرزەنشتو مەترسی لە دوایە، چونکە زۆر ئاشکرایە کە ئۆتۆمۆبێل وورە وورێکی بێزارکەرو ناسازی هەیە. سوتەمەنی زۆر کاردەکات کە ئەمەیش دەبێتە هۆی پیس‌بوونی هەوا. ئاکامی ئەم زیانانەیش دەبێتە هۆی دوچاری نەخۆشیو مردنی سالاّنە لە نێو مەردومدا. بەلاّم بێگومان... گەر

ئۆتۆمۆبێل سوودی زۆر باشی نەبێت بۆ مەردوم ئەوەندە بایەخی پێ نادرێت. خۆ ئۆتۆمۆبێلی تایبەتی ئەوا زیاتر لە بارترە لە ئۆتۆمۆبێلی تر، لەبەر ئەوەی کە دەتوانیت بە ئارەزووی خۆت کاری پێبکەیت و چۆن... و کەی بتەوێت دەتگوازێتەوە بۆ هەر کوێیەك بتەوێت زۆر بە ئاسانی و بە گورجی. سەرەرای ئەوەیش کە بووە هۆی ئەوەی مرۆڤ زیاتر سەربەستیانە رەفتار بکات.

گەر بۆ نموونە وولاتە یەکگرتووەکان بگرین سەیر دەکەین پتر لە سەد ملیۆن ئۆتۆمۆبێل هەیە کە پتر لە هەزاران ملیۆن میل دەبرن لە سالێکدا، ئەم دوور برینەیش زۆر زۆر ترە لەو دووریەی شەمەنەفەرو فرۆکەو پاپۆرەکان... دەیبرن.

نیکۆلاس ئۆتۆ دروستکەری ئۆتۆمۆبێل سالی ١٨٣٢ ز لە شاری هولز هاوزن – ئەلمانیا لە دایك بووە. لە مندالیدا باوکی مرد، ئەم کارەساتەی بووە هۆی ئەوەی کە لە تەمەنێکی زوودا دەست لە خوێندن هەلبگرێت و بکەوێتە کارکردن، لە پێشدا بووە شاگرد بە قال لە شارێکی بچووك، پاشان بووە فرۆشیارێکی گەرۆك.

لە نزیکەی سالی ١٨٦٠ زدا بوو بیستی کە مۆتۆری گازی داهێنراوە بە دەستی (ئەتینی لینیۆر)، ئەمیش (واتە ئۆتۆ) لە کانوونی دووەمی ١٨٦٢ زدا یەکەم نموونەی لەو ماتۆرە چوار دەسکییە دروست کرد. هەر چەندە تەگەرەو کۆسپێك رێی لە پرۆژەکەی گرت، بەلام توانی بە هەر چۆنێك بێت بروانامەی داهێنان بە دەست بهێنێت.

پاش ماوەیەك هاوکارێکی بۆ پەیدابوو بۆ یارمەتی دان و دەسگیرۆیی پرۆژەکەی. لەگەل هاوکارەکەیدا وەرشەیەکی بچوکیان پێکەوە کردەوە بۆ چاکاری و گورانکاری لەو جۆرە مۆتۆرانەدا.

یەکێکی تریش هاتەکایەوە کە کارێکی باڵای گێڕا لە پەرەپێدانو گۆڕانکاری پیشەسازی ئۆتۆمۆبیلدا، ئەویش داهێنەرو کارمەندی بەناوبانگی ئەمەریکایی (هێنری فۆرد) بوو کە بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٨٩٦ زدا ئۆتۆمۆبێلێکی دروست کرد بەڵام نموونەی ئەو ئۆتۆمۆبێلە لە ساڵی ١٩٠٨ زدا ئینجا دەرکەوت لە بازاڕ. جا ئەوانەی کە بە تێکرا شایانی رێزو ئافەرینن لە داهێنانی مەکینەی ناوەتەقینو بێ‌ووچان گۆڕانکارییان تیایدا کردووە ئەمانەن: لینبۆر، ئۆتۆ، دایملر، بنز، فۆرد .

---

(١) Internal explossion engine.



# لويس داجوری...

١٧٨٧ز - ١٨٥١ز

Lauin J. Dagurre

لويس جاك داجوری... ئەو پياوە مەزنە بوو كە بۆ يەكەمين جار رێكارێكی بۆ وێنەی فۆتۆگرافی دۆزييەوە .

ساڵی ١٧٨٧ ز لەشاری كۆرميلی - باكووری فەرەنسا لە دايك بووە . ئەم هونەرمەندە لە لاوێتی‌دا توانی دايۆرامايەك[1] دروست بكات. هە چەندە لەم لاوە بەم كارەيەوە خەريك بوو بەڵام لە لايەكی تريشەوە زۆر گرنگی ئەدا بە وێنەكردنی ديمەنی جيهانی سروشت بێ‌ئەوەی فڵچەو بۆيەی رەنگاورەنگ... بەكاربهێنێت (واتە زۆر گرنگی ئەدا بە چۆنيەتی دروستكردنی كامێرا).

سەرەتای کۆششی لەم بوارەدا سەرکەوتوونەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٨٢٧ زدا بە ڕێکەوت (جۆزیف نیپسی) بینیو خۆیی پیێناساند ئەمیش لەوکەسانە بوو کە زۆر خولیای ئەوکارەی هەبوو، هەردوکیان پێکەوە کەوتنەکار بەڵام ئەوەندەی نەبردکە جۆزیف ماڵاوایی لێکردو لە ساڵی ١٨٣٣ زدا مرد، داجوریش هەر چەندە بە تەنها مایەوە بەلاّم هەر سوور بوو لەسەر ئەوکارە، بەر لە ساڵی ١٨٣٧ زدا نیازەکەی هاتەدیو گەیشتەئەنجام، ڕژێمێکی کارکردنی بۆ وێنەی فۆتۆگرافی داهێناو هەر بەناوی خۆیشیەوە ناسرا.

لە ساڵی ١٨٣٩ زدا ئامێرەکەی بڵاو بووەوەو کەوتە دەست خەڵکی بێ ئەوەی داوای داهێنانامەی بکات، بەڵام میریی فەرەنسا موچەی خانەنشینی بۆ خۆیو کوری هاوکارەکەی (نیپسی) بڕییەوە.
ئەم کارەی بووە هەڵا لە نێو خەڵکاندا، لە هەموو لایەکەوە دەستی هێژاو ڕێزیان دەنایەسەرو پیرۆز باییان لێدەکرد تاوای لێهات ناویان دەبرد بە پاڵەوانی چەرخ.

داجوری... لەپاش ماوەیەك خانەنشین بوو، لە ساڵی ١٨٥١ز یشدا کۆچی دوایی کرد پاش ئەوەی ئەو ڕێکارە مەزنەی بەخەڵك ناساندو بە فراوانی بڵاو بووەوە.

کەم لەو داهێنەرانە سوودیان هەبووە وەك داجوری، چونکە بەڕاستی ئەم داهێنراوە گەر سەیری بکەین... لە هەموو کارو زانستگەرییەکدا بەکاردەهێنرێت، لە هەموو کارێکی پیشەسازیيو سەربازییدا دەخرێتە کار. هونەکارییەکی زۆر سامناکە لای هێندێ کەسو لەلایەکی تریشەوە خۆش ئارەزوویەکە بۆ زۆربەی. بەڵام بەگشتی گەر ڕاوێژی خۆمان بکەینو سوودەکانی بخەینە پێش چاومان

بۆمان دەردەکەوێت کە وێنەی فۆتۆگرافی زانیارییەکی تەواومان دەداتێ لە رۆشنبیریی‌و رۆژنامەگەری‌و پروپاگەندەدا. سەرەرای ئەوەیش کە تۆمارکەرێکە بۆ یادگاری چەندین بۆنەو بارو گوزەرانی ژیان، جگە لەوەی کە بە بناغەو تەواو کەرێك دادەنرێت لە سینەما سازییدا.

هەروەك سەرنج دەدرێت زۆر بە دەگمەن هەڵکەوتووە تا کە یەکێك بە ئەنجامی کارێکی مەزنی وەها گەیشتبێت. بێگومان ئاشکراو دیارە لەم بوارەدا کە چەندین زاناو داهێنەرکاری باڵایان هەبووە لە چەڵاندی داهێنانەکەی داجوری، وەك زانای ئینگلیزی (ولیەم فۆکس تالبوت) کە لە ساڵی ١٨٣٩ زدا رێکارێکی نوێی دۆزییەوە بۆ جامی وێنە (Negative) ئەوەی کە ئێستا باوە. جا سەیر ئەوەیە کە تالبوت خۆی خەریکو جەنجاڵ کردبوو بە هێندی پرۆژەی ترەوە. ئیتر ئەوەندە گوێی نەئەدایە ئەم داهێنراوە گرنگەی. گەر بایەخی پێ‌بدابایە لەوانە بوو بە داهێنەری وێنەی فۆتۆگرافی دابنرابایە پێش داجوری.

(١) دایۆراما: سنوق جیهان یان سنوق جادویی (سەمەرە) پی‌دەڵێن، بریتییە لە سنوقێك کونێکی بچوکی تێدایە، لەو کونەوەرا سەیر دەکرێت‌و وێنەی تیادا دەبینرێت لە سەردەمی ٣٠ - ٥٠ ساڵە کاندا لای خۆمانیش پیشانی منداڵان دەدرا بە تایبەتی جەژنان.

- وەرگێر -



# جۆزیف ستالین...

١٨٧٩ ز- ١٩٥٣ز

Joseph Stalin

جۆزیف ستالین... ئەو پیاوە بوو کە بۆ چەندەها ساڵ توانی فەرمانڕانی یەکیەتی سۆڤیەت بکات. لە ساڵی ١٨٧٩ زدا لە شاری جوری سەر بە جۆرجیای قەفقاسی لە دایك بووە. پاش ماوەیەك خۆی فێری زمانی ڕووسی کرد بێجگە لە زمانەکەی خۆی (زمانی جۆرجیایی)، جا لە ئاخاوتنی بە زمانی ڕووسی دەمودوی زمانەکەی خۆی پێوە دیار بوو.

ستالین لە نێوەندێکی هەژاردا پەروەردە بووە، باوکی هەمیشە سەرخۆش و مەست بوو، لە بەرئەوە ئاگای بە گوزەرانی کوڕەکەیەوە

نەبوو بگرە دراندانەیش ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرد، لە تەمەنی ١١ ساڵیدا باوکی مرد. لە تەمەنی لاوێتیدا خۆی گەیاندە خوێندگایەکی کەنشتە لە شاری جوری، پاشان چووە ئامۆژگای لاهوت لە شاری تەفلیس، بەڵام بە هۆی بیروباوەڕی چەپڕەوییەوە ساڵی ١٨٩٩ ز لە ئامۆژگاکە دەرکرا.

پاش ئەوە بە ماوەیەك خۆی خستە نێو بزوتنەوەی مارکسایەتی. لە ساڵی ١٩٠٣ ز دا خۆیدایە پاڵ بەرەی بەلشەوییەوە. ئیتر لەو ساڵانەی دوایی تاکو ساڵی ١٩١٧ ز بە ئەندا مێکی چوستو چالاك لە پارتدا ناوی دەرکرد. زیاتر لە شەش جار خرایە زیندانەوە لە لایەن پیاوانی قەیسەرەوە بەڵام تاوانەکانی ئەوەندە سەخت نەبوون تاکو بە تەواوی و هەمیشە بمێنێتەوە لە زیندان. سەرەڕای ئەوەیش کە چەند جار توانیویەتی ڕابکات لە زیندان، هەر لەو ماوەیەیشدا نازناوێکی بۆ هەڵبژێررا بە ناوی ستالین (واتە پۆڵاد).

لەو دووساڵەی دوای شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ز زۆر بە چالاکی خۆی دەنواند تا لە ساڵی ١٩٢٢ زدا بووە ڕازگری گشتی پارتی کۆمۆنستی سۆڤیەتی. ئەو پلەو جێ بەرزە یارمەتی دا کە دەسەڵاتێکی سەرانسەری پەیدابکات لە نێو ڕیزەکانی پارتدا.

ئاشکرابوو لینین حەزی نەدەکرد لیۆن ترۆتسکی جێی بگرێتەوە چونکە هەستی بە سەرکێشی دەکرد، جگە لەوەیش کە لە پێش هەڵگیرساندنی شۆڕشدا نەیدەویست خۆی بخاتە پاڵ بەرەی بەلشەوییەوە. پاش ڕاڕاو دوودڵییەکی زۆر ئینجا ڕازی بوو خۆی بخاتە

پاڵ بەرەی بەلشەوییەوە سەرەڕای ئەوەیش کە لە ژێرەوە خەریکی فێڵ و پیلانگێران بوو تاکو بە هەرچۆنێك بێت بگاتە تەختی سەرکردایەتی. ئەو ڕەفتارو ڕێبازو هەڵانەیشی لەولاوە ڕابووەستێت کە دەیکرد لە ڕووی ڕێبازی مارکسی - لینینیدا.

لینین لە هەمان کاتیشدا زۆر سەرزەنشی ستالینی دەکردو بێداری دەکردەوە لەو کردەوە نابەجێیانەی کە پیێی هەڵدەستا، گرنگترینیان ئەوەبوو کە ئەوەندە بە تەنگ کاروباری هەڤاڵانەوە نەدەهات. حەزی بە خۆسەپاندنو تاکڕەوی دەکرد، جا لە کاتێکدا لینین دەسەڵاتی گرتە ئەستۆ مەرجی ئەوەی دانا کە دەبێت کۆمیتەی ناوەندی فراوانتربێت تاکو ژمارەیەکی زۆرتر بگرێتەوە لە کرێکاران،ئەم گۆڕانگارییە باشترین دەرفەتێك بوو بۆ ستالین تاکو چالاکی خۆی بنوێنێت و بگاتە ئەوەی ببێتە ڕازگری گشتی پارتی کۆمۆنست لە پاش مردنی لینین.

ستالین لە ماوەیەکی کەمدا توانی ئارەزووی (لیف کامینۆفو گریگۆر زینۆفییف) ڕابکێشێت کە هەردووکیان ئەندامێکی کارا بوون لە «پۆلیتبرۆ». بە هەرسێکیان سێقۆڵییەکیان پێکهێنا بە ناوی (سێ سوێنخوارەکە). بە هەرسێکیان توانیان زاڵ بن بە سەر ترۆتسکیو دۆستانیدا. ئا بەم چەشنە ستالین بە بلیمەتیو جەربەزەیی لە خەباتی سیاسییدا بووە پیاوی یەکەم لە یەکیەتی سۆڤیەتدا.

لە ئابی ١٩٣٩ زدا ستالینو هێتلەر ڕێکەوتنامەی ئاشتییان مۆرکرد بەڵام هێتلەر لە دواییدا ئەو ڕێکەوتنامەی پووچاندەوە، هێرشی بردە سەر بەڵام ئەنجامەکەی بە ڕماندنو شکستی هێتلەر کۆتایی هات.

لێرەدا فرایستەو ئافەرینی ستالین دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵی گرنگ‌و بەکار.

یەکەمیان : کۆششی بێ‌ووچانی لە پێشکەوتنی پیشەسازی یەکیەتی سۆڤیەو پەلەکردن لە بەرهەمدا.

دووەمیان: کاری بالآی لە بلاوکردنەوەی ڕێبازی کۆمۆنستی‌ی لە جیهاندا، بە تایبەتی لەو وولاتانەی دراوسێ‌و ئەو وولاتانەی کە لە ژێر سایەی دەسەلاتی یەکیەتی سۆڤیەتدان، سەرەرای ئەوەیش... پاڵهێزێك بوو بۆ پتەوترکردنی دەسەڵاتی کۆمۆنستانی گەلی چین بۆ گەیشتن بە دەسەڵات‌و دامەزراندنی ڕژێمێکی کۆمۆنستی لە چیندا.

○



# رينێ دیکارت...

یان... دێکارتس
١٥٦٩ز - ١٦٥٠ز

**Rene Descartes**

فەیلەسوفو بیرکارزانی فەرەنسایی ناسراو بە دێکارت... ساڵی ١٥٩٦ ز لە گوندی (لاهای) هاتۆتە جیهانەوە، لە هەرەتی لاویدا خۆی گەیاندە خوێندگای عیسایی. لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا بڕوانامەی پارێزەری وەرگرت بەڵام نەیکردە پیشەی ڕۆژانەی چونکە هەر لە خولیای ئەوەدا بوو کە چۆن دەرفەتێك بڕەخسێنێتو بکەوێتە گەشتو گەڕان بە ئەورووپادا، دەوڵەمەندی بنەماڵەکەیشی ئەوەندی تر ڕێکخۆشکەرێك بۆ ئەو بیرەی، کاری هێنانەدی ئەو خواستو نیازەی بۆ ئاسانکرد.

لە ساڵانی ١٦١٦ ز تاکو ١٦٢٨ ز چەند دیدەنییەکی ئیتالیو پۆڵەندەو دانیمارکی کرد، لەو گەشتەیدا گەلێ سەرنجو تێرانینی بۆ گەڵاڵە بووو کردیە ڕێبا زێکی گشتی بۆ گەڕان بەدوی ڕاستییدا.

لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا بڕیاریدا ئەو ڕێبازەی بچەسپێنێتو بەرنامەیەکی ڕاستو ڕەوانی بۆ بنەخشێنێت. کۆتایی گەشتەکەی بە دیدەنی هۆڵەندە هێنا، ئیتر هەر لەوێ بۆ ماوەی ٢١ ساڵ مایەوە. ئەمێشی بۆیە هەڵبژارد چونکە بڕوای وابوو کە ڕازوتەگبیری مرۆڤو بیروڕای ئازادی تیادا بەدی دەکرێت، سەرەڕای ئەوەیش... حەزی بە دوورەپەرێزی دەکرد لەو فرەبەرەکیو ناکوکییە سیاسییانەی کە لە پاریسدا هەبوو.

لە ساڵی ١٦٢٩ زدا پەراوێکی بە ناوی (چەند ڕێسایەك بۆ پێخاندنی[1] ئاوەز). ئەو ڕێبازەی... بە شێوەیەکی واڵاو نایاب ڕووندەکاتەوە کە دۆزیویەتەوە. هەرچەندە ئەم پەڕاوەی ئامادە نەبوو بۆ بڵاوکردنەوە لەبەر کەموکوڕییەك بەڵام لە پاش مردنی بە پەنجاساڵ بڵاوکرایەوە.

پوختەی ڕشتەکەی بۆ گەیشتن بە (ڕاستیی)... ئەو بیرە دەخاتە ڕوو کە مرۆڤ بایەتە لە سەرەتایەکی ژیرانەوە دەست پێبکات. جا بۆگەیشتن بەم «ڕاستیەیش» پێویستە گومان لە هەموو چیوەندێکی خۆی بکات... گومان لە زانیاری ئوستادەکانی بکات، لەو بڕوایانەیش کە پەیوەندییان پێوە هەیەو بوونەتە ژێدەرێك بۆ پتەوکردنیان.

هەروەها گومان لەو هەموو بیرانەی کە لە سرشتیی[2] دەکۆڵێتەوە... هەتا وەکو گومان لە جیهانی دەرەوە، تەنانەت بە بوونی خۆیشی... بە کورتی گومان لە هەموو شتێك....

ئەم چەشنە ڕێبازەی دێکارت بووە پەیداکردنی کێشەیەك، ئەویش چۆن مرۆڤ دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر گوماندا و چنگ لە زانین گیربکات؟. چۆن گیرۆدەی دەبێت و بۆ هەموو شتێك پیایدا رادەپەرموێت. لەبەرئەوە دەبینین دیکارت بە هۆی رەچە شەنگە بێژییەکی میتافیزیکی و ژیرانەوە، وە بە هەموو رەزامەندیی و راپەرمونێکەوە دەیسەلمێنێت کە (هەیە)، بەوەی کە بە خودی خۆی دەڵێت «گومان دەکەم.... کەواتە من هەم»، خودا هەیە... جیهانی دەرەوەیش هەیە. ئەمانە... خاڵە سەرەتایە سەرەکییەکانن لە بیردۆزەکەی دێکارت دا.

گرنگی بیردۆزەکەیشی لە دوو پەلدا خۆی هەڵدەدات: یەکەم – لە دانانی بیردۆزەی زانین و پرسیارکردن لیی و لە ناوەرۆکی رژێمە فەلسەفیەکەی (بناغەی زانینی مرۆڤایەتی چیە... ؟).

فەیلەسوفە پێشینەکان لە تێکۆشانی ئەوەدا بوون کە چۆن سروشتی جیهان یەکالا بکەنەوە. بەڵام دێکارتی زرنگ ووریامان دەکاتەوە و دەیخاتەوە یادمان کە ئەم پرسیارە ناکرێت بە شێوەیەکی گریمانی چارە سەربکرێت گەر نەبەسترێتەوە بەو پرسیارەی کە دەڵێت چۆن بزانم ... ؟

دووەم – لەو پێشنیارانەی کە دەیخستە روو سوور بوو لە سەر ئەوەی کە نابێت یەکسەر بە بێگومان دەستبکەینە رەبازو لێکۆڵینەوە بەڵکو بە تیروانین و شیکاریی. ئەم پێشنیارانەیشی پێچەوانەی ئامۆژگاریی و موچیارەکانی قەشە ئۆگەستینە.

لەو چەمکە گرنگ و بەناوبانگانەی دێکارت کە پەیوەندی بە گیتییەوە هەیە ئەوەیە کە لەو بروایەدا بوو هەموو گیتی بە شێوەیەکی

میکانیکی‌و شیرازەیەکی ڕێك‌وپێك دەبزوێت جگە لە خودای مەزن‌و یەزدی[1] مەردم. ئا بەم چەشنە دەتوانرێت بەو هۆیە میکانیکانەوە ئەو ڕووداوە سروشتانە بڕەوێنرێتەوە لەم چەمکەیەوە تەواو بەرهەڵستی لە ستێرەگرەوان‌و جادوگەران وە گشت شێوە ئەفسەنیەکانی تر دەکرد. هەروەها بەرهەڵستی لە گشت لێکۆڵینەوەیەکی لاهوتی دەکرد دەربارەی ڕووداوە سروشتەکان.

---

(١) پێخاندن : ئاراستەکردن

(٢)سرشت : فطری



# یۆلیۆس قەیسەر...

١٠٠ پ ز - ٤٤ پ ز

Julius Caesar

یۆلیۆس قەیسەر کە سەرکردەیەکی لێهاتوو و سیاسیەکی رۆمانی بەناوبانگ بووە ... ئەو سەردەمەی کە ئەوی تیادا لە دایك بوو (ساڵی ١٠٠ پ ز) رۆمان لەوپەڕی ئاژاوە و شێواوی‌و نالەباریدا بوو.

ئیمپراتۆریێتی رۆمانی بەربڵاو... لە سەدەی دووەمی پ‌زیدا دامەزرا پاش ئەوەی کە لە جەنگەکانی (پونیە) دا بە سەر قەرتاجەدا زاڵ بوون. ئەو داگیرکردن‌و سەرکەوتنە بووە مایەی دەوڵەمەندی‌و سامانێکی زۆر بۆ رۆمان، لە هەمان‌کاتیشدا بووە مایەی تێکچوونی شیرازەی ئابووری‌و کۆمەلآیەتی . زۆربەی جوتیاران‌و کشتیاران لە

زەویەکانیان هەڵکەنران‌و بێ‌دەرەتان گوزەرانیان دەکرد. ئەنجومەنی پیرانی ڕۆمان کە هەر لە بنەڕەتدا پێکهاتبوو لە پیرانی شارۆکەیەك تواناى ئەوەی نەبوو ئەو ئیمپراتۆریەتە بەربلاوە ببات بەڕێوە. بەد سیاسی سەرانسەر دەریای ناوەڕاستی گرتبووەوە، ئەمەیش دەگەڕایەوە بۆ بەدڕەفتاری‌و شێواوی دەسەلات.

یۆلیۆس قەیسەر تا کە پێشرەوێکی سیاسی بوو کە دەنگی بێزاری بەرزکردەوە لە دەوڵەت، دەیگوت دەوڵەتی دیموکراسی لەوەدا نەماوە کە ئیتر بتوانێت شیرازەی خۆی بگرێتەوە چونکە تازە کار لە کار ترازاوە.

یۆلیۆس قەیسەری سالار دەچێتەوە سەر بنەماڵەیەکی ئەرەستۆکراتی پارێزراو لە ڕۆما. لە هەرەتی لاوێتی‌دا خۆی هەڵقورتانە ژیانی سیاسەت‌و سەربازییەوە، لە تەمەنی ٤٠ساڵیدا کرا بە فەرمانڕانی سێ هەرێم‌و سەرکردەی لەشکرێکی ٢٠ هەزار جەنگاوەر.

لە ساڵانی ٥٨ – ٥١ پ‌ز قەیسەر ئەم هێزەی خستە کار بۆ هێرش بردن‌و چوونە نێو وولاتی (گاڵ)ەوە. ئەو ناوچە فراوانەی کە ئێستا فەڕەنساو بەلجیکاو بەشێك لە سویسرەو ئەڵەمانیاو هوڵەندەی پێ دەوترێت. هەرچەندە ژمارەی سوپاکەی کەمتر بوو لە سوپای دوژمن بەلام بە ئازایەتی‌و لێزانینی سەربازی توانی زاڵ بێت بەسەر خێڵەکانی (گاڵ)داو زەویەکانی چۆمی ڕاین بخاتە سەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان. دوو شالاوی بردەسەر بەریتانیا توانی داگیری بکات بەلام ئەوەندەی تیادا نەمایەوە.

ئەم سەرکەوتنانەی ترس‌و سامی خستە نێو ناحەزە سیاسیەکانیەوە لە ئەنجومەنی پیراندا، لەبەر ئەوە فەرمانیان پێکرد بگەڕێتەوە بۆ ڕۆما

قەیسەریش کە بیستی وا ناحەزە سیاسیەکانی خەریکی لە ناو بردنین ، خۆی گورج کردەوەو سوپاکەی بە رووباری (رۆبیکۆن)دا پەڕانەوەو بەرەو رۆما کشا. لە پاش جەنگێکی چوار ساڵە توانی سوپاکانی سەربە ئەنجومەنی پیران راشکێنێت‌و سەرانسەری رۆما بگرێت، دوای ئەو سەرکەوتنەی ئیتر کرا بە دیکتاتۆر تا دوا ژیانی .

لە شوباتی ٤٤ پ زدا تاجی شاشانی پێدرا بەڵام نەیویست ، چونکە لەو بڕوایدا بوو کە ئیمپراتۆرێتی بەربلاوی رۆمان پێویستی بە دەسەلاتێکی سەرپشتەو سەپێنراوی بەکار هەیە، ئەم دەسەلاتەیش هەر لە خۆیدا بەدی دەکرا. بەڵام ناحەزە سیاسەکانی لێی دڵنیا نەبوون، هەر لە پیلان گێڕاندا بوون تا دەرفەتیان هێنا لە ناوەراستی ئازاری ٤٤ پ ز لە کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی پیراندا بە دەستی چەند پیلانگێڕێك کوژرا .

یۆلیۆس قەیسەر لەو سەرکردە سیاسی‌و مەردە مەزنانەیە کە زۆر خۆشەویست بووە لای گەلانیان .

چەند بەهرەیەکی تیادا کۆبووبوەوە ... وەك سیاسیەکی زۆر لێزان ، سەرکردەیەکی ئازاو نەبەرد ، سەرەرای ئەوەیش کە قسەزانێکی یەجگار بلیمەت بووە . پەراوەکەی کە باسی چۆنیەتی داگیرکردنی وولاتی گالْ دەکات بە پەراوێکی وێژەیی‌و کلاسیکی لاتینی بەناوبانگ دادەنرێت . بە بیروڕای رەخنەگران‌و لێکۆڵەران لەو پەراوە لاتینیانە دادەنرێت کە خوێنەر زۆر چێژی لێوەردەگرێت .



# فرانسیسكۆ پیزارۆ...

١٤٧٥ز - ١٥٤١ز

Francisco Pizarro

فرانسیسكۆ پیزارۆ... ناسراو به جەربەزەیەكی ئەسپانیایی بێسەواد توانی ئیمپراتۆریێتی (ئانكا) بروخێنێت له وولاتی پیرۆدا . سالی ١٤٧٥ ز له شاری (ترۆجیلۆ)ی ئەسپانیایی له دایك بووه. پێ‌ی نایه جیهانی نوێوه (واته ئەمەریكا) بۆ گەڕان به دوای سامانو ناوبانگی‌ی هەروەكو هیرناندۆ كۆرتیز .

له سەرەتای ١٥٠٢ زدا تاوەكو ١٥٠٩ ز له لەندی ئیسپانیۆلای سەر به دەریای كاریبی گوزەرانی دەكرد . سالی ١٥١٥ ز یەكێك بوو

لەو گوردەی کە (دی پاڵپاو) جیای کردەوەو توانییان ئۆقیانوسی هێمن بدۆزنەوە . ساڵی ۱۵۱۹ ز چووە (پەنەما)و ئیتر هەر لەوێ بۆ خۆی جێ'نشین بوو . لە تەمەنی ٤٧ ساڵیدا یەکێك لە زەمینەدۆزە ئەسپانیایەکان هاتە لای‌و تێ'ی گەیاند کە ئیمپراتۆریەتێك هەیە لە پیرۆ بەناوی (ئانکا) . ئەمیش ئەو قسانەی تەواو چووبووە مێشکیەوە ، یادی کارەکانی کۆرتیزی دەکردەوە کە چۆن چووە مەکیسکەوە . کەڵکەڵەی ئەو کارەی هاتە سەری‌و بڕیاریدا ئیمپراتۆریێتی ئانکا بەزێنێت . یەکەمین پەلاماری لە ساڵی ۱۵۲٤ز – ۱۵۲۵ ز دا پیێ'ی هەستا بەلاّم بێ'سوود گەڕایەوە ، پەلامارێکی تریدا بەلاّم ئەمجارەیان توانی خویێ بگەیەنێتە ڕۆخی پیرۆ ، لە گەڕانەوەیدا زێڕو سوورە هیندی ئەمەریکانیی‌و چەند تەبایەکی لامای[1] لە تەك خۆیدا هێنایەوە .

لە ساڵی ۱۵۲۸ زگەڕایەوە بۆ ئەسپانیا هەر لە ساڵی دواینیدا بەڵێنی لە ئیمپراتۆر شارلکان وەرگرت کە بە هەر چۆن بێت یارمەتی بداتو دەسەلاّتو فەرمانی پێ'بدات تاکو بتوانێت پیرۆ داگیر بکاتو بیخاتە ژێر دەسەلاّتی ئەسپانیاوە .

پیزارۆ بە دڵنیاییەوە گەڕایەوە بۆ پەنەما ، لەوێ خۆی گورج کردەوەو کومەڵێك پیاوی چەتوو ئازای لە خۆی کۆکردەوە. لە ساڵی ۱۵۳۱ زدا کەشتی لە (پەنەما)وە بەڕێکرد ، ئەو کاتە تەمەنی نزیکەی ٥٦ ساڵ دەبوو ، ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە پیزارۆ نیازی هەبوو داگیری بکات دانیشتوانی زیاتر لە ٦ ملیۆن کەس دەبوو .

لەو ساڵەی دوایدا پیزارۆ گەیشتە پیرۆ بە نزیکەی ۱۷۷ پیاوو ٦٢ ئەسپەوە، ئینجا خۆی کشاندە ناو جەرگەی وولاتەوەو بەرەو شاری (کاجومرکا) ملی نا . فەرمانڕەوای ئەو شارەیش کابرایەکی

گەمژەودەبەنگ بوو بە ناوی (ئاتا هۆڵبا)، نزیکەی چل هەزار جەنگاوەری هەبوو، ٥ هەزار چەکداری تەنها هەر بۆ پاریزگاری خۆی دانا بوو.

پیزارۆ بە چەتوونی و فێڵبازی دیدەنیەکی سازکرد بۆ لای ئاتا هۆڵبا، داوای لێکرد کە دیدەنیەکەی ئاشتیانەو بێچەك بێت (واتە جەنگاوەرانی هەردوولا بێ چەك بن). ئابەم چەشنە دەرفەتی لە گەمژەیی و گێلی ئاتا هۆڵبا هێناو توانی هەر لە ماوەی نیوکاژێردا لە خشتەی بەرێت و قڕیان تێ بخات، بەلاّم ئاتا هۆڵبای نەگبەتی هێشتەوەو کردیە گاڵتەجاڕ و گۆڵمەزەی خۆی بۆ زەوتکردنی زێڕو زیوی وولاّتەکە. ئەو لەشکرە زۆرەیشی بەترس و سامەوە دوورەواز وەستان چونکە ئاتا هۆڵبا خۆی کردبووە خواوەندیان، ئەمانیش زۆر لایان سەیربوو کە بینیان خواوەندەکەیان هەروا بە ئاسانی بە دیل گیرا. لەبەر ئەوە دەسبەجێ کۆستیان کەوت و لە پەل و پۆکەوتن، هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە ئیتر هیچ شەڕیان بۆ ناکرێت.

ئابەم چەشنە پیزارۆی سەرگوردو چەتوون بووە پاشای گەلی ئانکا... ئەو گەلەبێ چارەی کە بووە گاڵتەچی و تەفرێنراوی ئەسپانیەکان. هەرچەندە چەند شەڕوشۆڕێکی ناچوستیش یەك لە دوای یەك هەڵگیرسا بەلاّم زۆر بە شکستەیی کۆتاییان پێ هات، ئەو ئیمپراتۆریەتەیش ئاوا بە ئاسانی چووە ژێر دەسەلاّتی ئەسپانیاوە.

(١) لاما: گیاندارێکە زیاتر لە حوشتر دەچێت بۆشیر وگوشت بەخێودەکرێت.



# هێرناند کۆرتیز...

١٤٨٥ز - ١٥٤٧ ز

Hernando Cortes

داگیرکەری وولاّتی مەکسیك هێرناندۆ کۆرتێز... ساڵی ١٤٨٥ ز لە شاری (میدلین)ی ئەسپانیا لە دایك بووە ، باوکی کابرایەکی خانەدان‌و ناسراو بووە . لە تەمەنی لاوێتیدا خۆی گەیاندە زانکۆی (سلامنکا) بۆ خوێندنی قانون، بەلاّم لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا زانکۆی وازلێهێناو کەوتە گەڕان بە دوای نگین‌و سامان لە جیهانی نوێدا .

ساڵی ١٥٠٤ ز گەیشتە ئیسپانیۆلا ، لەوێ وەك کشتیارێکی لێهاتووو (دۆن جوان)یك گوزەرانی دەکرد . لە ساڵی ١٥١١ زدا بەشداری کرد لە داگیرکردنی کوبا لە لایەن ئەسپانیاوە ، هەر لەوێیش

ژن خوشکی فەرمانڕەوای کوبا (کە کابرایەکی ئەسپانی بوو)ی هێناو دانرایش بە دەسەڵاتداری (سانتیاگۆ) .
ساڵی ١٥١٨ ز کۆرتێز هەڵبژێرا بە سەرکردەی هێزێك بۆ سەر وولاّتی مەکسیك ، ئەو دەسەڵاتدارەی کە کۆرتێزی هەڵبژارد بۆ ئەم کارە زۆر لە سەرکێشی ی کۆرتیز دەترسا لە بەر ئەوە لە قسەکەی پەشیمان بووەوە فەرمانەکەی پووچاندەوە ، بەڵاّم پاش چی !!! تازە کار لە کار ترازا بوو .
لە شوباتی ١٥١٩ ز کۆرتێز بە ١١ کەشتی و ١١٠ کەشتیەوان و ٥٥٣ سەربازەوە دەریای تەی کرد (١٣ یان سەربازی تفەنگچی و ٣٢ یان سەربازی تیرەنداز بوون) ، ١١ تۆپی قورس و ٤ تۆپی سووك و ١٦ ئەسپی لەگەڵ خۆیدا برد ڕۆژی هەینی سەربازەکانی لە نزیك (ڤێرا کرۆز) دابەزان و هەر لە نزیك کەناری ڤێرا کرۆزیشدا بۆ چەند ڕۆژێك مانەوە تا کو هێندێ دەنگوباس لە بارەی وولاّتی مەکسیکەوە کۆبکەنەوە .
لەو ماوەیەدا کۆرتێز بۆی دەرکەوت کە بنەماڵەی (ئازتیك) فەرمانڕانی وولاّتی مەکسیك دەکەن و پایتەختەکەیان لە ناوجەرگەی وولاّتەکەیاندایە ، گەنجینەیەکی یەجگار زۆرو پڕ لە کانزای بەنرخیان لە ژێر دەستدایە ، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو بنەماڵەیە ئەوەندە خۆشەویست نەبوون لای ئەو خێڵانەی کە ملکەچ بوون بۆیان .
کۆرتێز خۆی گورج کردەوەو ملی ڕێگەی نا بۆ زەوییەکانی ئازتیك . جا ئەوانەی کە لە گەڵیادا بوون زۆر دەترسان لەوەی ئەو پەلامارە نووشوستی بهێنێت ، لە بە ڕئەوە نیازی گەڕانەوەیان خستە دڵەوە بەڵاّم کۆرتێز کە هەستی بەو جموجوڵییە کرد دەسبەجێ پێش نیازی ئەوان

بەلەم‌و کەشتیەکانی سووتاندو شکاند تاوەکو سەربازەکان تەواو نائومێد بن لە گەڕانەوەیان ئیتر یان دەبێت گەلەڵ کۆرتێزدا بن تا سەرکەوتن یان بەدەستی سووره هیندیه ئەمەر یکاییەکان بکوژرێن. سوپای کۆرتێز بەرەنگاری چەند خێڵێکی هیندی بوو لە گەڵیاندا کەوتە جەنگەوە بەڵام لە دواییدا بوونە دۆست‌و پاڵپشتی یەکتر ، هۆیەکەیشی ئەوە بوو کە هەروەکو لەپێشەوە باسمان کرد ئەو خێڵانە بنەماڵەی (ئازتیك) یان خۆش نەدەویست‌و حەزیان بە ڕووخاندنی دەکرد .

پاش ئەوە کۆرتێز بەرەو پایتەخت کشا ، دەنگوباسی ئەو پەلامارەی کۆرتێز گەیشتە لای مۆنیزۆماشای دووەم . هەرچەندە پاشا نەخشەی هێرشێکی کتوپری بەدەستەوە بوو بیکات بۆ سەر کۆرتیز ، بەڵام کۆرتیز زۆر فێڵبازو چەتوون بوو زووتر دەسپێشکەری کرد . شالاوێکی پارتیزانیانەی بردە سەر سوپای مۆنیزۆماو توانی بیانبەزێنیت ئینجا خۆی بکوتێتە ناو پایتەختەوەو پاشا بە ئاسانی بیگرێت‌و بیکاتە گاڵتەجاری خۆی .

هەرلەوکاتەیشدا هێرشێکی ئەسپانیایی دابەزیە ڕۆخی مەکسیك بۆ دەسگیرکردنی کۆرتێزی سەرکێش بە لام‌ئەم زووتر بەرەنگاری ئەو هێزە بووەوەو ڕایشکاند، ئیتر لە دوای ئەوەوە وازیان لە کۆرتێز هێناو هەر بە فەرمانڕانی مەکسیك مایەوە .

(ئازتیك)یش کە کۆنە پایتەخت بوو ناویان گۆڕی بە مەکسیکۆو بووە پایتەختی نوێی وولاتی داگیرکراوی سەر بەئەسپانیا .

---

(١) نگین : بەختی باش .



# - خاتو ئیزەبێلا شای یەکەم

**١٤٥١ ز - ١٥٠٤ ز**

**Queen Isabella "I"**

ئیزەبێلاشای یەکەم (پاشای کەشتاڵە)... ئەو شاژنەبوو کە دارندەی گەشتەکەی کریستۆفەر کۆلۆمبسی کرد تا کو بە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی‌را خۆی گەیاندە زەوییەکانی ئەمەریکا. بریارەکانی کە دەیدا زۆر خێراو سەختو لەجیٚی خۆیدا بوو بەرادەیەك کە بتوانێت کاربکاتە سەر تەواوی ئەسپانیاو ئەمەریکای لاتینی بۆ چەندین سەدەیەك، بگرە بۆ سەر چەندین خەڵکی ئێستایشمان کە دەژین. هەر چەندە مێردی بە فەرناندشا (پاشای ئەراگۆن) کردو زۆربەی ئەو کارو فەرمانانەیشیان پێکەوە بە ئەنجام دەدا، بەڵام گرنگیەکەی هەر لەو مەزنتر بوو.

ئیزەبێلا ساڵی ١٤٥١ ز لە شاری (مادریگاڵ)ی سەر بە شانیشنی کەشتاڵە (هەرێمێکە لە وولاتی ئەسپانیای ئێستا) لە دایك‌بووە. لە تەمەنی نەوهاڵیدا خوێندنێکی ئایینی باڵای وەرگرت‌و هەر لەو کاتەیشەوە ڕێبازگەی کاثۆڵیکی بۆ خۆی هەڵبژارد.

ئەسپانیا لەو سەردەمەدا بەش بەش کرابوو بە چوار شانشینی‌یەوە: یەکەمیان شانشینی کەشتاڵە بوو کە گەورەترینیان بووو براکەی ئیزابێلا لە دایکیەوە (هێنری چوارەم) پاشایەتی دەکرد لە ساڵی ١٤٥٤ زوە تا مردنی لە ساڵی ١٤٧٤ ز، شانشینی ئەراگۆن کە کەوتبووە ئەو پەڕی باکوورەوە، شانشینی غەرناتە کە کەتبووە باشوورەوەو بە دەست ئیمپراتۆریتی ئیسلامییەوە بوو، شانشین باڤار کە ئەمیش کەوتبووە باکووری ئەسپانیاوە.

ئیزەبێلایش کە جێنشینی تەختی پاشایی بوو لە کەشتاڵە زۆر لە شازادەو میرەکانی ئەورووپا دەهاتنە خوازبێنی، براکەیشی (هێنری چوارەم) حەزی دەکرد کە شوو بکات بە پاشای پۆرتۆغاڵ، بەڵام ئیزەبێلا لەگەڵ ڕای براکەیدا نەبوو. ئەوە بوو لە دواییدا مێردی کرد بە فرناندشا جێ‌نشینی پاشای ئەراگۆن، هێنری برای زۆر ڕکوکینەی هەستا بەم کارە، لەبەر ئەوە بڕیارێکی شاهانەی دەرکرد بە دانانی (جوانا)ی کچی بە جێنشینی خۆی، جا کە هێنری مرد ئیزەبێلا کەوتە داواکردنی تاجی پاشایی کەشتاڵە. یاوەرانی جوانا لە دژی داخوازییەکەی وەستان‌و بووە ناکۆکی‌و گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە جەنگی گەلی هەڵبگیرسێت. لە ساڵی ١٤٧٩ زدا سوپاکانی سەر بە ئیزەبێلا زاڵ‌بوون‌و تاجی شاهانەیان سەندەوە. لە هەمان ساڵیشدا پاشای ئەراگۆن مردو فرناندی کوری (مێردی ئیزەبێلا) چووە جێی، ئیتر ئابەم شێوە ئیزەبێلاو فرناند پێکەوە

زوربەی ئەسپانیایان فەرمانڕانی دەکرد. هەر لە سەرەتای دەسەڵتیشیاندا هەستان بە دامەزراندنی دادگاپشکنینەکان. ئەم دادگایانە هەموو دەسەڵاتێکیان پێدرابوو. بە تایبەتی دەستیان خستبووە نێو کاروباری قازیو سوێنخوارو دادخوازی گشتیو پۆلیسەوە... بە جۆرێکی وا کە هیچ دەرفەتێك بۆ گوناهبار نەدەمایەوە کە بەرگری لە مافەکانی خۆی بکاتو تاوانەکانی بپوچێنێتەوە. تا بەم جۆرە ئەم دادگاتۆقێنەرانە بە ئارەزووی خۆیانو بێ بەزییانە دەکەوتنە ئازاردانو لێدانو کوشتنو سووتاندنی خەڵکی بێگوناه.

لە ماوەی ئەو ٢٠ ساڵەی دەسەڵاتیانڕا نزیکەی ٢٠ هەزار کەسیان بەم شێوەیە لەناو برد. مەبەستیش لە دامەزراندنی ئەم دادگا تۆقێنەرانە لە بیانوو گەڕان بوون بۆ لەناو بردنی موسوڵمانەکانو جووەکانی ئەسپانیا، هەروەها سەرکوتکردنی ئەو میرو دەربەگانەی کە سەرپێچییان دەکرد.

پێش ئەوەی شانشینی غەرناتە بدرێت بەدەستەوە پەیماننامەی ئاشتی هەبوو لە نێوان فەرمانڕەوایی غەرناتەو ئەراگۆن، ئەم پەیماننامەیە ئەوەندەی تر ڕکوکینەی هێزی چوارەمی هەستاندبوو. بەڵام دەوڵەتی ئەسپانیا لە دواییدا ئەو پەیماننامەی پووچاندەوەو زۆریشی کرد لە موسوڵمانەکانی ئەسپانیا بینە دیان یاخود ئەسپانیا بەجێ بهێڵن.

خاتو ئیزەبێلا شا لە ساڵی ١٥٠٤ زدا مرد، چوار کیژو کوڕێکی لە پاش بەجێما.

O



# ولیەمی زاڵ

١٠٢٧ ز - ١٠٨٧ ز

**William The Conqueeror**

دوا هێرشێکی پەروێز کە بۆ سەر بەریتانیا کرابێتو ئاکامێکی سەرکەوتوانەی بەدی هێنا بێت لە ساڵی ١٠٦٦ زدا بوو بە سەرکردایەتی دۆق نۆرماندی (ولیەمی زاڵ). ئەم سەرکردە بێ باکە بە سوپایەکی چەند هەزار جەنگاوەرەوە لە باکووری فەڕەنساوە توانی بە کەناڵی ئینگلیزیرا بپەڕێتەوە و ببێتە تاکە دەسەڵاتدارێك لە سەرانسەری بەریتانیادا. ئەم پەلاماردانەی چەنێك سەرکەوتوو بوو لە داگیرکردنی تەختی پاشایی ئەوەندەیش زیاتر کاریگەر بوو بۆ سەرانسەر مێژووی ئینگلیز بە ڕادەیەك کە ولیەم خۆی لەو باوەڕەدا نەبوو کە بەم شێوەی لێ بێت.

ولیەم ساڵی ١٠٢٧ ز لە شاری ڤالآیزی - نۆرماندی سەر بە فەرەنسا بە زۆڵی لە دۆقی نۆرماند (ڕۆبەرتی یەکەم) هاتۆتە جیهانەوە. لە ساڵی ١٠٣٥ زدا ڕوبەرتی یەکەم بە نیازی حەج چوو بۆ دیدەنی (خانەی پیرۆز)، هەر کە گەڕایەوە دەسبەجێ مرد، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات ڕایسپارد کە ولیەم ببێتە جێ‌نشینی.

ولیەم لە تەمەنی ٨ ساڵیدا بووە دۆقی نۆرماندی، لەو تەمەنەیدا زۆر شپرزەو جەنجاڵ بوو بەکاروباری دەوڵەتەوە، بارۆنەکانو دەرەبەگەکان گوێیان نەئەدایە فەرمانەکان، خۆیان زۆر بە گەورەتر دادەنا لەوەی کە ملکەچی پیشان بدەن، لەبەر ئەوە دۆقنشینیەکەی بۆ ماوەیەك ئاژاوەو بەرەڵایی تێکەوت. بەڵام ولیەم لەو ساڵانەی ژیانیدا زۆر نگینو بەختدار بوو، هەر بە ١٥ ساڵی بووە سوارچاکێکی لێهاتوو، ووردە ووردە فێری چۆنیەتی فەرمانڕانی بوو، هەر لەو دەمەیشدا کەوتە زنجیرە جەنگێکەوە لە دژی بارۆنو بەگنشینەکان، زۆر بە لێهاتوانە توانی سەرکوتیان بکاتو ئەو ناوچانەی (میسن) و (بریتان) بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی.

لە ساڵانی ١٠٤٢ ز - ١٠٦٦ زدا پاشای ئینگلتەرە ئەدوارد شا لەو کێشەدا بوو کە کێ دابنێت لە جێی خۆی، ولیەم هەر کە بەمەی بیست بە بیانووی خزمایەتیەوە (دایکی ئەدوارد خوشکی باپیری ولیەم بوو) هەموو هێزو توانایەکی تەرخان کرد بۆ داواکردنی تاجی پاشایی. ئەوەبوو لە نزیکەی ساڵی ١٠٥١ زدا بەڵێنی تەواوی وەرگرت لە

ئەدوارد شا کە لە پاش مردنی ببێتە جێنشینی. بەڵام لە لایەکی ترەوە (هارۆڵد گودوین) زاوای ئەدوارد شای بۆ پەیدا بوو کە یەکێك بوو لە لۆردە بە تواناو ناودارەکانی ئینگلیز. لە ساڵی ١٠٦٤ زدا توانی بە هەر فێڵێك بێت دەستگیری بکات. لەو ماوەیەدا زۆر بە چاکی ڕەفتاری لەگەڵ دەکردو دڵنەوایی دەکرد تا گەیشتە ئەوەی بەڵێنی تەواو لەویش وەربگرێت کە نەك هەر تەنها داوای تەختی پاشایی نەکات بەڵکو پشتگیریشی بکات بۆ هێنانەدی داواکەی. ئەوەبوو ئەدوارد شا مرد بەڵام هارۆڵد ناچارکرا بە زۆر کە لەو بەڵێنەی پەشیمان ببێتەوەو ببێتە پاشای بەریتانیا. ولیەم لەم کردارە زۆر تورە بووو ئاگری جەنگ هەڵی پێچا، بڕیاریدا کە بە هەرچی شێوازو نرخێك بێت تاجی پاشایی بسەنێتەوە.

لە ئابی ١٠٦٦ زدا نیرۆیەکی دەریایی ئامادەکرد بۆ هێرش، بەڵام ڕەشەبای سەختی باکوور ئەو هێرشەی دواخست، هەر لە هەمان کاتیشدا پاشای نەرویج هێرشێکی بەرێ کرد بۆ سەر بەریتانیا بەڵام هارۆڵد شا توانی بەرەنگاری ڕاوەستێت‌و سوپاکەی ڕاشکێنێت، پاشایش بکوژێت. پاش دوو ڕۆژ بەسەر ئەو سەرکەوتنەی هارۆڵد شادا کەش ساماڵ‌و خۆش‌بوو، دەریا هێمن بووەوە، بای باکووریش ئەو گورو تەوژمە سامناکەی نەما. سوپاکانی هارۆڵدشا هێشتا پشوویان نەدابوو، تەواو ماندوو بووبون لە ئاکامی ئەو جەنگەدا دەسبەجێ ولیەم نیرۆکەی بەرێکردو گەیاندیە ڕۆخەکانی باشوور. لەساڵی ١٤ ی تشرینی یەکەمی ١٠٦٦ زدا هەردوو سوپاکە بەرەنگاری یەکتر وەستان

لەکارزاری (هیستنگزی). هەر لە بەرەبەیاندا ڕمبازو سوارەکانی ولیەم توانیان تیپەکانی ئەنگلۆسەکسون ببەزێنن، لە دەمی شەویشدا هارۆلد شا بکوژن، جارێ خۆ براکەی هەر لە سەرەتای جەنگەکەدا کوژرا. سوپاکە تەواو ڕاشکاو تەفروتوونا بوو ئیتر توانای ئەوەی نەما کە بەرهەڵستی بکات.

ئا بەم شێوەیە لە بەرەبەیانی جەژنی زایینیدا ولیەم هاتە سەر تەخت و لە لەندەن تاجی پاشایی کرایە سەر.

○



# تۆماس جیفەرسۆن..

۱۷٤۳ ز - ۱۸۲٦ ز

Thomas Jefferson

تۆماس جیڤەرسۆن سێهەمین سەرۆکی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو خاوەنی (بانگەوازی سەربەستی)... سالی ۱۷٤۳ ز لە شاری (شادۆل)ی سەر بە ڤەرجینیا لە دایك بووە.

باوکی کابرایەکی ڕووپێو Land Surveryor و کشتیارێکی لێهاتوو بووە. لە پاش مردنی سامانێکی یەجگار زۆری بۆ کوڕەکەی بەجێ هێشت.

جیڤەرسۆن بۆ ماوەی دووسال لە زانکۆی (ولیەم ماری) خوێندی بەلام هیچ بڕوانامەیەکی زانکۆیی بۆ وەرنەگیرا، لە دوایيدا بۆ چەند

ساڵێك كەوتە خوێندنی قانون، لە ساڵی ١٧٦٧ ز چووە پیشەی پارێزەرییەوە. لەو ماوەی حەوت ساڵەی دواییندا بە كشتیارێكی بەتواناو پارێزەرێكی شارەزا ناوی دەركرد تاوای لێهات بووە ئەندامی ئەنجومەنی یاسادانان لە ڤەرجینیا.

یەكەم نووسراوی كە دەركەوت بە ناوی (تێروانینێكی پێویست لە بارەی ئەمەریكای بەریتانییەوە) بوو. لە ساڵی دواییدا هەڵبژێرا بە نوێنەری ڤەرجینیا بۆ كۆنگرێسی كیشوەریی دووەم. لە ساڵی ١٧٧٦ زدا دۆسیەی (بانگەوازی سەربەستیی) نووسییەوە، بەر لەو ساڵە گەڕایەوە ڤەرجینیاو چووە نێو دەستەی یاسادانانەوە، لەو ماوەیەدا كارێكی باڵاو سەرەكێشی گێڕا لە ئەنجامدانی چەند خاسكارییەكی گرنگ.

جیڤەرسۆن بیروڕایەكی تایبەتی هەبوو لە پەروەرشت و ئازادیی ئاینیدا، پاش ئەوەی كە چووە كۆنگرێسەوە پێشنیارێكی پێشكەش كرد دەربارەی بەكارهێنانی ڕژێمی دەیەكی لە پارەی ئەمەریكاییدا و پەسەندیش كرا. بەڵام لە بارەی كێشانەو پێوانەدا پێشنیارەكەی پەسەند نەكرا. پاشان پێشنیارێكی تری پێشكەشكرد لە بارەی (نەهێشتنی كۆیلەیی) لە وولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكادا (هەرێمە نوێیەكانی)، بەڵام بەیەك دەنگ پێشنیارەكەی شكستی هێنا.

لە ساڵی ١٧٨٤ زدا نێرایە فەرەنسا بە گرنگییەكی دیپلۆماسی، لەوێ مایەوەو بووە باڵوێزی وولاتە یەكگرتووەكان بۆ ماوەی ٥ ساڵ. پاشان لەساڵی ١٧٨٩ زدا گەڕایەوە لە فەرەنساو دانرا بە سەررازگری گشتی وولات. لەو ماوەیەدا ناكۆكی كەوتە نێوان جیڤەرسۆن و وەزیری داراییەوە، لە ئەنجامدا بەرەی جیڤەرسۆن پارتێكیان پێكهێنا بە ناوی

(پارتی دیموکراتی ئەمەریکا). لە ساڵی ۱۷۹٦ زدا هەڵبژێرا بۆ سەرۆکایەتی کۆمار بەڵام لە هەڵبژاردنی گشتیدا دەنگی ئەوەندە نەهێناو لەو ساڵەدا سەرنەکەوت بەڵکو بووە جێگری سەرەك کۆمار. ساڵی ۱۸۰۰ ز جارێکی دی خۆی هەڵبژاردەوە بەڵام ئەمجارەیان سەرکەوتنی بەدەست هێناو بووە سەرەك کۆمار.

جیفەرسۆن وەك سەرەك کۆمارێك زۆر هێمنانە رەفتاری دەکرد لە سیاسەتیدا. حەزی بە ئاشتیو رێکەوتن دەکرد لەگەڵ بەرامبەریدا، بەم کردارەی زەمینەیەکی زۆر بە نرخی بۆ سیاسەتی وولاتە یەکگرتووەکان بەجیْهێشت. گەورەترین رووداو کرینی زەوی (لویزانا) بوو لە فەرەنسا لە سەردەمی ناپلیۆن پۆناپارتدا.

جیفەرسۆن دووجار بە سەرەك کۆمارهەڵبژێردا بەڵام بۆ جاری سێهەم بۆی نەلوا خۆی هەڵبژێرێتەوە.

جیفەرسۆن چەندین بەهرەی تیادا کۆبووبووەوە. بێجگە لەوەی کە مەردێکی سەرشتە بوو لە سیاسەتیدا، نزیکەی پێنج شەش زمانی دەزانی جگە لە زمانەکەی خۆی، زۆر بایەخو گرنگی ئەدا بە زانستە سروشتیەکانو بیرکارییەکان، کشتیارێکی لێهاتووو سەرکەوتوو بوو، ئامرازە نوێیەکانی بەکاردەهێناو دەیخستەگەڕ لە کشتیارییدا.

○



# جان
# جاك ڕۆسۆ..

**١٧١٢ ز – ١٧٧٨ ز**

**ean Jaques Rausseau**

فەیلەسوفی فەرەنسایی مەزن جان جاك ڕۆسۆ... ساڵی ١٧١٢ ز لە شاری جنێڤ – سویسرە لە دایك بووە. هەر کە هاتە جیهانەوە بە ماوەیەکی کەم دایکی مرد. لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا باوکی لە جنێڤ دوورخرایەوە. ساڵی ١٧٢٨ ز... لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا ئەمیش شاری جنێڤی بەجێ هێشت وەك گەڕۆکێك ئەم شوێن و ئەو شوێنی دەکرد. هەر لەو دەمەیشدا کەوتە داوی ئافرەتێکەوە، پێنج زارۆڵەی زۆڵی لێ بوو، هەر پێنجیشیان خرانە خانەی لانەوازانەوە، بەڵام کە گەیشتە ٥٦ ساڵی دایکی ئەو پێنج زارۆڵەی بە مارەکراوی هێنایەوە... ناویشی (تێریز لافیزێر) بوو.

رۆسۆ سالّی ١٧٥٠ ز لە تەمەنی ٣٨ سالّیدا لەناکاو سەری هەلّداو کەوتە ناوناوانەوە، هەر لەو دەمەیشدا بوو کە ئاکادیمیای (دیگۆن) خەلاّتێکی دانابوو بۆ نایابترین ووتار دەربارەی: «ئایا هونەرو زانستەکان بە سوودو پێویستن بۆ خورەوشتی کۆمەلّگای مەردوم...؟». بێگومان رۆسۆیش زرنگی خۆی دەرخستو توانی خەلاّتی یەکەم بسەنێت. لەو بیروڕایانەی کە دەریخستبوو تیایدا... تەنهائەو دوائەنجامەپوختانە بەسوودن کە لە پێشکەوتنی هونەرو زانستەکانڕا بە دەردەکەون . ئابەم شێوەیە رۆسۆ بووە پیاوێکی نووسەری بەناوبانگ.

لەو پەڕاوە مەزنانەی کە رۆسۆ نووسیبوی: -

(نەژادی جیاواز لە نێوان مەردومدا... سالّی ١٧٧٥ز)، (ئیمیلْ... سالّی ١٧٦٢ز)، (هاوبەندی کۆمەلاّیەتی... سالّی ١٧٦٢ز)، هەروەها (پێلێنانەکان... لە سالّی ١٧٧٠ز)، جگە لەوەیش کە بایەخی ئەدا بە مۆسیقا... هەر لەم بوارەیشدا دوو ئۆپێرای نوسیوەتەوە .

هەرچەندە رۆسۆ پەیوەندیو دۆستایەتی هەبوو لەگەلّ زۆر لە نووسەرە ئازادیخوازەکانو لەگەلّ ئەوانەی کە بەشدار بوون لە بزوتنەوەی رۆشنبیری سەدەی هەژدەمدا وەك دیدرۆ، بەلاّم لە دواییدا بەهۆی بیرکردنەوەکانی بەرەبەرە لێیان دوور دەکەوتەوە، ناکۆکییەکیش پەیدا بوو لە نێوان رۆسۆو ڤۆلتێردا لە شاری جنێڤ لەسەر شانۆگەری‌ی، سووربوونی رۆسۆ لەسەر ئەوە بوو کە شانۆی دانابوو بە شوێنو فێرگایەکی بەدخوو .

لە سەرەتای سالّی ١٧٦٢ زدا دەولّەت کەوتە بیانوو و تەنگ

پیْهەڵچنینی بە هۆی نووسینە سیاسیەکانیەوە. ئەم کێشەو گیروگرفتانەی وای لێکرد کە دووچاری نەخۆشیە دەروونیەکان ببێت بە رادەیەك کە زۆر لە دۆستان لیْی بتەکێنەوە. ئیتر دۆستی وای لە دەور نەما کە هانای بۆ بەرێت و کۆمەکی پیْبکات. لەو ٢٠ ساڵەی دواییندا بە ژیانێکی نائومێدی و کوڵەمەرگیەوە گوزەرانی دەکرد، تا بەم جۆرە مایەوە تا ساڵی ١٧٧٨ز، لە شاری ئیرمینون – فەرەنسادا دواسەری نایەوە.

نووسینەکانی رۆسۆ بە یەکیْ لەو کارنامە گرنگ و سەرەکیانە دادەنرێت لە چرۆکردنو گەشەکردنی سۆشیالستی و نەتەوایەتی، رۆمانسی ی و دیکتاتۆری ی، جگە لەوەیش کە رێخۆشکەرێك بوو بۆ بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسا. هەروەها دۆخێکی زۆر گرنگی گێڕا لە دارشتنی یەکسانی و دیموکراسی ئەرمانی.

مەزنی و فرایستەی رۆسۆ دەگەرێتەوە بۆ گرنگی و کاریگەری ئەو پەراوەی ئیمیلْ Emile بۆسەر بیردۆزەکانی یاددان. لەو پەراوەیدا... لاوێك دەکاتە نموونە کە چۆن لە سەرەتاوە گۆش و پەروەردە دەکرێت... چۆن لەسەر بیردۆزەکانی دەدوێت لەگەڵ ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر ئیمیلْدا دێت لە هەرەت و رێچکەی ژیانیدا.

○



# ئەدوارد جینێر...

١٧٤٩ز ـــ ١٨٢٣ ز

Edward Jenner

ئەدوارد جینێری پزیشك... ئەو زانا مەزنەی کە تەکنیکاری کوتانی Vaccination خاس‌و ئاسان کرد بەرێگەیەکی پاك‌و رێکوپێك بۆ خۆپاراستن لەو نەخۆشییە سامناکەی کە ناودەبرێت بە ئاوڵە یان خوریکە Pox.

لەم سەردەمەی ئێستاماندا، پاش ئەوەی کە رێکخراوی تەندروستی جیهان ئاشکرای کرد کە جیهان بە سایەی جینێری مەزنەوە پاك بۆتەوە لە نەخۆشی ئاوڵە، دەبێت ئەوەیش لە یاد نەکەین کە ئاوڵە چەنێ نەخۆشییەکی بەسام و درم‌و کوشندەیە بە رادەیەك کە لەسەر دەمێکدا

سەرانسەری ئەورووپای گرتبووەوە و نزیکەی (١٠٪ - ٢٠٪)ی لێمران، ئەوانەیش کە دەمانەوە نزیکەی (١٠٪ - ١٥٪) سەروسەکتیان ناشیرین و کونجاوی دەبوو.

ئەم نەخۆشییە وەنەبێت تەنها هەر لە ئەورووپای دابوو، بەڵکو چەندین وولاٌتانی تری وەك ئەمەریکای باکوورو هیندو چین و شوێنی تری گرتبووەوە. ئەو شوێنانەی کە ئەم نەخۆشییەی تیادا دەردەکەوت بە زۆری منداڵ تووشی دەبوو، بەڵام ئەوانەی کە تووشی دەبوون و لەمردن رزگاریان دەبوو جارێکی تر تووشی نەدەبوونەوە. ئەم دیاردەیە بەرەبەرە لە وولاٌتە خۆرهەڵاتەکاندا رەچاو دەکراو کوتانیان هێنایە ناوەوە، ئەویش بە دەرهێنانی کەمێ لە زیپکاوی نەخۆشییەکەو کەسێکی ساغیان پێدەکوتا. ئەم دیاردەیە دەماودەم گەیشتە ئینلگتەرە پێش بە دەرکەوتنی جینێر، هەتاوەکو جینێر خۆیشی لە تەمەنی ٨ سالیدا کوترا، بەڵام بەم رێگەیە ماکی ترسناکی هەبوو، زوربەی ئەوانەی بەم رێگەیە دەکوتران بەرگرییان پەیدا دەکرد لە دژی ئەو نەخۆشییە گەر نەمردنایە، بەڵام ماکی نەخۆشییەکەیان پێوە دەردەکەوت... دوچاری هێرشێکی پیس و سەخت دەبوون و سەروسەکتیان ناشیرین و ترسناك دەبوو بە یلۆقی کێمدار Pustule. لەبەر ئەوە زۆر بە کارێکی پێویست دەزانرا بۆ خستنەگەری باشترین رێگەیەك بۆ بەرهەڵستی ئەم نەخۆشییە بێ‌ئەوەی ناشیرینی و نەنگی لە لەشی مرۆڤدا بەجێ‌بهێڵێت.

جینێر ساڵی ١٧٤٩ز لە شارۆکەی (بێرکلێ) سەر بە هەرێمی گلۆشستەر - ئینلگتەرە لە دایك بووە. لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا لەژێر دەستی پزیشکێکی نەژداردا دەیخوێندو زانستی توێکاریی Anatomy

فێر بوو لێوەی، پاش ماوەیەك كەوتە پزیشكگەری لە نەخۆشخانەیەكدا. لە ناوەڕاستی چلەكانی تەمەنیدا ناوی دەركرد بە پزیشكێكی نەژداری چوستو كارا لەو ناوچەیەدا .

جینێر ئەو پەندو بڕوا پێشینانەی بیستبووەوە كە باوبوو لە نێو دانیشتوانی ناوچەكەیدا گەر هەر كەسێك تووشی ئاولەگا Cowpox بێت (نەخۆشییەكی سووكە تووشی چێل دەبێتو تەشەنەیش دەكات بۆ سەر مرۆڤ) ئیتر تووشی سووكە ئاولە نابێت. هەرچەندە ئاولەگا بۆ مرۆڤ زیانبەخش نیە بەڵام نیشانەكانی تا رادەیەك لە سووكە ئاولە دەچێت. لێرەدا جینێر ئەو ووتەو بڕوایانەی لای خۆی گەڵاڵە كرد، ئینجا بیری لەو ڕێگەیە دەكردەوە كە ئەگەر مرۆڤێك بە ئاولەگا بكوترێت لەوانەیە بە دڵنیاییەوە ببێتە ڕێخۆشكەرێك بۆ بەرگری لەو سووكە ئاولەیە .

لە ساڵی ١٧٩٦ زدا جینێر ئەم تێبینی‌یەی لە منداڵێكی ٨ ساڵاندا تاقیكردەوەو بە كێمی ئاولەگا كوتای، منداڵەكەیش تووشی ئاولەگا بوو، ئینجا لە دواییدا بە كێمی سووكە ئاولە (مرۆڤ تووشی دەبێت) منداڵەكەی كوتایەوە جارێكی تر، لە ئەنجامدا سەیری كرد هیچ كاری تێناكاتو هیچ نیشانەیەكیش لێوەی دیار نادات. لەمەوە بۆی دەركەوت كە ئەم منداڵە بە هۆی كوترانەكەی پێشوویەوە بەرگری‌ی Immunity پەیدا كردووە بەرامبەر بەو دوو جۆرە ئاولەیە. لە پاش چەند زانستگەرییەكی تر ئەنجامی كارەكانی لە پەرتوكێكدا ڕەنووس كردو ساڵی ١٧٩٨ز لەسەر ئەركی خۆی بڵاوی كردەوە، دوا بە دوای ئەمیش چەند نووسراوو ووتارێك دەربارەی ئەم كارەمەزنەو ئەنجامەكانی بڵاوكرایەوە. پاش ئەوە ئیتر كوتانی ئاولە بە زوویی بڵاو

بووەوە لە ئینگلتەرەدا، هەر دەسبەجێیش بووە فەرمانێکی تەوزیمی لە سوپاو نیرۆی دەریاییدا. خێرا بە جیهانیشدا بڵاو بووەوە.

جینێری مەزن وەنەبێت لە دوای ئەو دۆزینەوەی چاوی لە دەوڵەمەندی بوو بێت. پۆل پۆل خەڵك دەهاتنە لای وە بە خۆرایی دەیکوتان. لەسەر ئەم کارە مەزنەی پەرلەمانی ئینگلیزی خەڵاتێکی ١٠ هەزار جونەیهی ئیستەرلێنی پێبەخشی. پاش ماوەکی تریش ٢٠ هەزار جونەیهی پێبەخشی، جگە لە چەندین مەدالیاو نەوازی باڵا کە پێشکەشی کرا، زۆر بە شکۆمەندییەوە خۆشنوودیو پیرۆزباییان لێدەکرد.

جینێر خاوەن خێزان بوو، سێ منداڵی هەبوو، نزیکەی ٧٣ ساڵ ژیا، لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٢٣ زدا هەر لە زادگاکەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد.

○



# ولهێلم کۆنراد ڕۆنتگن

١٨٤٥ ز - ١٩٢٣ ز

**Wilhelm Conrad Roentgen**

زانای مەزن ولهێلم کۆنراد ڕۆنتگن دۆزەری تیشکی ئێکس — X ray... ساڵی ١٨٤٥ ز لە شاری (لینیب)ی سەر بە ئەڵەمانیا لە دایك‌بووە. لە زانکۆی زیۆریخ بڕوانامەی پزیشکی ی وەرگرت. لەو ١٩ ساڵەی دواییندا لە چەندین زانکۆ کاری دەکرد تاوای لێهات بە زانایەکی زرنگ ناوی دەرکرد. لە ساڵی ١٨٨٨ زدا لە زانکۆی ووزبێرگ دامەزرابە ئوستادو بەڕێوەبەری ئامۆژگای فیزیك، هەر لەم ئامۆژگایەدا بوو ئەو دەسکەوتە مەزنەی بە ئەنجامداو پێوەی ناسرا.

لە ٨ی تشرینی دووەمی ١٨٩٥ زدا هەستا بە چەند تاقیگەریەك لە سەر تیشکە کاثۆدەکان Cathode — rays. ئەم تیشکانە پێکهاتوون لە

شالاْوێکی ئەلەکترۆن کە لە بارێکی کرژدا دەردەچێت. ئەم کرژییەیش لە نێوان دوو جەمسەری کارەبادا پەیدادەبێت کە بەستراون بە هەردوو سەری لوولەیەکی شوشەیی داخراوی بەتاڵکراو لە هەوا. ئەم تیشکە کاثۆدانە هەرچەندە تا رادەیەك سمێنەرنین بەلاْم لە نێوەندێکی هەوادا بۆ دووری چەند سانتیمەترێك بڕ دەکەن. لێرەدا ڕۆنتگن لوولەی تیشکە کاثۆدەکەی Cathode - ray tube بە پەڕەیەکی ڕەشی ئەستوور داپۆشی تاوەکو هیچ ڕۆشناییەك لێوەی ڕانەچێتەدەر ئەگەر تەزوویەکی کارەبای پیادا چوو. کە تەزووە کارەباکەی کردەوە زۆر هاژو حەپەسا .

سەیری کرد ئەو گلۆپە فلۆرسنتەی کە بە تەنیشتیەوەیەتی دەدرەوشێتەوە هەروەکو ڕۆشنایی چوبێتە ناو لوولەکەوەو ڕۆشنی کردبێتەوە. جا کە تەزووە کارەباکەی دەبری ئەو گلۆپەیش لە درەوشانەوە دەکەوت. لەمەوە بۆی دەرکەوت کە ئەو لوولە داپۆشراوە هیچ ڕۆشناییەك لێوەیڕا نەچووەتە دەر ! ! کەواتە دەبێت تیشکێکی نەبینراو هەبێت کە لە لوولەکە وەڕا دەچێتە دەرەوە لە کاتی پیابردنی ئەو تەزووە کارەبایە. لەبەرئەوەی کە سروشتی ئەم تیشکە مەنگ‌و شاراوە بوو لای، هێمایەکی جەبری بۆ دانا بە ناوی ئێکس (X) واتە نەزانراو. ڕۆنتگن بەم ئەنجامانەی زۆر خۆشنوود بوو، گشت بیرو هۆشی تەرخان کرد بۆ ڕەبازو لێکۆڵینەوەی سروشتی ئەم تیشکە تا گەیشتە ئەوەی ئەم ڕاستیانەی بۆ ڕوون بێتەوە .

یەکەم : تیشکی (X) دەتوانێت زۆر مادە بڕەوشێنێتەوە .

دووەم : تیشکی (X) دەتوانێت چەندین تەنی تاریك بسمێت .

هەر بە شێوەیەکی تایبەتیش سەیری کرد ئەم تیشکانە دەتوانن ماسولکەکانی مرۆڤ بسمن بەلاّم ناتوانن ئێسك بسمن، بۆ ئەم مەبەستەیش دەستی خستە نێوان لوولەی تیشکە کاثودەکان‌و بەربەستێکی رۆشن، سەیری کرد نیگاری ئێسکی دەستی لەسەر بەربەستەکە دیارە .

سێهەم : ئەم تیشکە ئێکسانە (X) بە هێلّێکی ڕاست دەردەپەڕن.

رۆنتگن لە کانوونی یەکەمی ١٨٩٥ زدا یەکەم نامەیەکی لە بارەی تیشکی ئێکسەوە نووسی، ئەو ڕاپۆرتەی سەرنجی زۆر لە زانایانی ڕاکێشا، هەر لە ماوەی چەند مانگێك دا پتر لە سەدان زانا کەوتنە زانستگەری‌و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم تیشکە ئێکسە. لە ماوەی ساڵێك نزیکەی هەزار زانستنامە دەربارەی ئەم ڕشتەیە پەخش‌و بلاّوکرایەوە .

یەکێ لەو زانازرنگانەی کە زۆر بایەخی بەم ڕشتە دەدا (ئەنتۆنی بێکۆرێلّ) بوو کە سەرەتای زانستگەرییەکانی لەسەر تیشکی ئێکس بوو، بەلاّم لێوەی‌ڕا گەیشتە چەند ئەنجامێکی سامناکتر لە تیشکی ئێکس. ئالەم دیاردەوە بۆمان دەرەنجام دەبێت کە چەنێ ئەو دۆزینەوانە نزیکی یەکترن و تا ڕادەیەکیش تانوپۆی یەکترن .

ڕۆنتگن شایانی ئافەرین و شکۆمەندییەکی بێپایانە چونکە بەتەنها هەر بەخۆی ئەرکی ئەو کارەمەزنەی گرتە ئەستۆو توانی سەرکەوتووانە بە ئەنجامی بهێنێت .

ڕۆنتگن هەرچەندە ژنی هێنابوو بەلاّم وەجاخی کوێربوو، لەبەر ئەوە هەر لە زووەوە کیژێکی بە منداڵی گرتە لای خۆی و پێی گەیاند .

لە ساڵی ۱۹۰۱ زدا خەلاّتی نۆبڵی لە فیزیکدا پێبەخشرا، ئەمەیش بە یەکەمین خەلاّت دادەنرێت کە لە ڕشتەی فیزیکدا درابێت .

ساڵی ۱۹۲٤ز لە شاری میونخ – ئەڵەمانیا کۆچی دوایی کرد .



# یۆهان سیباستیان باخ.....

**١٦٨٥ ز - ١٧٥٠ ز**

**Johann Sebastion Bach**

باخ ... دانەری مۆسیقایی مەزن ، یەکەم هونەرمەندێکی مۆسیقازان بوو لە پەیداکردنی ڕازاوترین چەشنو شێوە بۆ پێکەوە بەستنی ئەو شێوازە نەتەوەییانەی کە لە مۆسیقای ئەورووپای ڕۆژاوادا وەك نەریتێکی نەتەوەیی باوبوون (بەتایبەتی لە ئیتالیا و فەڕەنساو ئەڵەمانیادا) ، هەروەها برەوەی‌دا بە پێزو بە چێژکردنی هەریەکە لەو چەشنو شێوانە بە جیاجیا .

باخ هەرچەندە لە یەکەم ٥٠ ساڵەی دوای مردنیدا تا ڕادەیەك فەرامۆش کرابوو بەڵام لە پاش ئەو ماوەیە بەرەبەرە بلیمەتی و ناوبانگی لە گشت جیهاندا دەنگی‌دایەوە . خۆ بە ڕاوتەگبیری شارەزایانو پێزانان

بێت ، یەکێکە لەو دوو ... یان سێ دانەرە مۆسیقازانانەی کە لەم جیهانەدا ژیاون ، بەرای هەندێکیش بە هەرە مەزنترین مۆسیقازانی سەر ئەم زەمینە دادەنرێت .

باخ سالی ١٦٨٥ ز لە شاری ئایسناخ – ئەڵەمانیادا لە دایك بووە . خۆشبەختی لەوەدا بوو کە لە نێوەندێکی هونەر بەهرەدا پەروەردە کرا ، بەو کارە هونەریانەوە بەرهەمە بەپێزانە گۆش‌کراو بوونە هاندەرێك بۆی . لە راستیدا بنەماڵەکەیان هەر لەپێش لە دایك بوونی باخ‌یشدا هەر ناودارو بەرزبوون لە هونەری مۆسیقادا بەوەی کە باوکی کەمانژەنێکی لێهاتوو بوو ، دووان لە مامەکانی مۆسیقادانەرێکی بەهرەدار بوون ، هەتا وەکو هەندێ لە ئامۆزاکانیشی زۆر زرنگ‌و لێهاتووبوون لە مۆسیقادا .

باخ لە تەمەنی ٩ سالیدا دایکی مرد ، پاش ئەوە بەسالێك باوکیشی مرد. لە خوێندگای سانت میکایل لە شاری لۆنبێرگ وەرگیراو بواری پێدرا کە بە خۆرایی بخوێنێت . جا لەبەر ئەوەی کە هەژارو دەستکورت بوو ، دەنگێکی پڕ سۆزیشی هەبوو . هەرکە خوێندنی تەواوکرد دانرا بە کەمانژەنی ئۆرکێسترا لە خوێنگاکەدا . لەو ٢٠ ساڵەی دواییندا چەند کارو فەرمانی پێسپێرا ، هەر لەو ماوەیەیشدا ناوی دەرکرد بە ئۆرگژەنێکی بە توانا و دانەر ، ئوستادێکی مۆسیقاو رابەرێکی بالا لە ئۆرکێسترادا .

سالی ١٩٢٣ز لە تەمەنی ٣٨ سالیدا دامەزرا بە فەرمانبەر لە

کەنشتەی سانت تۆماس لە لایپزیگ بە ناوی سەرۆکی خۆشخوانان[1] ، ئیتر لەو ٢٧ ساڵەی دوا ژیانیدا لەسەر ئەو فەرمانەی مایەوە تا لەساڵی ١٩٥٠ زدا کۆچی دوایی کرد .

هەرچەندە باخ هەمیشە ژیانێکی گۆشەگیری دەبردەسەرو لە توانایشیادا هەبووکە خۆی و خێزانەکەی بەباش بەخێو بکات بەلاّم گەر سەرنج بدەین ئەوەندەی مۆزارت Mozart و بێتهۆڤن beethoven ناسراوو بەناوبانگ نەبوو لە هەرەتی ژیانیدا تەنانەت ئەوەندەی فرانز Franze و شوپان chopin یش ناوبانگی نەبوو . هۆکەیشی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە هیچ کەسێك لە سەردەمی ژیانیدا دانی بە بلیمەتی ئەودا نەدەهێنا . هەتاوەکو دەگێرنەوە لە لایپزیگ ئەنجومەنی شارەکە بریاریدا بە دامەزراندنی مۆسیقاژەنێکی پلەی یەکەم . جا دەستەی تاقیکردنەوە ئەوەندە لە (باخ) یان رانەدەبینی کەبتوانێت بەم کارەهەڵبسێت، بەلاّم پاش رارایەکی زۆرو نەهاتنی دووان لەو یەکەم کەسانەی کە هەلبژێررا بوون بۆ ئەم کارە ئینجا باخ‌یان دەسنیشان کرد . پێش ئەوەی ئەم کارە بگرێتە ئەستۆ بۆ چەند ساڵێك لە یەکێ لە کۆشکی دۆقەکاندا وەك ئۆرگژەنێك کاری دەکرد ، سەیر ئەوەیە کە کاتێك وویستی واز لەو کارەی کۆشك بهێنێت و خوی بگەیەنێتە ئەو فەرمانە نوێیەی ، دۆق هەستی بەو جموجوڵییەی کرد ورازی نەبوو کۆشك بەجێ بهێلێت ، جا لە ترسی ئەوەی نەوەکو رابکات خستیە زیندانەوە ، نزیکەی سێ هەفتەی لە زیندان بردە سەر تاکو دوق دڵی نەرم بووو بەرەلاّی کرد :

باخ لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا کیژی دووەمی مامەکەی مارەکردو

حەوت منداڵی لیّبوو، بەڵام لە تەمەنی ٣٥ ساڵیدا ژنەکەی مرد ، لە ساڵی دواییدا ژنێکی تری هێنا، لەمیش سیانزە منداڵی لیّبوو. لەو منداڵانەی... تەنها نۆیان لە ژیاندا مانەوە ، چواریان لەوانە بوونە مۆسیقازانێکی بەهرەدارو لێهاتوو .

باخي مەزن ناسرا و بووە بە دانەرێکی مۆسیقای فرەبەرهەم. نزیکەی ٣٠٠ کانتاتا Cantateی داناوە (بریتی‌یە لە داستانێك کە لەسەر ئاوازی مۆسیقا بەدەنگی کۆرس بووترێت بەبێ نواندن) . کۆ مەڵێك لە ٤٨ فیوجیو Fugue (بریتی‌یە لە دانراوەیەکی مۆسیقایی کە چەندین دەنگ بەشدار دەبن بە گوێرەی رێساکانی مۆسیقا) . سەرەرای ئەوەیش چەندین پێشەکی مۆسیقایی‌داناوە کە برێتین لە زیاتر لە ١٤٠ پێشەکی Overture زیاتر لە ١٠٠ دانراوی مۆسیقایی لەسەر هارپ ، ٢٣ کونسەرتۆو چوار پارچە مۆسیقا بۆ پێشەکی ئۆپێرا و ٣٣ سۆناتا ، ٥ دانراوی مۆسیقای کەنشتەیی‌و چەندین پارچە مۆسیقای تر . گەر ئەمانە هەموو کۆبکرێتەوە خۆی دەداتە زیاتر لە ٨٠٠ پارچە مۆسیقا کە لە ژیانیدا دایناییّت .

باخ ،لۆثەررەو بووە ، باوەری زۆر بە ئایین بووە ، دەیویست هەمیشە مۆسیقاکانی بۆ خزمەتی کەنشتە بێت ، لەبەر ئەوە گەر سەرنج بدەین زوربەی کارە مۆسیقاییەکانی مۆرگی ئایینی پێوە دیارە. مۆسیقاکانی هەروا بەم چەشن‌و رێبازە دەرۆیشت‌و هەوڵی نەئەدا شێوەی تری تازە دابهێنێ .

**ئەو بەرهەمە مۆسیقاییانەی کە لە لووتکەدابوون هەروا بە نەناسراوی مانەوە هەتاکو ٥٠ ساڵیش لە دوای مردنی . بەڵام لە پاش ساڵی ١٨٠٠ زوە ئەستێرەی گەشی هەڵیدایەوە و شەوەزەنگی هونەری مۆسیقای سەرانسەر رۆشەن کردەوە . سەیریش ئەوەیە مۆسیقاکانی بەچەشن و مۆرگێکی کۆن ناودەبرا لەسەردەمی ژیانیدا . بەڵام ئێستا ... پاش تێپەربوونی ٢٠٠ ساڵ بەسەر ئەم بەرهەمە مۆسیقایانەیادا دەردەکەوێت کە ئەم بەرهەمە نایابانە .. ئەم بەرهەمە بەپێزو بڵاوانەی شایستەی رێزو شاباش و ئافەرینە .**

---

(١) سەرۆکی چوق کەنشتە پێی دەڵێن کانتۆر Cantor...... وەرگێر

○



# لاوتزۆ...

لەسەدەی چوارەمی
پێش زایینیدا ژیاوە

Lao Tzu

لاوتزۆ کە نازناویەتی (واتە پیریاد)[1] هاوچەرخی کۆنفۆشیۆس بووە. لە باکووری چیندا لە دایك‌بووە و هەر لەوێیش ژیاوە . وەك مێژووناس‌و فەرمانبەرێکی لێپرسراو لە ئەرشیفی میریدا ژیانی گوزەران کردووە لە شاری لویانگ پایتەختی پاشایانی بنەماڵەی تشو .

لاوتزۆ بە دانەری مەزنترین رێبازنامە (تاو - تو - تشنگ) دادەنرێت کە خوێنرابێتەوەو گۆڕابێت بۆ زمانەکانی تر . ئەم رێبازەیشی کە بە شێوەیەکی بەپێز دەدوێت لەسەری بریتی‌یە لە رێبازگەی سروشتی‌ی (یان سروشتبەندی).

ناوەڕۆکی (تاوایەتی) کە ناوی ڕێبازگەکەیە دەدوێت لەسەر ئەوەی کە مەردوم نابێت دژی (تاو) بێت، بەڵکو بایەتە ڕام بێتو بە تەواوی پەیرەوی بکات . خۆهەڵکوتانیش بۆ دەسەڵاتو فیزو خۆزلگرتن کارێکی ناهەموارو نارەوایە جگە لەوەیش کە کارێکی بەدخووانەیە . جا ئەوەی بیەوێت لە ژیانیدا نەدۆڕێت پێویستە لەگەڵ (تاو) دا هەمیشە گوزەران بکاتو ئاشنابێت .

ئەوانەی کەتاوپەرەن دەڵێن : ئاو لەوپەری روونو ناسکیدایە ، زۆر بەخوایشتیو ئاسانیش ڕۆدەبێتە نزماییەکانەوە، بەهاواری هەموو لاوازێکەوە دێت بەبێ هیچ بەرهەڵستیەك ... هەرگیز ناتوانرێت ئاو بشکێنرێتو لەناو ببرێت ، کەچی سەخترین بەردو تاوێری زۆر زل گەر سەردەمێکی بەسەردا بڕوات... تووشی تێکشکاندنو نەمان دەبێت .

سەبارەت بە خودی مەردومەوە .. ئاسودەییو ژیانێکی سروشتبەندیی تەنها ئامۆژگاریو ڕێبازێکە بۆ دوورکەوتنەوە لە هەموو توندوتیژی و پوولەکییەك . پێویستە لەسەر مەردوم بەچاوێکی سووكو بە فیزو بێبایەخانەوە هەوڵنەدات بۆ خاسکردنی جیهان بەڵکو بەپێچەوانەوە .. دەبێت زۆر بەگرنگیو ڕێزەوە تێی بڕوانێت .

سەبارەت بە دەوڵەتیش سسترەوی و پەلەنەکردن باشترینو چاکترینو پتەوترین سیاسەتە . گەر یاسای زۆر دانراو سازێنرا ، وەیان دەستوورە کۆنەکان زۆر بەزەبری دڕندەیی خرانەگەڕ .. ئەوا کاروبار ئەوەندەی تر ئاڵۆزو شێواوتر دەبێت . باجی زۆرو بەرنامەی پێشکەوتنو شەڕوشۆڕ .. ئەمانەو چەندین کاریتر لە دەوڵەتدا دەبنە هۆی شکست هێنان لە یەزدی فەلسەفەی (تاو) دا .

هەرچەندە تاوایەتی لە سەرەتادا وەك باوەڕێكی فەلسەفیی پساتی شكۆفەی كردو هاتەكایەوە، بەڵام بەرەبەرە لە دواییدا بووە بزوتنەوەیەكی ئایینی، پاشان چەند گۆڕانێكی هات بەسەرداو هەندێ بڕوای ئەفسونی كەوتە نێویەوە بە چەشنێكیوا كە زۆر لە نەریت‌و ئامۆژگاریەكانی لاوتزۆ لابدات .

هەرچەندە ئەم ڕێبازگەی لاوتزۆ (تاوایەتی) لە نامیلكەیەكی قەوارە بچوكدا خۆی دەنوێنێت، بەڵام زیاتر لە كۆنفۆشیۆس بەكاریگەرتر بووە لە چیندا . لە وولاَتانی خۆرنشیندا بە نزیكەی چل جاری جیاواز گۆڕاوە بۆ زمانی ئینگلیزی، كەچی ئەوەندەی سیارەی پیرۆزی دیان بایەخ‌و باوی نەبووە لە نێوانیاندا . هەر چەندەیش تەنها كۆنفۆشیۆسیی فەلسەفەی باوبووە لە چیندا، بەڵام لاوتزۆ تەنانەت لای كۆنفۆشیۆس‌باوەڕەكانیش زۆر بەڕێزو پیرۆز بووە. هەر لەم ڕۆژنەوە دیارە كە چۆن بڕوای تاوایەتی خۆی ئاخنیوەتە نێو بڕواو ئامۆژگاریەكانی كۆنفۆشیۆسەوەو ملیۆنان كەس پەیڕەوییان كردووە . كەچی لەگەلْ ئەوەیشدا زۆر كەم هەن كە خۆیان بە پەیڕەوانی تاو دابنێن بەلاَم دەبێت ئەوەیش بزانین كە هیچ فەیلەسوفێك جگە لە كۆنفۆشیۆس نەگەیشتۆتە ئەو پلەو پایەی لاوتزۆ .

---

(١) پیریاد : پیرەمامۆستا .



# ئێنریکۆ فێرمی...

١٩٠١ ز - ١٩٥٤ ز

**Enrico Fermi**

فێرمی ئەو زانا مەزنەیە کە یەکەم کارلێکگای گەردیلەیی Atomic reactor سازاند، ساڵی ١٩٠١ ز لە شاری ڕۆمای ئیتالیا لە دایك بووە ، زانکارێکی[1] هەڵکەوتووو بەهرەدار بووە . لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا دکتۆرانامەی لە فیزیکدا وەرگرت . لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا بووە ئوستاد لە زانکۆی ڕۆما . لەو ساڵانەیرا یەکەم نامەی لە فیزیکدا بڵاوکرایەوە کە تایبەت بوو بە ئاماری کوانتەم Quantum Statistic .

ساڵی ١٩٣٨ ز خەڵاتی نۆبڵی لە فیزیکدا پێدرا ، ڕشتەکەیشی لە بارەی ئەلەکترۆن مژینەکانەوە بوو Electron absorptions

ئیتالیای ئەو سەردەمە ڕژێمی فاشی بەسەرۆکایەتی مۆسۆلینی

فەرمانڕانی دەکرد ، فێرمیش وەك هاوولاتییەك ناخۆش گوزەرانی دەکرد ، جا چونکە ژنەکەیشی جوولەکە بوو ئیتر ئەوەندەی تر بەدرەفتارییان لەگەڵ دەکرد ، فێرمی هەر بەخۆیشی حەزی بەو رژێمە نەبوو .

لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٣٨ زدا کە چوو بۆ ستۆکهۆڵم بۆ وەرگرتنی خەلاتەکەی ئیتر لەوێوە نەگەڕایەوە بۆ ئیتالیا بەڵکو خۆی گەیاندە نیۆیۆرك ، لە زانکۆی کۆڵۆمبیا بەگەرمی پێشوازی لێکراو خۆشنوودی خۆیان دەربڕی بە هاتنی یەکێ لە زانا مەزنەکانی جیهان بۆ نێو دەستەی مامۆستایانی زانکۆ ، ساڵی ١٩٤٤ ز بووە هاوولاتیەکی ئەمەریکایی‌و رەگەزنامەی پێدرا .

لە ساڵی ١٩٣٨ زدا دەریخست کە مژینی ئەلەکترۆنەکان هەندێ جار دەبێتە پەرتاندنی گەردیلەکانی Atomic Fission یۆرانیۆم ، جا کاتێك ئەو راپۆرتەی بڵاوکرایەوە دەسبەجێ پاش لێکۆڵیەوەیەکی قووڵ بۆی دەرکەوت کە ئەگەر گەردیلەی یۆرانیۆم بپەرتێنرێت ئەوا ئەوەندە نیۆترۆن دەردەپەڕێت کە بەس بێت بۆ دەسپێکردنی رەچە کارلێکردن Chain Reaction ، هەر بەدوای ئەمەیشدا یەکسەر ترسی ئەوەی لێنیشت کە بۆ مەبەستی جەنگ‌و وێرانکردن بەکاربهێرێت .

بۆ چەلاندنی کارەکەی ساڵی ١٩٣٨ ز پەیوەندی بە نیرۆی دەریایی ئەمەریکاوە کرد تاکو دارندەی بکەن لە وەراری چەکی گەردیلەییدا ، بەلام ئەوەبوو چەند مانگێك بەسەر ئەم داخوازییەیدا چوو هێشتا دەوڵەتی ئەمەریکایی نەیخستبووە بەرنامەی خۆیەوە کە بایەخ‌و گرنگی بە ووزەی گەردیلەیی بدات .

جا کە دەوڵەتی ئەمەریکا هاتە سەر ئەوەی گرنگی بدات بە ووزەی

گەردیلەیی کەوتە نەخشاندنو ڕێخۆشکردن بۆ دروستکردنی یەکەم کارلێکگای گەردیلەییو ... دڵنیابوون لەوەی بزانێت ئایا دەشێت ڕەچە کارلێکێك پەیدابکات؟ هەر بۆ ئەم مەبەستەیش پەیوەندی کرا بە زانای مەزنەوە فێرمی ، لە بەر ئەوەی کە یەکێ بوو لەو زانا مەزنانەی گرنگی دەدا بەم کارە هەڵبژێرا بە سەرۆکاری ئەو کۆمەڵەی کە پێکهێنرابوو بۆ دروستکردنی یەکەم کارلێکگای گەردیلەیی .

زانای مەزن فێرمی،یەکەم جار لە زانکۆی کۆلۆمبیا کاری دەکرد ، پاشان چووە زانکۆی شیکاگۆ ، لەوێ لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٢ زدا گەیشتە ئەوەی ئەنجامی دروستکردنی یەکەم کارلێکگای بە سەرکەوتووانە بلاوبکاتەوە کە ئەمەیش بە سەرەتای چەرخی گەردیلە دادەنرێت .

ئەوڕۆژەی کە بۆ یەکەم جار لە مێژوودا مرۆڤ بەکارێکی وەها مەزن هەڵدەستێتو سەرکەوتووانە بە ئەنجامی دەدات.فێرمی لە پاش جەنگ بووەوە ئوستاد لە زانکۆی شیکاگۆ. لەگەڵ ژنەکەیو دوومناڵەکەیدا ژیانی گوزەران دەکرد تا لە ساڵی ١٩٥٤ زدا کۆچی دوایی کرد، لەبەر ڕێزو یادکردنەوەیشی توخمی سەدەمینیان لە خشتەی توخمەکاندا ناونا فێرمیۆم Fm .



# تۆماس مالتۆس...

١٧٦٦ ز - ١٨٣٤ ز

Thomas Malthus

ساڵی ١٧٩٧ ز مەردێکی ئینگلیزی نەناسراو بە ناوی تۆماس مالتۆس... نامیلکەیەکی بڵاوکردەوە بە ناوی «ووتارێك دەربارەی بناغەی ژمارەی دانیشتوانەوەو کاری بۆ سەر دوارۆژو فرازیێی کۆمەڵ». ئەم ووتارە کاریگەیکی زۆر گەورەی گیرا لەنێو پساتدا.

ناوەرۆکی نووسینەکەی لە تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان دەدوێت لە سەر بڕشتو بە بەرهەمهێنانی خواردەمەنی لە جیهاندا. ئەم بیرەی بەشێوەو یەکالاکردنێکی سەختو توند هێنایە پێشەوە. بۆ زیاتر روونکردنەوەی دەیگوت کە ژمارەی دانیشتوان واتە مەردوم بە شێوەیەکی ئەزگارەندازە geometrical progressiom زۆر دەبێت واتە

(١، ٢، ٤، ٨، ١٦....هتد) بەڵام خۆراكو وویستەمەنیەكانی جیهان بە شێوەیەكی ئەزگارەژمێرە Arithmatical progression زۆر دەبێت واتە (١، ٢، ٣، ٤، ٥.... هتد). دەرەنجامی ئەو ئەوەبوو كە رۆژێ دێت مەردوم بە هەژاریو نائومێدی گوزەران بكاتو برسێتی زۆری بۆ بهێنێت. تەنانەت ئەگەر چەرخی رۆژگاریش بگۆڕێت هیچ ئەو شێوازو ئامرازە تەكنۆلۆجیانە ئەم كێشەیان بۆچار ناكرێت، چونكە زۆربوونی خواردەمەنی تارادەیەكە بەڵام تەقینەوەی ژمارەی مەردوم زۆر زۆرترە لەوەی گەر بەراوورد بكرێت لەگەڵ توانای زەویدا بۆ بەرهەم هێنانو گەشندەی خۆراك تاكو مەردومی پێدا كەوێت. بەڵام ئایا دەتوانرێت بەرەنگاری ئەم تەقینەوە بكرێت... ئیتر بە هەرچی ڕێگەیەك بێت؟ رەنگبێت بتوانین بڵێن ئاخۆ.. جەنگ، كارەسات، دەردو نەخۆشیە درمەكان كە زیاتر بە شێوەیەكی سەرەكی هەن دەبنە هۆی كەمكردنەوەی مەردوم! جا ئەم پەتەی كە لە گەردنی مەردومدا ئاڵاوە سەلماندویەتی كە ئەمانە هۆیەكی (كاتی)ن بۆ سەرفەرازیو رزگاركردنی ژمارەی مەردوم بە شێوەیەكی نابەجێ.

ماڵتۆس پێشنیاری دەكرد كە بایەتە خۆدامركانەوە یان خۆراگرتن بەكاربهێنرێت وەك دواخستنی هاوسەریی وفەرامۆشكردنی، وەیان خۆدوورخستنەوە لە زاوزێكاری، بەڵام بە كردەوە سەرنجی دا كە زوربەی كەس ئەمانە بەكارناهێننو بگرە لەم كارانەیش تا رادەیەك بە دوورن. تا لە دواییدا تەواو چووە بنجو بنەوانی كێشەكەو گەیشتە ئەو دەرەنجامانەی كە تەقینەوەی ژمارەی مەردوم هیچ هێزێك ناتوانێت

ڕاببوەستێنێت. تازە شەڕێکەو بەتووشیەوە بووە با خەڵکێکی زۆریش چاوەڕوانی هەژاری بێت. ئای کە دەرەنجامێکی ڕەشبینە!!!!

لەگەڵ ئەوەیشدا گەر سەرنج بدرێت مالتۆس هیچ بیرێکی لەبارەی هۆیەکانی بەربەستی زایینەوە نەهێنایە پێشەوە چونکە بەستبوویەوە بە ئەنجامێکی سروشتی چەند بیرێکی سەرەکی.

یەکەم کەسێك کە بیرکی بەربەستی فرازیێی خستە ڕوو مێرخاسێکی بەریتانی بەناوبانگ بوو بەناوی فرانسیس پلاس (١٧٧١ز – ١٨٥٤ ز)، ووتارەکەی مالتۆس کارێکی زۆری کردە سەر، لەسەر ئەوە لە ساڵی ١٨٢٢ زدا پەڕاوێکی نووسی تیایدا ئامۆژگاری دەدا لە بەکارهێنانی ئەو هۆیانەی کە دەبنە بەربەستی فرازیێی، هەر بەمەیشەوە نەوەستا بەڵکو بانگەوازێکیشی بڵاوکردەوە لە نێوچینی کرێکاراندا بۆ ئەم مەبەستەی.

ئەوەی کە زۆر گرنگ و سەرنج ڕاکێشە لە ئامۆژگاییەکانی مالتۆسدا ئەوەیە کە دۆخێکی زۆر باڵاو کاریگەری هەبووە لە چەسپاندنی بیردۆزە ئابووریەکاندا. زانا ئابووریەکان هەر لەمەوە بۆیان دەرەنجام بووە کە زۆر بوونی مەردوم لە بارە سروشتیەکاندا ڕێ لە بەرزبوونەوەی کرێ دەگرێت. جا لەم بوارەیشدا ئابوورزانی بەریتانی بەناوبانگ (داڤید ڕیکاردۆ) دۆستی نزیکی مالتۆس ئەوەمان بۆ

دەخاتە روو کە نرخی کار بریتی‌یە لەو نرخە پێویستەیەی کە تا کرێکاران بتوانن بە مشەو خۆشنوودی بگوزەرێن تاکو رەگەزی مەردوم هەر لە بەردەوامیدا بێت بەبێ کەم‌وزۆر. ئەم بیردۆزەی کە زیاتر ناودەبرێت بە (قانونی کرێی ئاسنین) زۆر دژواری بیروراکانی کارل مارکس بوو... تەنانەت بە کۆسپێکی سامناکیشی دانابوو لە رێی بیردۆزەکەیدا بە ناوی (نرخی سەررریژ Surplus value یان The tax of plus vaiue).

هەروەها راکانی مالتۆس کاری کردبووە سەر لێکۆڵینەوەی زیندەناسەکان بە تایبەتی لە بیردۆزەکەی داروینی زانادا. خوێندنەوەی ووتارەکەی مالتۆس «ووتارێك دەربارەی ژمارەی دانیشتوانەوە) تەواو کاری کردبووە سەر داروین‌و زۆر رێی بۆخۆشکرد، بووە پاڵهێزێك بۆ پتەو کردنی بیردۆزەکەی دەربارەی (سروشت بژارە Natural Selection).

ژینباری مالتۆس لە ساڵی ١٧٦٦ زیەوە دەست پێدەکات کاتێك کە لە شاری (دورکنگ)ی سەر بە هەرێمی (سیری) لە بەریتانیا لە دایك بووە. ساڵی ١٧٨٨ ز کۆلێژی دیانی سەر بە زانکۆی (کامبورج)ی تەواو کردووە، هەر لە هەمان ساڵیشدا بووەتە تەرسایەکی ئەنگلیکانی.

یەکەم چاپی پەراوە بە ناوبانگەکەی پەخش‌و بڵاوبووەوە بەبێ ئەوەی کەس بیناسێت.

ئەم پەڕاوەی لەبەر ئەوەی کە زۆر برەوی هەبوو لای خەڵك، زۆر بە خێرایی بڵاوبووەوە ناوێکی بێهاوتای پەیدا کرد لێوەی، لە پاش ٥ساڵ جارێکی تر چاپێکی تری بە درێژی بڵاوکرایەوە. چەندین جاری تریش چاپکرایەوە دوای ئەوەی کە بژارە کراو شتی تری خرایە سەر ساڵی ١٨٢٦ ز چاپی شەشەمیشی بڵاوکرایەوە.

ماڵتۆس لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا ڕێکەوتی ١٨٠٤ ز ژنی هێنا، لە ژیانیدا چەندین پەڕاوی تری نووسیوە لە ئابووریدا، بەڵام لە دواژیانیدا گرنگترین پەڕاوی بڵاوکردەوە بە ناوی (بنەڕەتەکانی سیاسەتی ئابووری ی). ئەم پەڕاوەی تەواو خورپەی خستبوە بیرە بە پێزەکانی ئابورزانی بە ناوبانگی سەدەی بیستەم (جۆن مینارکینز).
لە دواژیانیدا کە بە ناوبانگ بوو بوو خەڵك زۆر ڕێزی لێدەگرت و

ناسناوێکی بالآی پەیدا کردبوو لە نێویاندا.
ساڵی ١٨٣٤ ز لە تەمەنی ٦٨ ساڵیدا ئەو زانا مەزنە نزیك بە شاری (پاث) لە ئینگلتەرە کۆچی دوایی کرد.

○



# فرانسیس باکۆن...

١٥٦١ ز - ١٦٢٦ ز

Francis Bacon

دادەنرێت بە مزگێنی بەخش و نێرەری چەرخی نوێی زانست، بە یەکەم فەیلەسوفێك کە پەی بردبێت بەوەی کە زانست و تەکنۆلۆجیا رووی جیهان دەگۆرن، زۆر بە توندیش پشتیوانی لە زانستگەری کارا دەکرد.

فرانسیس باکۆن کە کورە گەورەی باوکی بوو ساڵی ١٥٦١ ز لە شاری لەندەن لە دایك بووە، باوکی فەرمانبەرێکی گەورەی میری بووە لە سەردەمی فەرمانرانی خاتو ئەلیزابێت شا لە بەریتانیا. لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا لە کۆلێژی ترنتی - زانکۆی کامبرج وەرگیرا بەڵام پاش ماوەیەك وازی لە خوێندنەکەی هێنا، لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا بووە

یەکێك لە فەرمانبەرانی باڵوێزی بەریتانیایی لە پاریس. لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا باوکی مردو هیچ سامانێکیشی بۆ باکۆن بەجێ نەهێشت لەبەرئەوە ناچاربوو بگەڕێتەوە سەر خوێندنەکەی‌و دەستکردن بە خوێندنی رشتەی قانون. لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا لە پیشەی پارێزەری‌دا وەرگیرا. لە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا بە ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیایی هەڵبژێررا. خاتو ئەلیزابێث شا زۆر رکی لێ‌دەبوەوە چونکە لە پەرلەماندا دژی پرۆژەکەی (زۆر کردنی میرانە) رادەوەستا.

باکۆن ماوەیەك بووە دۆست‌و راوێژباری کابرایەکی ئەرستوکراتی بە ناوی (ئیرلێ ئەسکس). جا لە کاتێکدا ئەسکس بریاریدا کۆدەتایەك بەرپا بکات دژی خاتو ئەلیزابێث، هەرچەندەیش باکۆن چەند جار ئاگاداری دەکردەوەو سەزرەنشتی دەکرد لە نەکردنی بەڵام ئەسکس هەر کۆلی نەدا، سوور بوو لە جێ‌بەجێ‌کردنی کۆدەتاکەی تاکو لە دوایدا شکستی هێنا، باکۆنیش لە رێ‌ی دادگاوە توانی بە دوای بکەوێت تاکو لە سێدارە درا. ئەم کارەی بووە هۆی بەرز بوونەوەی بێزاری‌و نارەزایی دژی باکۆن لە نێو چینەکانی گەلدا.

ساڵی ١٦٠٣ ز شابانۆ مرد، باکۆن پاش ئەوە بووە یاوەری جێمس شا... یەکەم جێنشینی شابانۆ. هەرچەندە جێمس شا ئەوەندە گوێ‌ی نەدەدایە ئامۆژگاریەکانی بەڵام هەر حەزیشی بە دۆستایەتی دەکرد.

لە سەردەمی فەرمانرانی جێمس شادا چەند پلەو پایەیەکی بەرزی لە میریدا پێدرا تا گەیشتە ئەوەی بووە دادی دادوەران هەر بەوەیشەوە نەوەستا ناسناوی (بارۆن) و پاشان (فسکۆنت)ی پێدرا.

باکۆن بەرەبەرە نەگبەتی رووی تێکرد، تاوانبارکرا بە بەرتیل

وەرگرتن، هەرچەندە لەو سەردەمەدا زۆر باو بوو. بەڵام ناحەزانی لە پەرلەمانداثەمەیان بە هەلزانی تاکو لە کارو دەسەڵاتی بخەن. باکۆن بەخۆیشی دانی بەو تاوانەیدا هێنا، سزادرا بە زیندانی لە کەلووی لەندەن، جگە لەوەیش خاوەیەکی (1) زۆری خرایە سەر و فەرمانیشی بۆ دەکرا کە نابێت هیچ کارێکی میری بدرێتێ تا دوا ژیانی.

هەر چەندە ئازاد کراو خاوەکەیشی لەسەر لابرا بەڵام ژیانی سیاسی دۆڕاند. جارێك لەسەر بڕیاری پەرلەمان هەڵیدایەو ووتی «من خۆم... دادپەروەرترین قازی بوم لەم پەنجا ساڵەدا، بەڵام بڕیاری پەرلەمان دەرهەق بە من ۲۰۰ ساڵیش دەبێت دادپەروەری وای بەخۆیەوە نەبینێوە».

فرانسیس باکۆن بەو کارنامەو نوسراوانەی ناوبانگی دەرکرد. یەکەم نووسراوی کە ساڵی ۱۵۹۷ ز دەرچوو بە ناوی (چەند ووتارێك) بوو هەر چەندە بە شێوازێکی ڕەخنەگرانەی خۆش هۆنیبویەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر بە چێژو سەرنج ڕاکێش بوو، لەو ووتانەیدا دەڵێت: گەنجان دەپۆرێن (2) بۆ داهێنان زیاتر لە دادوەری، دەپۆرێن بۆ کار ڕاپەڕاندن زیاتر لە وەی ئامۆژگاری بدەن، دەپۆرێن بۆ کارکردن لەسەر پڕۆژە نوێکان زیاتر لەوەی دووره پەرێز کاری جێگیر بگرن، بەڵام پیرانو گەورە پیاوان زۆر بەرهەڵستیان لێ دەوەشێنەوە و زۆر کاتیش بەڕاوێژ کردن دەبەنە سەر گەرچی جاروباریش جموجوڵیان هەبێت. جا باشترو چاکتر وایە سوود لە هەردوولا وەربگیرێت چونکە چاکی هەرکامێکیان نەنگی ئەوەی تریان ڕاست دەکاتەوە.

هەروەها دەربارەی ژن‌و مێرد دەڵێت «ئەوەی ژن‌و منداڵی هەبێت، وەکو ئەوە وایە کە بارمتەی دابێت بە بەختی لە ژیانیدا».
نووسینە مەزنەکانی لە فەلسەفەی زانستەکاندا بە ناوی (نوێکردنەوەی مەزن) بریتی‌یە لە شەش بەرگ، بەرگی یەکەم دەدوێت لە باری زانیاری ئێستەمان، دووەم پەسنی ڕێگەیەکی نوێ دەکات لە زانستگەریدا، سێهەم بریتی‌یە لە کۆمەڵە زانراوەیەکی تاقیکراوە (کە بە تاقیکردنەوەیەکی زانستانە دەستی کەوتووە)، چوارەم چەند نموونەو روونکردنەوەیەکی خۆیەتی بە ڕێگەیەکی زانستانە پێنجەم بریتی‌یە لە هەندێك دەرەنجامی کاتی، شەمەی دوایی شیکردنەوەی کۆمەڵە زانراوەیەکی هەمە جۆرە کە بە ڕێگەیەکی زانستانە پێی گەیشتبووە ئەنجام.
بەڵام نایابترین نووسینی کە نەیتوانی تەواوی بکات بە ناوی (پێشکەوتنی زانیاری)... دادەنرێت بە مەرنترین نووسراو کە دەرکەوتبێت لە سەردەمی ئەرەستۆوە، ئەم پەڕاوەی لە ساڵی ١٦٠٥ز وە دەستی پێکرد.

نووسراوێکی تری بە ناوی (ئامرازە نوێکان) دەرکرد کە بریتی یەو لە بانگەوازێك بۆ بەکارهێنانی ڕێبازێکی تاقیکراو لە زانستەکاندا.
نووسراوێکی تریشی کە بە ناوی (ئەتلانتی نوێ) دەرچوو بریتی یە لە پەسنی کۆمارێکی ئەرمانی «ئایدیالی» لەسەر ئۆقیانوسی ئەتلەسی. ئەم نووسراوەی دەمانگەڕێنێتەوە بۆ نووسینەکەی (تۆماس مۆر) بە ناوی (یۆتۆپیا)، بەڵام تارادەیەك بیرەکەی باکۆن جیاوازی هەیە لەگەڵ بیرەکەی تۆماس مۆردا.

باکۆن لەو بڕوایەدا بوو کە خۆشنوودیو بەرژەوەندی کۆمارەکەی لەسەر بیرێکی زانستانەی بەپیت رادەوەستێت. دەیویست ئەو چەمکە بخاتە ئەوروپاوە کە دەڵێت زانستگەری دەتوانێت خۆشیو ئاسودە پێشکەش بە مەردوم بکات هەروەکو چۆن دانیشتوانی لەندەکەی لە کۆمارە ئەرمانیەکەیدا لە سایەیدا دەژین.

---

(۱) خاوە: باجی بەزۆر، سەرانە.

(۲) دەپۆرین: لەبارن.



# ڤۆلتێر...

١٦٩٤ ز - ١٧٧٨ ز

**Voltaire**

فرانکۆ ماریا ئۆدێت ناسراو بە نازناوە وێژییەکەی ڤۆلتێر... مەردێکی پێشەنگ بووە لە بزوتنەوەی رۆشنبیری فەرەنسا لەسەدەی هەژدەمدا. دەستێکی بەجگار باڵای هەبووە لە نووسینی هۆنراوە، شانۆگەری، ووتارو پەخشان، چیرۆك، مێژوو، فەلسەفە... جگە لەوەی کە رابەرێکی زۆر بڵند بووە لە ئازاد کردنی بیرو هۆشدا.

ساڵی ١٦٩٤ ز لە شاری پاریس لە بنەماڵێکی خۆشگوزەراندا لە دایك بووە، باوکی پیشەی پارێزەر بووە، ئەمیش هەروەکو باوکی خۆی گەیاندە خوێندنی قانون بەڵام لە دواییدا خۆی لی تەکاندەوە.

ڤۆلتێر زۆر ناسرا بوو بە زیرەکی، بێشبینی، قسەی نەستەق و

هۆنراوەی توانج. بەر لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی فەرەنسا ئەم جۆرە زیرەکیانە بووبوونە بەڵاو مەترسی بۆ خاوەنەکانیان. ڤۆڵتێریش یەکێك بوو لەو کەسانەی‌کە بە هۆی هۆنراوە سیاسییەکانیەوە چەند جار دوچاری زیندانی باستیل‌دەبوو. ئەو ساڵانەی کە لە زینداندا بردیەسەر توانی پەڕاوێك بنوسێت بە ناوی (هێنرید)، ئەم پەڕاوەی سەرنجی زۆر لە نووسەران‌و بوێژانی ئەو سەردەمەی ڕاکێشا. پاش ئازادکردنی لە زیندانیش لە ساڵی ١٧١٨ ز شانۆگەری (ئۆدیب)ی نووسی کە ئەمیش برەوو ئەنجامێکی زۆر گەوارو سەرکەوتووی لەنێو کۆمەڵگادا بە دەست هێنا. لەو دووساڵەی دوا ژیانیدا بەرەبەرە وای لێهات بووە پێشەنگ‌و کەڵەنووسەرێکی بێ‌هاوتا لە کاروانی وێژەی فەرەنسادا.

ڤۆڵتێر چەنێ بلیمەت‌و لێزانبوو لە نووسینی پەخشان‌و ووشە دارشتندا ئاوەهایش زۆرزانبوو... دەیزانی چۆن سوود لەو بلیمەتییەی وەربگرێت‌و ببێتە پیاوێکی دەوڵەمەندی سەنگین‌و پشت‌بەخۆ بەست، ئەوەندەی نەبرد بووە هەرای لەگەڵ یەکێ‌لە پیاوە ئەرستۆکراتیەکاندا، پاش ئەوەی تێروپڕیان لێداو بەهەڵواسراوی میرازێکی باشیان‌کرد... جارێکی‌تر خرایەوە زیندان بەڵام پاش ماوەیەکی کەم ئازادکراو زۆریان لێ‌کرد کە فەرەنسا بەجێ بهێڵێت، ئەمیش ناچار پەنای بردە ئینگلتەرە، لەوێ نزیکەی دووساڵ‌ونیو مایەوە.

ئەو ماوەیەی لە ئینگلتەرە باری ژیانی سەرانسەر گۆڕا، لەوێ فێری ئەوەبوو چۆن بەزمانی ئینگلیزی بئاخاوتێت‌و بنووسێت. لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر سەودای بیرمەندە ناودارەکانی ئینگلیز بوو وەك جۆن

لۆك، فرانسیس باكۆن، ئیسحاق نیوتن‌و ولیەم شەكسپیر، ئەوانەی كەزیاتر كاریان تێكردبوو زانستی ئینگلیزەكان‌و ڕێبازی تاقیكرنەوەیان،.. كارنامەكانی شەكسپیر بوو. بەڵام ئەوەی كە زیاتر هاژو سەرسامی كردبوو ڕژێمی سیاسی ئینگلیزی بوو كە لە دیموكراسی... ئازادی مەردمدا خۆی دەبینیەوە. لەوچەشنە ژیانەی كە دەیگوزەراند لەئینگلترە بۆی دەركەوت تاچ ڕادەیەك جیاوازییەكی زۆر هەیە لەگەڵ ئەو بارە سیاسییانەی كە لە وڵاتەكەیدا باون. جا كاتێ كە گەڕایەوە بۆ فەڕەنسا یەكەم نووسراوەی فەلسەفەی لەساڵی ١٧٣٤ زدا بڵاوكردەوە بەناوی (چەند نامەیەكی فەلسەفەیی)، ئەم نووسراوەی بووە سەرەتایەكی پرشنگدارو ڕاسترەو لە بزوتنەوەی رۆشنبیری فەڕەنسادا، تیایدا زۆر بە ووردی ڕژێمی سیاسی ئینگلیزو كارنامەكانی جۆن لۆك‌و بیرمەندەكانی تر یەكالادەكاتەوە، بەجوانی ڕوونی دەكاتەوەو دەیخاتە ڕوو. ئەم نووسراوەی لەلایەن دەسەڵاتدارانی فەڕەنساییەوە دەستی بەسەردا گیراو دیسان ناچاركرایەوە پاریس بەجێبهێڵێت و بەرەو شاری (سیری) ڕێ بگرێتەبەر كە دەكەوێتە خۆرەلاتی فەڕەنساوە. زۆربەی ئەو پانزە ساڵەی پاش دەكردن لەوێ ژیانی بردەسەر، لەوێیش كەوتە داوی دڵدارییەوە لەگەڵ (مادام دی شایتلیت) كە ژنی (ماركیز)ێك بوو. ئەم ئافرەتە زۆر سەلارو ڕۆشنبیر بوو، بەتەنگ ڤۆلتێرەوە زۆردەهات بەڵام لەساڵی ١٧٥٠ زدا مرد. پاش ساڵێك بەسەر ئەو بەسەرهاتەیدا، لەسەر داخوازی فرێدریكی گەورە پاشای ڕووسیا چوو بۆ ئەڵەمانیا، سێ ساڵ لەكۆشكی فرێدریك‌شا لە پۆتسدام‌دا مایەوە. بەڵام دۆستایەتییان ئەوەندەی نەخایاند لەوێش ناچاركرا لەساڵی ١٧٥٣ ز ئەڵەمانیا بەجێبهێڵێت،

لەپەنایەك نزیك بەشاری جنێف لەترسی فەرەنساو فرێدریك‌شا جیٚ ی خۆی‌بكاتەوە، بەڵام بیرەئازادیەكانی وای لێكرد كە ئەوێش (واتە جنێف – سویسرە) ببێتە مەترسی بۆی، لەبەرئەوە پەنای بردە شوێنێك نزیك بەشاری ڤێرنی كە لەسەر سنووری فەرەنساو سویسرادایە، تاكو بتوانێت لەدوولاوە دەرفەتی هەڵاتنی هەبێت ئەگەر زۆری بۆ هات. لەویٚ نزیكەی ٢٠ ساڵی ژیانی بەئاسوودەیی بردەسەر. لەو ساڵانەی را بەلێشاو زاخاوی دڵی‌خۆی‌و كارەوێژەیی‌و فەلسەفەیەكانی هەڵدەڕشت، هەر لەوێش پەیوەندی دەكرد بەبیرمەندانی ئەورووپاوەو پێشوازی لیٚ دەكردن.

ڤۆڵتێر نووسەرێكی خاوەن فرەبەهرەو زۆر زرنگ‌بوو، ئەو نووسراوانەی خۆی دەدات لەپتر ٣٠ هەزار پەرە، ئەمانەی هەموو بریتین لە چامەی پاڵەوانی‌ی‌و هۆنراوەی ستران، هەندێك نامەی تایبەت بەخۆی، داستان، باستان و چەندین چیرۆك و نووسراوەی ئاینی.

ڤۆڵتێر باوەری بە لێخۆشبوونی ئاینی‌هەبوو، بڕوای وابوو كە پیاوە ئەرستۆكراتیەكان هیچ لەو ژیرترو دادوەرترنین. گوزەشتنامەكانی پیشانمان دەدات كەچۆن بەپەندێكی رێك‌و رەوان رەخنە لەو مافە خواییانەی پاشا دەگرێت، لەوەیش دەكات كە زۆر بە كاریگەرتر بووبێت لە جان‌جاك رۆسۆ لە كۆمەڵگای فەرەنسادا.

O



# جۆن
# کەنەدی...

**١٩١٧ ز - ١٩٦٣ ز**

**John F. Kennedy**

ساڵی ١٩١٧ز لەشاری بڕۆکلین - ماساشوستسی وولاٌتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەدایك بووە. لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٦١ز تاکو ٢٢ تشرینی یەکەمی ١٩٦٣ز سەرۆکی وولاٌتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکابوو. کۆتایی ژیانی بەکوشتن هات لە شاری (دالاٌس)ی سەر بە تەکساس.

هۆی دانانی ئەم پیاوە مەزنە لەنێو ئەم لیستەدا ئەوەیە کە بەسەرکارو لێپرسراوێکی کاریگەرو گرنگ دادەنرێت لە نەخشەو جێبەجێ کردنی بەرنامەی ئەپۆلۆ بۆ ئاسمان. چونکە گەیشتنی مرۆڤ بۆ سەر مانگ لەو رووداوە گرنگانەیە کە پسانی هاژاندو لەوانەیش نیە

تانزیکەی ٥ هەزار ساڵی تریش لەیادبچێت .

جا ئایا جۆن کەنەدی شایانی شکۆمەندییە لەو گەشتە ئاسمانیەدا...؟ باشە... ئەی نابێت ئاورێك لەو دوو پاڵەوانە (نیل ئارمسترۆنگ و ئەدوین ئالدرین) بدەینەوە کە یەکەم کەسێك بوون بێبا کانە پێیان نایە سەر رووی مانگ؟.

لەوەلامدا دەڵێین گەر ئەو سەدکەسی لیستەیە تەنها بەگوێرەی ناوبانگیان ریزبکرێن، ئەو ئازایەتی و گرنگی دەگەرێتەوە بۆ ئەو فرۆکەوانانە، بەلام ئەو دوو بۆشاییەوانە[1] وەنەبێت ئەوەندە ناسراوبووبن. گەر کارەساتێکیان بە سەر بهاتایە بەر لە ئاژۆتنی ئەپۆلۆ دوو II بە دوو مانگ، دەمانبینی چەندین کەسی شارەزاو پێزانی تر جێیان دەگرتەوە. بەلام لەراستیدا گرنگی ئەم کارە مەزنە دەگەرێتەوە بۆ خودی جۆن کەنەدی چونکە بەرودوا هەر ئەو لێپرساو بوو لە جولاندنو خستنەکاری ئەپۆلۆ بۆ گەیشتنی بۆسەر مانگ. هەر ئەو پیاوەبوو کە پرۆژەی ئەپۆلۆی خستە ئاستی راپەراندنو جێبەجێ کردن، پەیمانی دا کە دەبێت وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەستێت بەناردنی کەشتییەکی ئاسمانی بۆسەرمانگ و مرۆڤیشی تیادابێت. گەلی ئەمەریکایی ئەوەندە دەربەستو بەپەرۆش نەبوون بۆ ئەم پرۆژەیە جگە لەوەی کە سامانێکی یەجگار زۆری تێدەچوو، لەبەرئەوە روونو ئاشکرایە کە سەرکەوتنی ئەم پرۆژە گرنگە دەگەرێتەوە بۆ خودی جۆن کەنەدی .

پاش ئەوەی داخوازییەکەی لەکۆنگرێسدا پەسەندکرا، یەکسەر دەستی کردە چەلاندنو جێبەجێ کردنی پرۆژەکە بەسەرپەرشتی تەواوی خۆی، هەندێك کەس ئەم پرۆژەیان زۆر بەگەورە دەهاتە پێش چاو

سەرەرای ئەوەیش پروپووچ و بێسوود بوو لایان کەچی رێزەو و بیرکردنەوەی ئێستای وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەوڕۆژە (رێکەوتی ٢٠ی تەموزی ١٩٦٩ز) بەجەژنێکی نەتەوایەتی دادەنێت. بایەتە ئەوەیشمان لەیاد نەچێت کە رۆژی دۆزینەوەی ئەمەریکا لەلایەن کۆلۆمبسەوە وەکو ئەو رۆژەی بۆ ناکرێت، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر لە مێژووناسەکان هاوبیرن لەسەر ئەوەی کە ئەو رۆژە بەسەرەتای خەملاندنی چەرخی نوێ دادەنرێت لە جیهاندا .

سەبارەت بەو گەشتە مەزنە رۆژێك دێت کە نەوەی دوارۆژ هەست بەگرنگی گەشتەکەی ئەپۆلۆ دوو بکەن (هەروەك گرنگی گەشتەکەی کۆلۆمبس کە چۆن ئۆقیانوسی ئەتلەسی بری) و بە سەرەتای چەرخی نوێی دابنێن لە مێژووی پساتدا .

---

(١) بۆشاییەوان: Astronant.



# گریگۆری پینکەس...

۱۹۰۳ ز - ۱۹٦۷ ز

Gregory Pincus

زیندەزانی ئەمەریکایی گریگۆری پینکەس... کارێکی گرنگی گێڕا لە پەرەپێدانی نەزۆککردنی ئافرەت، ئەگەرچیش تارادەیەك ناناسراوە بەڵام لە زۆر ناودارانی جیهان بەکاریگەرترە.

دەرمانی دەنکەنەزێن[1] دوو خاڵی گرنگی تیادا بەدی دەکرێت : -

یەکەم : - لەجیهاندا زۆر بایەخ دەدەن بەمەترسی فرازیٚی مەردوم، گرنگی ئەم دەنکانەیش زۆر ئاشکرایە کە بۆ گرتنەوەی زاوزیٚ کردنە.

دووەم : - ئەم دەنکانە زۆر بەکاریگەرن لە گۆڕینی چەنجاکردنی زایندەکاری[2]. ئەوەی کە دەزانرێت ئێستا ئەوەیە کە شۆڕشێکی

گەورەی گێڕا لەم ماوەی پانزە ساڵەدا لە ئەمەریکا. بێگومان چەند هۆیەکی ئابووری‌ی‌و سیاسی‌ی و کۆمەلآیەتی‌ی بوونە ڕێخۆشکەرێك بۆ ئەم شۆڕشە. بەلآم تاکە کارایەکی کاریگەر لەم بوارەدا وەدەرکەوتنی ئەم دەنکە دەرمانە بوو. جاران زگ‌پڕبوون ترس‌و کۆسپێکی سەرەکی بوون لای ئافرەت پێش شووکردن و هەتاوەکو کاتی شووکردنیش، بەلآم لەپڕێکا دەرفەتێك ڕەخسێنرا بۆ ئافرەتان کە بەبێ‌ترس لەزگ‌پڕبوون نزیك‌ببنەوە لەمێرد، بێگومان گۆڕانی ئەم باروپێڵەیش[٣] بووە گۆڕان لە هەڵوێست و ڕەفتاریاندا.

زۆر کەس هاوبەشی‌کرد لەپەرەپێدانی ئەم دەنکەنەزێنە. بۆماوەیەك ئەم کێشەیە لە ڕەبازو لێکۆڵینەوەدابوو، گرانیەکەیشی لە پەیداکردنی ئەو دەرمانانەبوو بۆ گەلاڵە کردنی ئەم‌کارە.

ساڵی ١٩٣٧ ز دووزانا سەرنجیان‌دا کە ئەگەر مادەی پرۆجسترۆن Progestrone (کە یەکێکە لە هۆرمۆنەکانی مێینە) بدرێت لە تەبایەکی مێینەی ئەزمونی ئەوا پەکی هێلکەدانی دەخات. ئەم دۆزینەوەیە ئەوەندە سەرنجی زانایانی ڕانەکێشا کە بیخەنەکار بۆ سنوورداندنی وەچە[١].

پەرەپێدانی ئەم دەنکەنەزێنە لە ساڵەکانی دوای ١٩٥٠ زوە دەستی‌پێکرد کاتێ کە زیندەزانی ئەمەریکایی گریگۆری پینکەس لەم بوارەدا کاری‌دەکرد. ئەوەی کە زیاتر هانی (پینکەس)ی‌دا و خستیە سەر ئەم پرۆژەیە (خاتو مارگریت سانگەر) بوو کە ئافرەتێکی سەلارو ناسراوبوو لەکاروباری خێزانداریدا. زاناکان لەپێش پینکەس گەیشتبوونە ئەوەی کە بەکارهێنانی پرۆجسترۆن بە دەنك لە دەمەوە

وەربگیرێت باشترە نەوەك بەكوتان لەژێر پێستەوە (هەروەك لە تەباثەزمونیەكاندا تاقیكرایەوە)، جا یەكێ لەو زانایانە دووكۆسپی هاتە بەردەم لە بەكارهێنانیدا .

یەكەم: دواخستنی هێلاندن (Ovulation) هەمیشەیی نابێت بەڵكو هەر تەنها نزیكەی ٨٠٪ی كات دەبات .

دووەم : ژەمێكی (Dose) زۆر لەو دەرمانە پێویستە... بۆ ئەوەی كاربكاتە سەردواخستنی (چروساندنی) هێلاندن هەتاوەكو بۆ رێژەی ٨٥٪ی كاتیش بێت .

لێرەدا پینكەس بەهەموو تواناو چالاكییەكەوە خۆی تەرخان كرد بۆ ئەم كارە، بروای تەواوی هەبوو بەخۆی كە رێگەی راستی تەواو گرتووە و هیچ لەو بیرەدا نەبوو كە رۆژێ لە رۆژان شكست دەهێنێت. واچووبووە مێشكیەوە كە دەبێت مادەیەكی‌تر هەبێت جگە لە پرۆجسترۆن هەمان كارلێكردنی هەبێت بەلام كاریگەری كەمتر بێت لە پرۆجسترۆن. بۆ ئەم مەبەستە كۆمەڵێك لە زانستگەرانی پێكهێنا بۆ یارمەتی‌دانی تا لە كۆتاییدا رێیان بۆخۆش‌بوو و گەیشتنە دۆزینەوەی دوو جۆر هۆرمۆن كە هەریەكەیان تەواوكەری ئەوی‌ترە .

لە نیسانی ١٩٥٦ زدا بەسەرۆكاری خاتو دكتۆر (ئیدریس رایس رای) كەوتنە تاقیگەرییەوە. لە ماوەی ٩ مانگرا تاقیكردنەوەكانیان دەریخست كە ئەو دەنكەنەزێنەی كە لەدەمەوە وەردەگیرێت زۆر سەركەوتووەو ئەنجامێكی باشیش دەدات، بەلام هەر لەگەڵ ئەوەیشدا لەتاقیكردنەوەیەكی هەمیشەیی‌و بێ‌ووچاندا بوون بۆ ماوەی سێ‌سالێ تا لە ساڵی ١٩٦٠ زدا میری رێگەیدا كە بكەوێتە بازارەوە .

ئەم كارە مەزنەی كە لەسەری دواین ئەوەمان بۆ ئاشكرا دەكات

که هەر پینکەس نەبوو بەتەنها لەدۆزینەوەی ئەم دەرمانە بەڵکو زۆر لە زانایانو کارزانانو کیمیاگەران رێیان بۆ خۆش کرد جگە لەو کۆمەڵەی کە لەگەڵیادابوون و یارمەتیان دەدا .

گریگۆری پینکەس ساڵی ۱۹۰۳ز لەشاری (وودباین)ی سەر بە نیوجەرسی ئەمەریکا لەدایك‌بووە. دایکو باوکی هەردووکیان جولەکەی رووسیابوون، ساڵی ۱۹۲۷ز پلەی دکتۆرای لەزانکۆی هارڤارد وەرگرت، پاشان کەوتەکارکردن لەزۆر دەزگازانستەکاندا.

پینکەس... نزیکەی ۲۵۰ نامەی زانستی هەیە سەرەرای ئەوەیش کە پەراوێکی هەیە بەناوی (زاڵبوون بەسەر پیتێندا). لەژیانیدا چەندین ئافەرین و خەڵاتی زانستی پی‌بەخشرا. بەلام خەڵاتی نۆبلی پی‌نەدرا.

هەرچەندە زۆر لەزانایان ئاگایان لەمردنی نەبوو (ساڵی ۱۹٦۷ز) بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا دادەنرێت بە ئەندازیارێکی سەرەکی لەیەکێ لەو دۆزینەوە دیارانەی کە کاری کردۆتە سەر مێژووی رەگەزی مەردوم .

---

(۱) دەنکەنەزێن : حەبی زگ پرنەبوون .

(۲) زابندەکاریی : عملیة التناسل .

(۳) پێل : زروف .

(۱) سنووراندنی وەچە : تحدید نسل .



# سووین تی..

٥٤١ ز - ٦٠٤ ز

Sui Wen Ti

شاشانی چین سو-وین-تی دۆخێکی بالآو سەرکەوتوانەی گێڕا لە یەکگرتنەوەی چیندا پاش ئەوەی کە جارێکی‌تر دووچاری پەرت‌و بلآوی‌بوو بۆ ماوەی سەدان سالێك .

ئەم یەکانگیرە سیاسییەی کە پێکهێنراو چەندین سەدەیەکیش مایەوە دەگەڕێتەوە بۆ زرنگی‌و هێنانەدی کارەمەزنەکانی شاشان کە چینی کردە یەکێ لەو وولآتە بەهێزانەی جیهان ئەو وولآتەی کە دانیشتوانی نزیکەی ١/٥ی دانیشتوانی جیهانە. لەو سەردەمەدا هاوارو نالّەیان بە دەست جەنگ‌و هەراوو ئاژاوەوە کەمتربوو

گەربەراووردبکرێت. لەگەڵ دانیشتوانی ئەوروپاو خاوەرمیانەو زوربەی شوێنانی تری جیهان .

ئەو شاشانەی کە ناسراوبوو بە شی‌تونگ‌تی لەسەدەی سێهەمی پ‌زدا توانی چین بکات بەیەك بەلاّم هەر بەمردنی ئیتر بنەماڵەکەیان تەفروتوونابوو. پاشان بنەماڵەی (هان) لە ٢٠٦ پ‌ز – ٢٢٠ز دەسەلاّتیان گرتەخۆ، بەرماندنی ئەم بنەماڵەیش چین ئیتر بە تەواوی کەوتە بارێکی ناهەموارو پەشێوییەوە بۆ دەمێکی دوورو درێژ، هەر لەو دەمەیشدا ئەوروپا بەبارێکی ناهەموارو ئاژاوەدا دەرۆیشت لە دوای رماندنی ئیمپراتۆرێتی رۆمان کەپێ‌ی دەوترا چەرخی تاریکی .

ئیمپراتۆر سو – وین – تی سالی ٥٤١ز لەبنەماڵەیەکی بەیاراو بەهێزدا لەباکووری چین چاوی هەلێناوە. لەبەرئەوەی کە چوست‌و چالاکی لێ بەدی‌دەکرا هەر بەخێرایی لەکاروفەرمانی میریدا بەرزبووەوەو بووە باوەرپێکراوی بنەماڵەی (شو) لە باکووری چین کە هێشتا لەدەسەلاّتدا مابوون .

ئەو دەمەی کە یارمەتی‌و هەمرایی ئیمپراتۆری دەکرد لەپتەوکردنی دەسەلاّتی لە باکووری چیندا ئەوەندەی‌تر چووە دلّی ئیمپراتۆرەوە تاکو گەیشتە ئەوەی لە سالی ٥٧٣ زدا کچەکەی شوبکات بە شازادە. لە دوای پێنج سال ئیمپراتۆر مردو کوردکەی بووە جێ‌نشینی. شاشانی نوێ لەبەر تێکچوون‌و پێ‌دەسەلاّتی نەیتوانی کاروو باری وولاّت ببات بەرێوە لەبەرئەوە ناکۆکی کەوتە نێوانەوەو لە ئەنجامدا بەرەی سو وین تی توانییان زالّ‌بن‌و تاجی شاشانی زەوت‌بکەن .

له ساڵی ٥٨١ زدا سو وین تی تاجی شاشانی نوی‌ی کرده‌سه‌ر. هه‌ر به باکووری چینه‌وه نه‌وه‌ستا به‌ڵکو مری له‌باشوریش خۆشکرد، له ٥٨٨ زدا هێرشێکی به‌رپێکرد به‌ره‌و باشوور. له‌ساڵی ٥٨٩ زدا بووه شاشانی سه‌رانسه‌ری چین.

پاش ئه‌وه‌ی کاروباری ته‌ختی خۆشکردو پایته‌ختێکی نوی‌ی بۆ خۆی دروستکرد، ده‌ستی‌کرد به‌چه‌ند خاسکارییه‌ك وه‌ك درروستکردنی جۆگه‌یه‌کی گه‌وره بۆ به‌یه‌کگه‌یاندنی دوو روباری گه‌وره‌ی چین که بریتی‌بوون له روباری (هوان‌هو) له باکوورو (و یانگ تسی) له ناوه‌ڕاستی ووڵات، دروست‌کردنی ئه‌م جۆگه گه‌وره‌یه له‌سه‌رده‌می فه‌رمانڕانی کوره‌که‌یدا کۆتایی هات. ئه‌م کاره‌ی ئه‌وه‌نده‌ی تر یه‌کگرتنی باکوورو باشووری له‌یه‌کتر نزیك‌کرده‌وه‌و به‌هێزکرد.

مه‌زنترین خاسکاری‌ی تری دانانی رژێمێك‌بوو بۆهه‌ڵبژاردن‌و ده‌ستنیشان‌کردنی فه‌رمانبه‌رانی میری به‌ری‌ی تاقیکردنه‌وه. ئه‌م رژێمه‌ی که بۆ سه‌دان ساڵیش دوای خۆی په‌یره‌وی له‌سه‌رده‌کرا له‌چینیدا کارایه‌ك‌بوو بۆ ده‌رکه‌وتنی کۆمه‌ڵێك له‌فه‌رمانبه‌ران‌و کارگێڕانی خاوه‌ن به‌هره‌ی به‌رز له‌چینه جیاوازه‌کانی گه‌لدا.

سو به‌زه‌بری هێز و توانا یاسای پارێزی‌ی چه‌سپاندو هێنایه کایه‌وه، ئه‌م یاسایه میری هه‌رێمه‌کانی به‌جۆرێکی وابه‌سته‌وه‌که نابێت فه‌رمانڕانی ئه‌و ناوچانه‌و هه‌رێمانه بکه‌ن که‌تیایدا له‌دایك‌بوون. ئه‌م یاسایه‌یشی بۆیه ده‌رکرد و گشتاندی تاکو ئه‌و میرانه له‌هه‌رێمنشینه‌کاندا نه‌توانن خزم و که‌سان له‌خۆیان نزیك بکه‌نه‌وه، له‌وه‌ندێك پێکه‌وه‌بنێن و ببنه مه‌ترسی بۆ ته‌ختی شاشانی.

سو شاشانێکی پێشەنگ و نەبەرد بوو، زۆریش بێداربوو. خۆی لەدەست بلاوی دووردەگرت لەکاروباری دەولەت میرانەی لەسەر هەژارو پەککەوتان سووككرد، سیاسەی دەرەوەی بەگشتی سەرکەوتووبوو. وادەردەکەوێت کە ژێر دەستەی ژنەکەی بوویێت بە رادەیەك کە هیچ کارێکی بەبێ ئاگای ژنەکەی بەئەنجام نەدەدا بەتایبەتی لەبەڕێوەبردنی وولات‌و پتەرکردنی دەسەلاتی‌دا .

سو لە سالی ٦٠٤ زدا لە تەمەنی ٦٣ سالیدا کۆچی دوایی‌کرد. دەلێن گوایە لەداخی کارە نالەبارەکانی کوری دووەمی دواسەری‌نایەوە، ئەو کوڕەی کە زۆر نازی درابوێ لای دایکی‌و لەدواییدا بووە جێنشینی .

O



# مانی...

٢١٦ ز - ٢٧٦ ز

Mani

ڕێبازگەی مانی ی... ئەو بڕوا ئایینیە پووکاوەیە کە لە سەردەمی سەدەی سێهەمدا سەری هەڵداو بۆ زیاتر لە ١٠٠٠ ساڵێکیش کاریگەربووە لە نێومەردومدا، هەر لە ناوچەکانی خاوەرمیانەو ئۆقیانوسی ئەتڵەسییەوە تاکو ئۆقیانوسی هێمن .

ئەو ڕێبازگە دامەزراوەی مانی ی بریتی یە لە چەند ئایینوبڕوایەکی سەیرو لە ڕێبازگەی خۆی کۆنتر، باوەڕی تەواوی بەپێغەمبەرێتی

زاردەشت و بوزا و عیسا هەبوو بەلاَم لەگەلّ ئەوەیشدا ڕێبازگەکەی ئەو ڕەفتارو نەریتانەی‌کە لە بوزایی‌و دیاندا هەن هەندێکیان لەمانی‌یشدا بەدی‌دەکرێن، بەلاَم زاردەشتی‌ی زیاتر تیادا بەدی‌دەکرێت لەبە ئەوەی کە ئەمیش (واتەمانی‌ی) لەسەر بنەڕەتی باوەڕی دووێن دامەزراوە .

گەر بەبیروڕای مانی‌ی بێت پساد مەلّبەندی کێشەو ستیزەیە لەنێوان دوو هێزاندا، یەکێکیان هێزی شەرە کە دەیلکێنێت بەمادە و تاریکاییەوە، ئەوتریان هێزی چاکەو خۆشی‌یەکە دەیلکێنێت بەڕۆشنایی‌و یەزدەوە. لەم ڕووەوە لەوە دەکات بچێتەوە سەر باوەڕی دیانی کە خواو شەیتانە ، جا بە ڕێبازگەی مانی‌ی بێت ئەم دوو هێزە هاوسانن‌و هەرگیز نایشبێتە کێشەو کۆسپێکی ئەوتۆ لە فەلسەفەی مانی‌ی‌دا کەچی ئەم کێشەیە زۆر بەئالّۆزی‌و سەختی لای فەیلەسوفە دیانەکان‌و جووەکاندا بەدی دەکرێت .

مانییەکان بڕوایان وایە کە دورکەوتنەوە لەباکاری کارێکی ڕەوایە گەر بۆمەبەستی نەوەخستنەوەیش بێت، هەروەها گۆشت خواردن‌و مەی خواردنەوە لایان نارەوایە .

مانی ... سالّی ۲۱٦ز لە ناوچەی میاندواو لەدایك‌بووە کە ئەوسەردەمە لەژێر دەسەلاَتی ئیمپراتۆریتی پارس‌دا بوو، لە نێو بنەمالّەیەکی دیاندا پەروەردەکراوە. دەلّێن گوایە لەتەمەنی ۱۲ سالّیدا

خەودەبینێ بەدانانی ئایینێکی نوێوە، ئەوەبوو لە تەمەنی ۲۱ سالیدا کەوتە بڵاوکردنەوەی ڕێبازگەکەی بەنێومەردومدا بەناوی هاتنی ئایینی نوێ. بەرەو هیندی باکوور ڕێی گرتەبەر پاش ئەوەی کەس باوەڕی نەهێنا بە ڕێبازگەکەی لە ناوچەی مياندواودا .

لە ژیانیڕا چەند نووسراوێکی بەزمانی پارسی و سریانی بڵاوکردەوە، ئەم نووسراوانەی بوونە پەیڕەو و بەرنامەیەك بۆ ڕێبازگەی مانی ی .

---

مانی ی: ڕێبازگەی سەرمەدی.



# ڤاسكۆ داگاما...

١٤٦٠ز - ١٥٢٤ ز

Vasco Da Gama

ڤاسكۆ داگاما زەویدۆزی پۆرتوگاڵی... ئەو پیاوە بوو کە ڕێگەی دەریایی ڕاستەوخۆی دۆزییەوە لە ئەورووپاوە بە ئەفەریقادا بۆ هیند.

پۆرتوگاڵیەکان هەر لە سەردەمی هێنری‌شازادی سەروانەوە (١٣٩٤ز - ١٤٦٠ز) بۆ ڕێگەیەکی وەها دەگەڕان.

لە ساڵی ١٤٨٨ز دا دەستەیەکی پۆرتوگاڵی بە سەرکاری (پارتۆلیمیۆ دیاز) خۆیان گەیاندە (هەواری خۆش ئومێد[1] The Cape of good hope) کە دەکەوێتە باشووری ئەفەریقا. ئەم دەستەیە لەوێ سوڕانەوە و پاشان گەڕانەوە پۆرتوگاڵ. پاشای پۆرتوگاڵ لەم هەڵمەتەدا بۆی

دەرکەوت کە ئەو داخواز و نیازەی (گەیشتن بۆ وولاتی هیند) لە نزیك بووندایە، پاش ماوەیەك پاشا فەرمانیدا بە تەدارەکی باوربارگەر ڕێکخستن بەرەو هیند پاش ئەوەی توانیان زاڵ بن بەسەر هەندێك گیروگرفت و کۆسپدا، ئینجا ڤاسکۆ داگامای دەسنیشان کرد و کردی بە سەروانی ئەو گەشتە دەریاییە. ئەم پیاوە جەربەزەیەکە کابرایەکی ئەرستۆکراتی خۆسەربوو لە شاری (سانیس)ی پۆرتوگاڵی لە ساڵی ١٤٦٠ زدا لەدایك بووە.

لە ٨ی تەمووزی ١٤٩٧زادا بە چوار کەشتیو ١٧٠ کەسەوە کەوتەرێ، لە ڕێگادا عەرەبێ زانێکیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرت، یەکەم ووچانیان لە ڕۆخی لەنـد ی (ڤێرد)دا بوو، پاشان لەباتی ئەوەی بەدرێژایی کەنارەکانی ئەفەریقادا برۆن (هەروەك دیاز)... ڕێرەوی خۆی یەکسەر گۆڕیوبەرەو باشور بەپانتایی باشوری ئۆقیانوسی ئەتڵەسیدا ملی نا، ئینجا بایدایەوە بۆ بەرەو ڕۆژهەڵات تاگەیشتە هەواری خۆش ئومێد. هەر چەندە شارەزایی و ئازایەتی دەیویست بۆ هەستان بەم کارە مەترسییە بەڵام ئەو ڕێگەیەی پێ باشتربوو چونکە خێراترو بێ پێچ و پەنابوو.

کەشتیەکانی ڤاسکۆ نزیکەی ٩٣ ڕۆژ ووشکانیان لێوە دیار نەما، ئەم ماوەیەیش دەکاتە دوو ئەوەندەو نیوی گەشتەکەی کریستۆفر کۆلۆمبس.

ڤاسکۆ لە ٢٢ی تشرینی یەکەمدا بە دەوری هەواردا سوڕایەوەو

ئینجا یەکسەر ڕووی‌کردە ڕۆخی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقا ، لە ڕێگەیدا تووشی بوو بە ڕێنمایەکی هیندییەوە و بە ٢٣ ڕۆژ گەیاندیە وولاتی هیند .

لە ٢٠ی ئایاری ١٤٩٨زدا ، لەپاش ١٠ مانگ بەسەر گەشتەکەیدا پێی نایە شاری کالیکوت کە بەناوبانگترین مەڵبەندی بازرگانی بوو و دەکەوێتە باشووری هیندەوە ، (زامۆرین)یش کە کابرایەکی هیندۆس‌باوەڕ بووو فەرمانرانی ئەو شارەی دەکرد زۆر بەگەرمییەوە پێشوازییانی کرد بەڵام کاتی دەسودیاری ڤاسکۆی بینی کە پێش‌کەشی کرا .. زۆر نائومید بوو لێیان چونکە چاوی لە دیاری گران‌بەها بوو ، جاکە بینی دیارییەکانی زۆر هەرزان‌و هیچن ئەوەندە گوێی نەدانێ جگە لەوەیش کە بازرگانیی ئەو ڕیگەیە بەدەست کارمەندە موسولمانەکانەوە بوو حەزیان بەهاتن‌و هاوکاری ڤاسکۆیان نەدەکرد ، ئیتر ڤاسکۆیش دەستەوەسان مایەوەو نەیتوانی هیچ ڕێکەوتنێکی بازرگانیی لەگەڵ (زامۆرین)دا سازبکات ، بەڵام لەگەرانەوەیدا باروبارگەی توونی‌و بەهارات و چەند کەسێکی هیندیشی لەگەل خۆیدا هێنایەوە تاکو سەرکەوتنی ئەو گەشتەی بۆ پاشا بسەلمێنێت .

گەشتی گەڕانەوەیان سەلماندی کە زۆر سەخت‌تربوو لەچوونیان بۆ هیند ئەویش بەوەی کە دەریای عەرەبییان بە ٣٠ مانگ بڕی . هەر لەوماوەیەیشدا زۆر لەدەریاوانەکان بەنەخۆشی (ئەسکەربوت) Scurvy

مردن ، لە کۆتاییدا تەنها دوو کەشتی گەڕایەوە ، یەکێکیان لە ١٠ی تەموزی ١٤٩٩زدا گەیشتە پۆرتوگاڵ ، ڤاسکۆیش لە ٩ی ئەیلولی ١٤٩٩زدا گەیشتە شاری لەشبوونە ، واتە دوومانگ دوای کەشتی یەکەم .

لەو گەشتەیاندا تەنها ٥٥ دەریاوان گەیشتنەوە پۆرتوگاڵ ئەم ژمارەیەیش نزیکەی ٣ / ١ی ئەو ژمارەیە یەکە لە لەشبوونەوە بەرێکران بەلاَم هەرچۆنێك بێت ڤاسکۆ داگاما بۆ خۆیو بۆ پاشای سەلماند کە ئەو گەشتە دوو ساڵەی سەرکەوتنێکی زۆر باش‌و پیرۆزی بەدەست هێنا .

---

(١) هەواری خۆش ئومێد : رأس الرجاء الصالح.



# شارلمان....

٧٤٢ز - ٨١٤ز

Charlemagne

ئیمیراتۆر شارلی بزروگ (شارلمان)... پاشای فرنجەو داگیرکەری سەکسۆنیا و دامەزرێنەری رۆمان... یەکێکە لەو فەرمانڕوا پێشەنگانەی کە دەستێکی بالای بوو لەمێژووی ئەوروپادا .

سالی ٧٤٢ز لە ناوچەیەکی نەزانراوا لەدایك بووە . ئەلێن گوایە نزیك شاری (ئاخن) بووە کە لەدواییدا کردیە پایتەختی خۆی .

باوکی ناسراو بوو بە کولە (بیبن) ، باپیری کە ناوی (شارل مارتێل) بوو و سەرکردەی فرەنجەی مەزن بوو، لە سالی ٧٣٢زدا توانی بەسەر عەرەبەکاندا زال بێت لە کارزاری (بواتیە)دا .

کوڵە (بێبن)ی باوکی بنەماڵەیەکی شاهانەی نوێی بەناوی (کارۆلینگ)ەوە دامەزراند ، جا کاتێك کە مرد ساڵی ٧٦٨زدا فرەنجە بەشکرایەوە لەنێوان (شارلێ) و (کارلمان)ی برایدا. لە خۆشبەختی شارلێ و یەکخستنەوە فرەنجەدا کارلمانی برای لەساڵی ٧٧١زدا کتوپڕ مرد. مردنی کارلمان ڕێی بۆ شارلمان خۆشکرد ، ئەوەبوو لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا بووە تا کە فەرمانڕەوای سەرانسەر فرەنجە، هەر لەو سەردەمەیشدا بە بەهێزترین دەوڵەتی ئەوروپایی ڕۆژاوایی دەژمێررا .

ئەو سەردەمە فرەنجە لەو وڵاتانە پێکهاتبوو کە ئێستا فەرەنساو بەلجیکاو سویسرە و هێندێ لە ناوچەی هۆڵەندە و ئەڵەمانیای پێدەوترێت. شارلمان کە هاتە سەرتەختی پاشایی هەوڵی ئەدا دەسەڵاتی خۆی فراوانتر بکات ودەستی درێژتر بکاتە سەر وڵاتانی‌تر ، لەو ماوەیەدا ژنەکەی کارلمانی برای تۆراو پەنای بردە شانشینی لۆمباردیا ، شارلمانیش ژنە لۆمباردییەکەی خۆی دەرکرد . ئەم ناکۆکییەی کردە بیانوو، سوپایەکی بەرەو لۆمباردیا وباکووری ئیتالیا بەڕێ کرد . شانشینی لۆمباردیا نەیتوانی بەرامبەر ئەو سوپا بەهێزەی شارلمان خۆی ڕابگرێت. لەساڵی ٧٧٤ز دا لۆمباردیای ڕوخاند و باکووری ئیتالیایشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە ژن و منالی براکەیشی بە دیل گرت و لە دوای ئەوەوە ئیتر کەس چاوی پێنەکەوتنەوە .

ئەو کارە گرنگ و سەختانەی کە شارلمان پێی‌هەستا شکاندنی سەکسۆنەکان بوو لەباکووری ئەڵەمانیادا. بە نزیکەی هەژدە هەڵمەت

توانی سەکسۆنیا تێکشکێنێت . لەو جەنگەدا بڕوای ئایینی کارێکی زۆر باڵای گێڕا ، جا سەکسۆنەکان چونکە بتپەرست بوون شارلمان دەیویست بەخوایشت بێت یان بە تۆبزی ڕێبازگەی کاثۆلیکی یان تیادا بڵاو بکاتەوە ، فەرمانیشی دا کەئەگەر هەر کەسێك نەبێت بە دیانی بکوژرێت .

لە باشووری ئەڵەمانیا و باشووری ڕۆژاوایی فەرەنسایشدا کەوتە جەنگ و توانی ئەو ناوچانە داگیربکات ، دوا ناوچەش کە هێرشی بردەسەرو داگیری کرد ناوچەی (ئافار) بوو کەبریتی بوو لە گەلێکی ئاسیایی و نزیکیش بوون بە ڕەگەزی (هون) ، زەوییەکی بەجگار فراوانیان بەدەستەوە بوو کەئێستا بە هەنگاریا ویۆگۆسلاڤیادەناسرێت. شارلمان هێرشێکی بردە سەریان و توانی تێکیان شکێنێت و ئەو زەوییە فراوانانەیش بخاتە ژێر دەسەڵاتیەوە .

پاش ئەو سەرکەوتنانەی کە بەدەستی هێنا چاوی بڕییە ئەسپانیا بەنیازی ئەوەی سەرانسەری ئەوروپای ڕۆژاوا یەك بخات ، لەبەرئەوە هێرشێکی بردەسەر ئەسپانیا بەڵام عەرەبەکان کە لەوێ بوون لێیان هەستان و توانیان نووشوستی بە هێرشەکەی بهێنن .

ئەگەر ئاوڕێك لە باری ژیانی شارلمان بدەینەوە سەیردەکەین کە لە چل وپێنج ساڵی دەسەڵاتیدا هەر بەجەنگ و پەلاماردنەوە خەریك

بووه ، لەو چل و پێنج ساڵەی دەسەلاتەیدا نزیکەی ٥٥ هەڵمەتی بردۆتە سەر وولاتان .

مێژووی عەرەبی ئەوەمان دەخاتە وە یاد کە شارلمان پەیوەندی خۆش بووە لە گەڵ هاروونە رەشیدا لە بەغدا. هەتاوەکو دەگێرنەوە کە گوایە هاروونە رەشید جارێك چەند دیارییەك دەنێرێت بۆ شارلمان ، یەکی لەو دیارییانەی کاتژمێرێك بووە، بەجۆرێکی وەها سەیر دروست‌کرابوو کە هەر کاژێرێك تێپەربایە ئەوەندە جار زەنگی لێدەدوا و ئەوەندە پەیکەری سەربازیش لەکات ژمێرەکەوە سەری دەهێنایە دەرەوە ئەم کات‌ژمێرە زۆر جیّی سەیرو سەرسوورمان بوو لای شارلمان بەرادەیەکی وا هەر کە کات‌ژمێرەکە بزەنگایەو سەربازەکان سەریان بهێنایەتە دەرەوە دەسبەجیّ هەرچی یاوەران ودەسوپێوەندی شارلمان بوو دەترسان ورایان دەکرد لەوایاندەزانی کە ئەمە کارێکی ئەفسونییە .



# کۆرشی مەزن...

٥٩٠ پ‌ز - ٥٢٩ پ‌ز

Cyrus The Great

کۆرش دامەزرێنەری شاشانی پارس... لە سەرەتادا وەك میرێك فەرمانڕانی ناوچەیەکی دەکرد لە باشووری باختەری ئێراندا بەڵام لە دواییدا بەرەبەرە توانی هێزبداتە خۆی و سوپایەك پێکەوە بنێت ئینجا بە چەند هێرشێکی یەك لە دوای یەك توانی سێ ئیمپراتۆریەتی مەزنی ئەو سەردەمە بڕوخێنێت (میدیا ، لیدیا ، بابل) ، بەم سەرکەوتنەی ... زوربەی وولاٌتانی خاوەرمیسانەی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە هەر لەهیندەوە تاکو دەریای ناوەڕاست .

کۆرش سالی ٥٩٠ پ‌ز لەناوچەی بەرسیس (پارسی ئێستا) کە دەکەوێتە باشووری باختەری ئێران لەبنەماڵەیەکی خانەداندا لەدایك

بووه ، ئەو ناوچەیەیش کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریێتی (میدیا)وە .

باستان و باوانی پارس سەرگوزشتەی سەیرو خۆش دەگێڕنەوە لەبارەی لەدایك بوونیەوە ، ئەمەیش تارادەیەك لەداستانە ئەفسونیەکەی یۆنانی (ئۆدیب) دەچێت . دەڵێن گوایە (ئەستیاگۆس) باپیری گۆدشەن خەو دەبینێت بەکورەزاکەیەوە کە ڕۆژێك دێت لەتەختی پاشایی بە تۆبزی دەیهێنێتە خوارەوە . ئەمیش لەترس هاتنەدی ئەو خەوەی فەرمانی‌دا هەر کە لەدایك‌بوو... بکوژرێت ، بەلاَم ئەو کەسەی کە فەرمانەکەی جێبەجیٚ دەکرد بەزەیی بەمنداڵەکەدا هاتەوە ، لەباتی ئەوەی بیکوژیٚ دایەدەست شوانێك و ژنەکەی تاکو گوناهی کوشتنەکە بخاتە گەردنی ئەوان ، ئەوانیش (شوان و ژنەکەی) منداڵەکەیان هەڵگرتەوە و وەك منداڵی خۆیان بەخێو و پەروەردەیان کرد تا گەورەبوو ، لەدواییدا وای لێهات جیٚی بە پاشا لێژکرد و تەخت‌و تاراجی ڕووخاند . ئەم داستانەی کە (هیرۆدۆتۆس)ی مێژووناس بۆمانی دەگێڕێتەوە لەوە دەکات هەڵبەسرابێت چونکە ڕاستی ژیانی کۆرشی بەکەم تارادەیەك زانراوە کە لەنزیك ٥٥٨پ‌ز لەدوای قەمبیزی یەکەمی باوکی بووەتە میری ناوچەی پارس کە سەر بە ئیمپراتۆریێتی میدیا بووە .

نزیکەی ٥٥٣پ‌ز کۆرش لە شاشان هەڵگەڕایەوە و بەرەنگاری‌بوو . پاش جەنگێکی سێساڵە توانی زاڵ‌بێت بەسەر شاشانی‌ی میدیا .

لەبە رئەوەی کە میدیاکان و پارسەکان هەر لەدێرەوە پەیوەندییەکی بەتینیان هەبوە لە ژنگاریاندا چ لەرووی نەژادیانەوە چ لە ڕرووی‌زمانیانەوە ئیتر کۆرش کە هاتە سەر تەختی شاشانی زوربەی ئەو

قانونانەی میدیا کانی هێشتەوە و خستیەگەڕ بۆ کاروباری. میدیاکانیش بەهاتنی کۆرش ئەوەندە نیگەران نەبوون چونکە بەگۆڕینێکی بنەماڵەیان دادەنا زیاتر لەوەی کە بە داگیرکەرێك سەیری بکەن.

کۆرش دیاربوو زۆر ئارەزووی داگیرکردنی هەبوو، یەکەم کار پێی ی هەستا داگیرکردنی زەویەکانی ئیمپراتۆرتیی لیدیابوو کە سەرانسەری ئاسیای بچووکی گرتبووەوە، کریسیۆس شا (قارون) کە پاشای‌بو یەجگار ڕەنگین و بەسامان‌بوو، کۆرش هات و لە ساڵی ٥٤٦زدا توانی بە زەبری هێزو ئاسنینی زالّ بێت بەسەی قاروندا و بە دیلی بگرێت، هەرچیَ زێڕو زیویشی هەبووزەوتی بکات، پاش ئەم هێرشە سەرکەوتووەی ڕوویکردە ناوچەکانی ڕۆژهەلاَت و توانی بەچەند شالأوێك سەرانسەری ڕۆژهەلأتی ئیران بخاتە ژێر دەسەلأتیەوە.

هێشتا تینوێتی دانەمرکابووەوە مری لە ئیمپراتۆرێتی بابلی داروسی ی خۆش‌کرد، جا گشت هێزو توانای خۆی تەرخان کرد بۆ داگیرکردنی ئەم ناوچەیە کە ناوچەیەکی یەجگار بەسامان‌و بەپیت‌و زەنوێر بوو، ئەم ئیمپراتۆریەتە فەرمانڕانی ناوچەکانی میانلواو و سەرانسەری (مانکوری بەپیت)[1] ی دەکرد لە خاوەرمیانەدا جاکاتێك سوپاکانی کۆرش بەرەو مەیدان هاتن تیپە جەنگاوەرەکانی بابل خۆیانیان بۆئامادە نەکردبوو، هۆیەکەیشی ئەوەبوو کە نارەزاو تووڕەبوون لە بەدرەفتاری فەرمانڕەواکانیان و ئەوەندەیش خۆشەویست نەبوون لە نێوگەلانی بابلدا، لەبەر ئەوە ساڵی ٥٣٩پ‌ز کۆرش زۆر بەئاسانی‌و بێکوشتار دەستی کێشایە ناویانەوە. پاش ئەم هێرشانەی ئیتر پاڵی‌دایەوەو دەستی‌کردە پتەوکردن‌و ڕێکخستنی کاروباری ئیمپراتۆریتە نوێ‌کەی، بەلأم لەو ماوەی لەگەلّ یەکێ لەخێلّەکاندا کەوتە کینەبەرابەتی، ئەم

ناكۆكییە پەرەی‌سەند و بووە هۆی كوشتنی لە ساڵی ٥٢٩پ‌ز .

كۆرش پاش مردنی ، كورەكەی قەمبیزی دووەم بووە جێنشینی‌و دەسبەجێش درێژەی بەجەنگدا لەگەڵ ئەوخێڵەدا ، لەكارزارێكدا نزیك بە دەریای خەزەر (ئەو شوێنەی كە باوكی تیادا كوژرا) توانی لاشەكەی باوكی بسەنێتەوەو لە شاری (باسەرگادی) بینێژێت كە پایتەختی كۆنی پارس بوو . كۆرش سەردارێكی چەتۆ و لێهاتوو بوو ، زۆر دادوەرو هێمن بوو لە دەسەڵاتگوزایدا ، بەخشندە بوو لەگەڵ ئایینە ناوخۆییەكان و ئاكار و نەریتە نەتەوییەكاندا ، بەلام لەهێرش‌و شالاوبردنیدا هەروەك سەركردەكانی تری جیهان زۆر بە زەبرو سەرسەخت‌و خوێنسار بووە .

---

(١) مانگورِی بەپیت : هلال الخصیب Cresent fertile

مانگورِ: ماهور: هلال.



# لیۆنارد یۆلەر...

١٧٠٧ز - ١٧٨٣ز

Leonnard Euler

زانای بیرکارو فیزیکی سویسری، مەزنترین زانای بیرکاریو فرەزانترین دانەری فرەبەرهەم لیۆنارد یۆلەر... ئەو زانا مەزنەیە کە رەنگدانەوەی کارەکانیو کارپێکردنی زۆر بە بڵاوی بەدی دەکرێت لەزوربەی بوارەکانی زانستو ئەندازەدا بەدی دەکرێت.

زرنگیو بلیمەتیی لەبیرکاریی و زانستەکاندا گەیشتبووە ئەو رادەیەی کە هیچ ناتوانین دەربارەی بدوێین، تەنها ئەوەنەبێت کە بڵێین ئەوەندە بەرهەمی هەبووە لەتوانای هیچ کەسێکی زیرەکدا تردا نەبووە جگە خۆی نەبێت.. نزیکەی ٣٢ پەڕاوی پڕبەپڕی داناوە کە زۆریان لە

چەندین ڕەشتەو بەند پێکهاتوون، سەدان بڵاوکراوو بابەتی بیرکاریی و زانستی تری هەبووە. جا ئەگەر ئەمانە هەمووی کۆبکرێنەوە خۆی دەداتە نزیکەی ٧٠ بەرگی گەورە، هەر لەم کارە مەزنانەیەوەرا بۆمان دەردەکەوێت کە هەر لەتوانای ئەودابووە ئەو بیرو نووسینانە بهاوێژێتە نێو گشت لایەنەکانی بیرکارییەوە. خۆ ئەو واڵاکارییانەی[1] کە لە زانستی فیزیك‌و بیرکاریدا کردویەتی تارادەیەکی بێ‌سنووریش کاریگەربووە لە کارپیکردندا.

پۆڵەری مەزن بیری سەرەکی خۆی تەرخان کردبووە ئەو قانونە میکانیکە داڕێژراوانەی ئیسحاق نیوتن‌و یەکاڵاکردنەوەیان لە بارە دیاردەکانی فیزیکدا. بۆ نموونە... چەسپاندی قانونی نیوتن بەسەر دۆخی شلەکاندا، توانی گۆڕانکارییەك لەهاوکێشەکانی دینامیکزانیی شلەکاندا بکات، هەروەها هێندێ هاوکێشەی تری توانی دابرێژێت لە بزوتنەوەی تەنە ڕەقەکاندا. جا لەبەرئەوەی هەموو تەنێك ڕەق‌نیە... کەوتە خولیای دارشتنی بیردۆزەی جیری Elasticity و تەنە جیرە لاستیکیەکان Elastic Solid Theory. وە چۆنیەتی تێکچوونی تەنەکان بە سەپاندنی هێزی دەرەکی.

هەروەها بەهرەوەریی‌و بلیمەتی خۆی‌کوتابووە سەر شیکاری کێشەی ستێرناسیی بەشێوەیەکی بیرکارییانە، زۆر بە تایبەتیش ئەو سێ‌تەنەی مەبەست‌بوو کە کێشەی خولانەوە چارەسەر دەکەن بەناوی کێشەی سێ‌تەنەکە Three Bodies problem (خۆر و مانگ و زەوی) لە هاویەکتر ڕاکێشانیان لەنێو خۆیاندا. ئەم کێشە تائێستایش ئاڵۆزە، مەگەر هەر لە سەدەی داهاتوودا واتە لە سەدەی بیستویەکەمدا بتوانرێت پەی بەچارەسەرکردنی بهێنرێت. هەر ئەویش بوو لەنێو

زاناکانی سەدەی هەژدەمدا پیشتوانی لە بیردۆزەی شەپۆلە ڕۆشناییەکان دەکرد، بێگومان سەلمێنرایش کە ئەم دیاردەیە ڕاستەو لەجیٚی خۆیدایەتی .

یۆلەر بەو ئاوەزە بەپێزو بیٚهاوتاییەوە چەندین کێشەی تری لەبیرکارییدا دۆزییەوە، تەنانەت زۆر لە زانایانی بیرکاریی هەر بەهۆی ئەمەوە لەو بوارەدا ناودار بوو وەك زانای فەرەنسایی (لاگرانج) کە بە چەند هاوکێشەیەکی دارێژراوی زۆر لەو گیروگرفتە جۆربەجۆرانەی میکانیکزانیی یەکالاکردەوەو، ئەم هاوکێشانەیش بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی یۆلەردا دۆزرایەوەو ناسرایش بە هاوکێشەکانی یۆلەر – لاگرانج.

یۆلەری بلیمەت زۆر گرنگی دەدا بە هاوکێشەی جیاکاریی Differential equation، هاوکێشەی ڕەساکاری Integral equation و ڕەچە ناکۆتاییەکان Infinite Series و ژمارە ئاڵۆزەکانComplex numbers. یەکی لەو هاوکێشانەی یۆلەر لەمەدا دەردەکەوێت :

$$bSinx + bCosx = e^{bx}$$

ژمارەی نابیێر (e) ≃ 2.7

واتە : ب هاس + ب هتاس = ی^ب‌س

هەروەها گرنگی‌ئەدا بە پەیوەندی لەنێوان ڕەدووەکان squences، زانستی سێگوشەکاریی Trigonometry. ژمارەئاڵۆزەکان دەتوانرێت بخرێتەکار بۆپەیداکردنی ژمارە نەگەتیفەکان (لۆگاریتم Logarithm) کە بەناوبانگترین و گشتاوترین هاوکێشەیەکی دارێژراوە لە بیرکارییدا. هەروەها پەراوێکی زۆر بەسوودی بۆخوێندگا دانا لە شیەندازەدا

Analytical geometey و چەندین بیردۆزەی جیائەندازە diff. geometry و سادەندازە Simple geometry، جگە لەمانەیش بایەخی دەدا بەزانستی تۆپۆگرافی Topography کە ئەمیش بابەتێکی گرنگە لە زانستی بیرکارییدا... لەسەر دیاریکردنی چێگەی شتێك دەدوێت سەبارەت بەشتەکانی ترەوە (نەك بە دووریی و قەوارە)، ئەم زانستە گرنگی و بایەخی لەسەدەی بیستەمدا وەدەرکەوت.

یەکی لەو شاکارە مەزنانەی تری، بەکارهێنانی هەندێك هێمای بیرکاریی بوو وەك هێمای ( π پاي) کە ڕێژەیەك دەنوێنێت لە نێوان چێوەی بازنەو تیرەکەیدا کە پیی دەووترێت (ڕێژەی نەگۆڕ – ٧ / ٢)).

زادگای یۆلەر وولاتی سویسرەیە، لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا واتە ساڵی ١٧٢٠ز لە زانکۆی (پاڵ) وەرگیراوە، بەرلەوە خووی دابووە خوێندنی لاهوتزانیی Theology بەڵام بەدەمیەوە خولیای دایە بیرکاریی، هەر لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا پلەی ماجستێری لەبیرکارییدا وەگرت. لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا شابانۆی ڕوسیا (کاترینی یەکەم) داوای لێکرد کاربکات لە ئاکادیمیای زانستەکان لە پترۆسپۆرگ. لەپاش دەمێك چاوێکی کوێربوو بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هەر بێووچانبوو لەبڵاوکردنەوەی چەندین ووتارو نامەی زانستی بەسوود.

لە ساڵی ١٧٤١ زدا فرێدرێکی گەورە پاشای پروسیا هەموو داخوازییەکی بۆ خۆشکرد بچێتە بەرلینو لە ئاکادیمیای زانستەکان کاربکات، لەویێ نزیکەی ٢٥ ساڵ مایەوە بەڵام لەدوایدا هەر گەڕایەوە بۆ ڕووسیا، لەویێ ئیتر بە یەجگاری کوێربوو بەڵام هەر کۆڵی نەئەداو وازی لەکارکردن نەدەهێنا.

پۆلەر بەراستی توانایەکی یەجگار زۆر فراوانی هەبووە لە زانستی بیرکارییدا. تەنانەت تا دواسالآنی ژیانیشی (سالّی ۱۷۸۳ز) لەشاری پترۆسپۆرگ هەر خەریکی زانستگەری و بلاوکردنەوەو نووسینبووە لە زانستی بیرکاری بالّادا.

پۆلەر لە ژیانیدا دووجار ژنی هێناوە، ۱۳ منداڵی لێیانبووە، هەشتیان هەر بە منداڵی مردن.

---

(۱) والآکاری : ئیبداع.

○



# نیکۆلای میکاڤیللی

١٤٦٩ز - ١٥٢٧ز

Niccolo Machiavella

فەیلەسوفی سیاسی ئیتالیایی بەدناو نیکۆلۆ میکاڤیللی... ئامۆژگاری بۆ دەسەڵاتدار ئەوەیە کە ئەگەر بیەوێت بمێنێتەوەو دەسەڵاتی خۆی داکوتێ.. دەبێت بکەوێتە فێڵ‌وتەڵکە، درۆرو دەلەسەوکاری نارەوا... لە تەکیایشدا هێزێکی بێ‌بەزییانەو بێ‌دلۆڤانە بەکاربهێنێت. گەلێك لەپەراوێزنوسەرانی ڕای میکاڤیللی هاتنەپێش. هەبوو لێی بێزاربوو بەقێزو بێزەوە وەری‌دەگرت هەیش‌بوو بەباڵایدا دەیخوێند چونکە دەیان‌ووت مەردێکی ڕیالیست‌و دنیا دیدەو بەتەجروبەیە، وێراویەتی ژینباری جیهان وەکو خۆی بخاتە ڕوو.

میکاڤیللی یەکێکە لەو کەڵەنووسەرەکەمانەی کە زۆر لەکارنامەکانی کۆڵراوەتەوە لەلایەن فەیلەسوفـو سیاسییەکانەوە.

میکاڤیللی سالی ١٤٦٩ز لە شاری (فلۆڕەنسا)ی ئیتالیا لەدایك‌بووە. باوکی پارێزەربووە لەنبەماڵەیەکی وەجاخزایە بووە هەرچەندە زۆر بەدەرامەتیش نەبوون .

ئەو سەردەمەی ئیتالیا کە میکاڤیللی تیادا دەژیا (لە لوتکەی چەرخی ڕاپەڕیندابوو) دابەشکرابوو بە چەندین میرنشینی بچوك بچوکەوە بە پێچەوانەی فەرەنسا و ئەسپانیا و ئنیگلتەرە جا لەبەر ئەوە زۆر سەیر نەبوو کە ئیتالیا لاوازبێت هەرچەندە ئاستی ڕۆشنبیرییان لەو سەردەمەیشدا گەش و پێش‌کەوتووبوو.

یەکی لەو میرنشینانە کە فلۆڕەنسا بوو بنەماڵەی (ئال‌مەدیشی) فەرمانڕانییان دەکرد، ئەوکانەیش میکاڤیللی لە هەرەتی لاویدابوو. لەو میرانەی کە لە بنەماڵەی ئال‌مەدیشیدا هەڵکەوتوبوو (لۆڕەنزۆ)ی مەزن بوو بەڵام چەند ساڵێك فەرمانڕانی کرد و لەساڵی ١٤٩٢ زدا مرد، ئیتر بنەماڵەی ئال‌مەدیشی لەدوای مردنی میرلۆڕەنزۆ لە میرنشینی دەرکران، فلۆڕەنسایش لەساڵی ١٤٩٨ زدا کرا بە ڕژێمی کۆماری و میکاڤیللی کرا بە فەرمانبەرێکی بەرز لەو ڕژێمەدا، ئەوکاتە تەمەنی ٢٩ ساڵ بوو. هەر لەسەر ئەو کارەی مایەوە بۆ ماوەی ١٤ ساڵ. لەو دەمەی‌ڕا لەکاروباری دیپلۆماسیدا کاری‌دەکردو وەکو نوێنەرێکی دیپلۆماسی بەفەرەنسا و ئەڵەمانیا و ئیتالیادا دەگەڕا.

لەساڵی ۱۵۱۲زدا کۆماری فلۆرەنسا رووخاو بنەماڵەی ئال‌مەدیشی دەسەڵاتیان کەوتە دەست (میکاڤیللی) یش لەکاربەدەستی دەرکرا، هەر بەوەیشەوە نەوەستان، لەساڵی دواییدا بە بیانووی پیلانگێران دژبە بنەماڵەی ئال‌مەدیشی سزا درا بەڵام لەپاش ئازاردانێکی زۆر لەهەمان ساڵدا ئازادکرا، لەدواییدا لە ئاوایەك نزیك بە فلۆرەنسا کارنشین‌بوو.

لەو چواردە ساڵەی دواینیدا خۆی خەریك کرد بە نووسینەکانیەوە. شاکاری نووسینەکانی پەڕاوی (میر) بوو کە لە ساڵی ۱۵۱۳ زدا نووسییەوە. لەو پەڕاوانەی تری کە زۆر بایەخی پێ‌دەدرا بریتی‌بوون لە (تەکتیکی جەنگ)، (مێژووی فلۆرەنسا)، هەروەها (لامەندراگۆلا) کە شانۆگەییەکی زۆر خۆش و نایابە، تائێستایش جاروبار لەشانۆکاندا پێش‌کەش دەکرێت.
بەڵام گرنگی‌و ناوبانگی لە پەڕاوی (میر)دا بەدی دەکرێت چونکە لەراستیدا مەزنترین نووسینێکی پرشنگدار و فراوانترین نووسینێکی فەلسەفەییە کە بڵاوبوویێتەوە بەم شێوەیە.

پەڕاوەکە بریتی‌یە لەچەند ئامۆژگارییەك بۆ سەرۆك‌و پێشەوایانی وڵات. ئەو خاڵە سەرەکیانەی لەپەڕاوەکەیدا دیارە ئەوەیە کە ئەگەر هەر دەسەڵاتدارێك ویستی هەمیشە کاری لە برەویدا بێت بایەتە بەهیچ جۆرێك بایەخ بەلایەنی رەوشت نەدات پشت بە هێز و تەڵەکەبازی ببەستێت، دەوڵەت بە چەك و دەزگای تۆقینەر بەهێز بکات، ئەو سوپایەی کە پێوەی دەنازێت دەبێت هەڵبژاردەی گەل

بێت تاکو لێوەی‌را هێزی خۆی داکوتێت.

هەروەها دەڵێت ئەو دەوڵەتەی پشت بە بەکرێ‌گیراوان یان بە چەند تیپێکی سوپایی وڵاتێکی‌تر ببەستێت ئەوا بەلاواز دادەنرێت‌و هەمیشەیش دووچاری مەترسی دەبێت.

میکاڤیللی لەو پەراوەیدا ئامۆژگاری میر دەکات کە دەبێت باوەڕی تەواوی بە هێزی گەل هەبێت‌و بەهەرچۆنێك بێت مسۆگەری بکات چونکە گەر بەپێچەوانەی ئەمەوە ڕەفتار بکات ئەوا هیچ پەنایەکی نابێت‌و کەس نایەت بەهاواریەوە لەڕۆژی تەنگانەدا.

میر دەبێت لەسەرەتای دەسەڵاتیدا هەندێك زەبرو توندی پێ‌بەزەییانە بخاتەگەڕو بەکاری بهێنێت تاکو شوێن‌پێ و دەسەڵاتی خۆی پتەوبکات و ئیتر هەموو ڕۆژێك ناچاری ئەم هەڵمەتە کاسەیە نەبێت. جاروباریش جڵەوی خۆشییان بۆ شل بکات و کەمکەم سوودیان پێ‌بگەیەنێت. بۆ ئەوەی زیاتر سەرکەوتووبێت دەبێت یاوەران و شالیارانی بەتوانا و ملکەچ لەخۆی کۆبکاتەوە و کاری بۆ هەڵسوڕنێن نابێت ماستاوکەریان بێت و مەراییان بکات، لەم ڕووەوە هەندێ ئامۆژگاری میرەکان دەکات کە چۆن بتوانن بەم شێوە خۆیان دەربخەن.

هەربەم ڕێبازە ئامۆژگاری تری میران دەکات کەنابێت لەسەر ئایین و باوەڕی خۆیان سووربن ئەگەر نەگونجێت لە گەڵ بەرژەوەندو دەسەڵاتیاندا.

ڕاستیەکەی ئەو بارە لاوازە سیاسییەی ئیتالیا کاری‌کردبووە سەر میکاڤیللی و هەمیشە لە ئەندێشەی ئەوەدا بوو کە میرێکی بەدەسەڵات‌و یارا بێتەکایەوە و لەهەموو بارەیەکەوە بەهێز بێت بەڕادەیەکی‌وا کە

بتوانێت یەکانگیری بخاتە سەرانسەر ووڵات و هەرچی بێگانەو داگیرکەرە لەووڵات دەربکات.

میکاڤفیللی ژنی هێناوەو شەش منداڵی بووە، لە تەمەنی ٥٨ساڵیدا کۆچی کردووە.

ئەو ڕەخنەو گازندانەی کە ئاراستەی میکاڤیلی دەکرا لە ڕووی ڕەشتەوە ئەوەناگەیێنێ کە بە مەردێکی بێکاریگەرو بێقەڵەمڕەو دابنرێت.

هەرچەندە مۆسۆڵینی یەکێکە لەوانەی بەباڵای میکاڤیللیدا خوێندویەتی بەئاشکرا بەڵام زۆریش لە ناوداران‌و پایەداران پەراوەکەیان خویندۆتەوە دەڵێن گوایە ناپلیۆن، هەتاوەکو هێتلەرو ستالینیش هەمیشە دانەیەك لەو پەراوەی میر لەژرێر سەرینەکەیاندا بووە.

○



# زاردەشت...

٦٢٨ ب ز - ٥٥١ ب ز

Zardaster

دامەزرێنەری ئەو ڕێبازگەیەی کە نزیکەی ٢٥٠٠ساڵی خایاند و بگرە تائێستایش پەیرەوانی هەرماوە .

گوزەرانی ژیانی زاردەشت زۆر زانراونیە ، تەنها ئەوەی کە لە باستانە باوەڕپێکراوەکانەوە مابێتەوە ئەوەیە کە نزیکەی ٦٢٨ پ ز لەدایك بووە لە باکووری ئێران .

لەهەرەتی لاویدا بانگەوازەکەی بڵاوکردەوە بەنێو مەردومدا ، هەرچەندە دژوارو ناحەزانی زۆر بۆیەیدابوو و بەرەنگارییان دەکرد

بەلاّم هیچ کۆڵی نەدا تا لە کۆتاییدا توانی ئامۆژگارییەکانی بگەیەنێتە یەکی لە پاشاکانی ئەو سەردەمە، خۆی زیاتر نزیك کردەوە لەپاشاو دۆستایەتی لەگەڵدا بەتینکرد، پاشایش بەپیّی نەریت و ئاکاری پەنایداو لای خۆی هێشتیەوە .

ڕێبازگەی زاردە شتی بریتیە لە تێکەڵێکی سەیر لە یەکێن[1] و دووێن[2] ، زاردەشت بڕوای وابوو کە خواوەندیك هەیە بەناوی «ئەهورامزدا» هانی ڕاستیو ئاشتی دەدات ، خواوەندێکی تر هەیە ناوی (ئەهریمەنە) هانی دڕەندەیی و جەنگ دەدات جا لە گێتیدا زۆرانو ستێزەیەکی هەمیشەیی هەیە لەنێوان هێزەکانی ئەهۆرامزدا و هێزەکانی ئەهریمەن ، هەرکەسێکیش ئارەزووی خۆیەتی کام هێزیان پەسەند دەکات و ڕەدووی کامیان دەکەوێت ، بەلاّم لە کۆتاییدا ئەنجامی پەروێزیو سەروەری هەر بۆ ئەهورامزدا یە .

زاردە شتییەکان بڕوای تەواویان بەژیانی دوامەرگ هەیە جگە لە ژیانی ئەم جیهانە ، لەڕووی ئاکارو نەرێتیانەوە زۆر گرنگی دەدەن بەڕاستیو ڕاستگۆیی ، ناگونجێن لەگەڵ پارسایىو بێهاوسەری ، هەندێك ئاکاری تایبەتیتریان هەیە کە پەپڕەوی دەکەن وەك ڕێزگرتنی ئاگرو بڵێسەی هەمیشەیی لەپەرستگاکانیاندا . لەگەڵ مردووانیاندا ڕەفتارێکی ئایبەتییان هەیە ... نەدەینێژن وە نەدەیسوتێنن بەڵکو لەسەر لوتکەی چیایەکی زۆر بڵند دایدەنێن تاکو ببنە خۆراکی قەلوداڵ .

ناوەڕۆکی زاردەشتیی... ئەگەرچی پێکهاتووە لەچەند بڕواو ڕیبازێکی دێرینی ئێرانی، کەچی لەوەناکات ئایینێکی بلاّوبوبێتو برەوی هەبووبێت، تەنانەت لەو ناوچانەیش کە زاردەشتی بوونو خرابوونە ژێر دەسەلاّتی کۆرشی شاشان لەناوەراستی سەدەی ٦پ ز.

بەلاّم لەو دووساڵەی دوایینرا زۆر لە پاشایان هاتنە سەر ڕێبازگەی زاردەشتی ی و ئیتر بەهۆی ئەوانەوە تەواو گەشەی سەند. کاتێ کە ئەسکەندەری مەکدونی هاتە ئەم ناوچانە ئیمپراتۆرێتی پارسی ڕووخاند وزاردە شتیش دووچاری نووشوستی و نەگبەتی بوو . بەلاّم بەهاتنەوەی بنەماڵەی ساسانیەکان لەساڵی ٢٢٦ ز - ٦٥١ زدا جارێکی دی بوژایەوەو بووە تاکە ڕێبازگەی باوەڕپێکراوی دەوڵەت .

---

زاردەشت زار + دەشت: واسع النطق.

(١)یەکێن باوەڕ بە تەنهایی کردگار.

(٢)دووێن باوەڕ بە دووانی کردگار.



# مینەس

یان (مینا)

نزیکەی ساڵی ٣١٠٠ پ.ز ژیاوە

Menes

مینەس... بەیەکەمین پاشای یەکەمین بنەچە لە میسردا. دادەنرێت تەنها مەردێك بوو کە توانی سەرانسەری میسر یەکخاتو بنجی پاشایەتی داکوانیٚو کارێکی باڵاو دوور درێژ بگێڕێت لە مێژووی ژیاری مرۆڤدا . دەربارەی مێژووی لەدایكبوونی زۆر ئاشکراو دیارنیە ، تەنها ئەوە نەبێت کە ساڵی ٣١٠٠ پ.ز ژیانی لەگەشە ودەسەڵاتدا بووە .

پێش ئەو سەردەمە میسر لەدوو شانشینی سەربەخۆ پێکهاتبوو ، یەکێکیان کەوتبووە باکووری میسرەوە ناسرابوو بە شانشینی سەروو ئەوی تریان کەوتبووە باشووری میسرەوە ناسرابوو بە شانشینی خواروو

رووباری (نیل) یش کەوتبووە نێوانیانەوە ، جا چونکە رووباری نیل لە چیا بەرزەکانی باشوورەوە را هەڵدەقولاو بەهاژەو شەپۆل خۆی دەکوتایە زۆنکاوە نزمەکانی باکوورەوە ، لەبەرئەوە میسری سەروو پێشکەوتووتربوو لەمیسری خواروو .

مینەس شا لەباشوورەوە هاتو توانی زاڵ بێت بەسەر شانشینی باکوورداو خۆی بکاتە پاشای سەروو و خواروو (وانە باکوور و باشووری میسر). پاش ئەمیش فرعەونەکان کە هاتن ئەو نازناوەیان هەروا هێشتەوە و بۆ هەزاران ساڵی دوایینیش پاراستیان . مینەس شا هەرکە دەسەڵاتی گرتە دەست شاری مەمفیّسی دروستکردو و کردیە پایتەختی ، ئەم شارە شوێنەواری تا ئێستا لە نزیك (قاهیرە) دا هەر ماوە .

بەگوێرەی ئەو ژێدەرە مێژووییانە بێت مینەس شا نزیکەی ٦٢ ساڵ پاشایەتی کردووە. ئەم ژمارەیەیش لەوانەیە هووشە[١] بێت .

میسر پێش سەردەمی مینەس شا ئاستی رۆشنبیری زۆر دواکەوتووتربوو لە رۆشنبیری میانداواو «سۆمەریەکان» بەلاّم بەسایەی ئەمەوە سەرانسەری میسر یەکی گرت. لەسەردەمی ئەمدا دەزگا میرییەکانو کومەلاّیەتیەکان پێکهێنرا و گۆرانکارییەکی تەواوی هێنا بەسەر نووسینی (هیرۆگلیفی)[٢] دا، شێوەو شێوازی خانوبەرەو ساختمانو تەکنیکاری هاتەکایەوەو بەخێرایی پەرەی سەند. وای لە رۆشنبیری میسریکرد کە بە چەند سەدەیەك پاشمردنی هیچی لە رۆشنبیری میاندواو کەمتر نەبێت. لەماوەی دوو هەزار ساڵ را میسر چووە بەرزترین پلەو ئاستی رۆشنبیریو ئابووری لەجیهاندا ... کەم ژیار هەیە لەجیهاندا بگاتە ئەو ئاستە پێشکەوتووە .

فرعەونەکان لە میسردا دەسەڵاتێکی یەجگار بەتواناو فراوانیان هەبوو ، (منیەس شا) یش مەردێکی زۆر کاراو کاریگەربوو بۆ سەر ئەو ڕووداوە مەزنانەی سەردەمی فرعەونەکان . هەرچەندە زانیارییەکی ئەوتو لەبارەیەوە نازانرێت بەڵام لەوبڕوایەداین کە منیەس یەکێکە بووە لەناودارە گرنگەکانی مێژوو .

---

(١)هوروشە : موبالەغە.

(٢) هیرۆگلیفی : نیگاری پیرۆز hieroglyphy.

○



# پەترۆسی مەزن...

**١٦٧٢ ز - ١٧٢٥ ز**

**Peter The great**

پەترۆسی مەزن ، گەورەترین و هەڵکەوتووترین قەیسەری ڕووسیا... بەسیاسەتێکی زۆر لێهاتووانە توانی نەریت و ڕۆشنبیری ڕۆژاوایی بخاتەگەڕ لەنێو گەلو ڕژێمدا، . ڕووسیا بکاتە وڵاتێکی مەزنو پێشکەوتوو و بیگەیەنێتە ئاستی وڵاتە پێشکەوتووەکانی ئەوروپا .

پەترۆس ساڵی ١٦٧٢ ز لە شاری مۆسکۆ لەدایکبووە . تاقانەی باوکی (ئەلەکسیسی قەیسەر) بووە لەژنی دووەمی . بەر لەوەی بگاتە تەمەنی چوار ساڵی باوکی مرد . باوکی لەدوای خۆی ١٣ زارۆڵەی لە ژنی یەکەمی بەجیٚهێشت لەبەرئەوە زۆر سەیر نەبوو کە بەربەرەکانیو

ستێزە پەیدابێت لەناو بنەماڵەکەدا لەسەر تەختی قەیسەری ناکۆکییان گەیشتە ئەوەی کە پەترۆس ناچار بێت رابکات تاکو ژیانی لە مەترسی بپارێزێت ، تا لە دواییدا خوشکەکەی کە لە باوکییەوە بووە جێنشین‌و هاتەسەر تەخت ، پەترۆسیش دەساوێزمایەوەو نەیتوانی ئەو جێیە بە رێگەیەکی ئاشتیانە مسۆگەر بکات و خوشکی لە دەسەڵات بهێنێتە خوارەوە .

لەو سەردەمەدا رووسیا زۆر لەبارێکی بەربادابوو، بەچەند سەدەیەك لە هەموو بارێکی ژیانەوە دواکەوتووتربوو لە ئەوروپای رۆژاوا کەم بوونەوەی شارە کان لەچاو شارە رۆژاوییەکاندا، کۆیلەیەتی ، زۆربوونی زەوی بەپیت و بێ‌شێل کردنی مافی رەوایی رەنجدەران ... تەواو لە کاروانی چەرخی راپەرین‌و خاسکاری‌یە ئاینیەکانی دوورخستبووەوە .

نەزانی پیاوانی ئایینی و کزبوونی چرای وێژەو هونەر... سەرتاپا رووسیای گرتبووەوە، خۆبیرکاریی و زانستەکانی تر هەر ئاوڕی لێ‌نەئەدرایەوە و بەچاوێکی نزمیشەوە سەیردەکران ئەم هەموو هۆیانە .. رووسیای سەرانسەر تاریك کردبوو .

بەپێچەوانەی ئەوروپاوە ... لەلایەك نیوتن لەسەر قانونی کێش‌کردن دەنیوسی، لەلایەك فەلسەفە وێژە دەگەشایەوە . ئا لەم کاتەیشدا رووسیا هێشتا چاوی خەواڵو بوو، سرپی سەدەکانی ناوەندی پێوە دیار بوو .

لە ساڵی ١٦٩٧ ز – ١٦٩٨ زدا پەترۆس گەشت‌و گەڕانێکی

دوورودرێژی سازکرد بەئەورووپای ڕۆژاوادا لەگەڵ ٢٥٠ کەس لەیاوەران و دەسوپێوەندی . لەو گەشتەیدا ناوێکی نهێنی لەخۆینا تاکو کەس نەیناسێتەوەو هەر بەتەواویش بچێتە ناخی ژیانی ئەورووپاوە .

پەترۆس لەو گەشتە خۆی خستە ئامێزی ئەو ژیانەوە .. خۆی کردە شاگرد دارتاشێك لە کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هنیدی – هۆڵەندی، هەر بەم چەشنەیش لە چۆمەکانی پاپۆرسازی بەریتانیا کاری دەکرد، لە پروسیا زانیارییەکی تەواوی وەرگرت لە تەقەمەنیو چەکسازی بە تایبەتی لە تۆپسازیدا. دیدەنی زۆر کارگەو خوێندگا و مۆزەخانە و کارخانەی پاپۆرسازی کرد. لە چەند کۆبوونەوەیەکی ئەنجومەنی پیرانی بەریتانیادا ئامادە دەبوو . لەو جموجوڵ و چالاکیانەیدا سوودێکی زۆر چاكو بەپیتی وەرگرت لە ڕوشنبیری و زانستی، پیشەسازی و شێوازی کارگێری و چەندین کاروباری تردا .

پاش ئەوەی کە تەواو بەخۆیدا ڕابینی، لە ساڵی ١٦٩٨ زدا گەڕایەوە ڕووسیا . هەر کە هاتە سەر تەختی قەیسەری کەوتە چەسپاندنی ئەو شتانەی کە لە ڕۆژاوا فێری بووبوو . دەستیکردە خاسکارییەکی بەرین و فراوان لە کردنیڕووسیا بە وولاتێکی نوێ، زۆر کارزانو شارەزایانی لەتەك خۆیدا هێنایەوە بۆ ڕێکخستنی وولات، چەندین لاوی نارده دەرەوەی وولات بۆ خوێندن، تەواو هانی پیشەسازیو بازرگانی ئەدا ، شارەکانی گەورەو فراوان کرد، چینی بۆرژوا پەیدابوو و سەنگێکی بۆ خۆی دانا چ لە ڕووی ژمارە و چ لە ڕووی گرنگیەوە. بۆیەکەم جار نێوی دەریای پێکهێناو بەهێزی کرد ،

شێوازەی سوپای بەشێوازێکی ڕۆژاوایی ڕێکخست ، ئۆردوە سەربازییەکانی بەیەك جۆر بەرگ و تۆپ و چەکی نوێ باربۆکرد. ڕێ و شێوازی ڕۆژاوایی خستەکار لە ڕاهێنان و مەشقکردنی سەربازیدا .

ئینجا لەدواییدا کەوتە خاسکارییەکی زۆر توندو فراوان لەرژێمی کارگێری وولاتدا بۆبەرزکردنەوەی فەرمانبەران لەسەر نباغەی گونجان و لێهاتوویی نەك لەسەر نباغەی موچەو جێگەی وەچەزایی. لەبارەی کۆمەلایەتییەوە... زۆر هانی ئەو شێوازو ڕەفتارە ڕۆژاواییانەی ئەدا کە لە ژیانی ڕۆژانەدا پێی دەگوزەران وەك فەرمانی دا بەتاشینی ڕدێنی درێژ (بەلام لەدواییدا لە فەرمانەکەی پاشگەزبووەوە). سەبارەت بەدادوەران و ڕەفتاریان لە دادگادا... فەرمانیدا لەسەر شێوازو چەشنی ڕۆژاوا بەرگ پیۆشن و دووربن لەگشت جۆرە دوکەل کردن و قاوە خوارنەوەیەك . هەرچەندە لەپێشدا نارەزاو بێزاربوون بەلام ئەم هەر کۆلی نەدا و سوور بوو لەسەر چەسپاندنی ئەو ڕێبازەی تا لە ئەنجامدا سەرکەوت. تەنانەت چینە ئەرەستۆکراتیەکانیش لەدواییدا بەرەبەرە ئارام و چەشە بوون .

پاشان دەستی خستە نێو کاروباری کەنشتەی ئەرثۆدۆکسەوە کە ئەمیش زۆر ناچالاك و دواکەوتووبوو . لەم بوارەیشدا تاڕادەیەك توانی شێرازەی بگرێتەوە و دەسەلاتی بەسەردا بکێشێت . وەڕاری بە خوێندن دا و چەندین زانستگای بە سەرپەرشتی خۆی کردەوە و خستیە ئاستێکی باش و گەوارەوە . کالەندەری یۆلیانی ڕێك وپێك کردەوەو هێنایەکایەوە ، گۆرانکاری لەپیتی نووسینی ڕووسی دا کرد و خستیە ئەو ئاستەوە کە یەکەم ڕۆژنامە لەسەردەمی دا بەزمانی ڕووسی دەربچێت .

پاش جیٚبەجیٚ کردنی ئەم کارانەی ناوخۆ، ئینجا سیاسەتی دەرەوەی وولاٚتی دەباند کە لە دواییدا ئەنجامیٚکی گرنگی بەدیهیٚنا بۆ وولاٚت هەرچەندە بە چەند جەنگیٚکەوە گیرۆدەبوو .. لەباشوور لەگەلٚ تورکیا و لەباکووریش لەگەلٚ سوید . لە سالٚی ١٦٩٦ زدا شاری (ئوزوف) ی تورکیای داگیرکرد، هیٚزی بەرپیٚکرد بۆ دەریای رەش، بەلاٚم لەدوا سالاٚنی دەسەلاٚتیدا ناچاربوو ئەو شارە (ئوزوف) بگەریٚنیٚتەوە بۆ تورکیا .



# مەنشیس...

٣٧١ پ ز - ٢٨٩ پ ز

Mencius

(مانج - کو) ی مەزن ناسراو بەمەنشیس واتە مانجی هۆزاك[١] ، گرنگترین کەسێك بوو کە لەدوای کۆنفۆشیۆس وەدەرکەوت و تینی دا بە ئامۆژگارییەکانی کۆنفۆشیوس، لەبەر ئەوە زیاتر بەهۆزاکی دووەم ناسراوە لەچیندا .

مەنشیس نزیکەی ساڵی ٣٧١ پ ز لە هەرێمی (تساو) لەدایکبووە . ڕێکەوتی ئەو سەردەمە دەکات کە هێشتا چین یەکی نەگرتبوو ، هەر ئەو سەردەمەیش دەکات کە ناسراوبوو بەسەردەمێکی پڕ لە ئاشوب و جەنگ لەنێوان هەرێمنشینەکانی چیندا ، هەرچەندە ئەو

ئامۆژگارییانەی تەواوکەری ئامۆژگارییەکانی کۆنفۆشیۆس بوو بەڵام لەپاش ماوەیەکی‌کەم پەیڕەوو دەسەڵاتی لەنێو مەردومدا زۆر بۆپەیدابوو و بووە زاناو فەیلەسوفێکی هێزاو خاوەن ڕێبازێکی سەربەخۆ.

مەنشیس زوربەی ژیانی لاوێتی بەگەریدەیی دەبردەسەر لەسەرانسەری چیندا. لە بوارە جیاوازەکانی ژیاندا ئامۆژگاری ئەدا بە فەرمانڕەواکان. خەڵك زۆر بەرێزەوە گوێیان بۆ پەندەکانی شل دەکرد. بۆماوەیەك بوو فەرمانبەرێکی گەورە لە ناوچەی (تشی) دا بەڵام لەوە ناکات کارێکی هەمیشەیی لە سیاسەتی دەولەتدا گیرابێت.

ساڵی ٣١٢ پ‌ز لەتەمەنی ٥٩ ساڵیدا گەڕایەوە هەرێمی تساو ئیتر تادوازیانی هەرلەوێ مایەوە تاکو لە ساڵی ٢٨٩ پ‌ز دا کۆچی دوایی کرد (وەك دەڵێن).

ئەوەی کە زیاتر باوبانگی پێدەرکرد و بایەخی پێ‌دەدرا نووسینەکەی (نامەی مەنشیس) بوو کە بە ڕێکوپێکەوان ئامۆژگاری‌و پەیڕەوە بنەڕەتیەکانی تیایدا ڕوون کردۆتەوە، هەرچەندە شاگرد و پەیڕەوکەرانی کەوتنە دەسکاری بەڵام بیرە سەرەکییەکانی هەر تێداماوە.

لەم نامەیەیدا شێوازێکی نموونەیی‌و گەشبیری‌ی تیادا بەدی دەکرێت. زوربەی ئەو نەریتە سەرەکییانە و بیرە سیاسییانەی زۆر لە ڕێبازگەی کۆنفۆشیۆس دەچێت.

مەنشیس لەوبڕوایەدابوو کە پاشا بایەتە بەئاکارو ڕەوشتی بەزری دادیگەل بدات‌و دوور بکەوێتەوە لە هەموو بەدڕەفتاری‌و نارەواییەك. بەم پەندو ئامۆژگارییانەیدا لەوەدەکات کە لە کۆنفۆشیۆس زیاتر خۆشەویست بوو بێت لە نێو خەڵکدا . وەك لەو پەندە کاریگەرانەیدا دەردەکەوێت کە دەڵێت (ئاسمان وەك مرۆڤ دەبینێت .. وەکو مرۆڤیش دەژنەفێت) .

مەنشیس بەهەموو توانایەکییەوە پشتیوانی لە مافەکانی گەل دایدەنێت دەکات‌و بەبەردی بنچینەی فەرمانڕانی‌ی . گەل زۆر بە گرنگتر لەفەرمانڕەوا دادەنێت. دەڵێت هەر لە ئەستۆی فەرمانڕەوایە کە بەرژەوەندی گشتی گەل پتەوبکات‌و بەرەوچاکی هانی بدات .. جاریٚ دەبێت بەشێوەیەکی تایبەتی گەلەکەی چەشە بکات بەرەفتارو ڕەوشتی بەزر ، هەل‌و مەرجی ژینخۆشییان بۆ بسازێنێت . ڕای لەسەر بازرگانی سەربەست‌و باجی سووك سامانە سروشتیەکان بهێڵرێتەوە ، دابەشیش بکرێت بەرێگەیەکی یەکسانترو پەسەنتر. پێویستە لەسەر فەرمانڕەواو دەسەڵاتدار کە یارمەتی پیران‌و پەككەوتووان بدات .

مەنشیس لەو بڕوایەدا بوو کە پاشا دەسەڵاتی لەئاسمانەوە بۆدێت ، بەڵام ئەو پاشایەی بەرژەوەندی گەلەکەی ئاستن بکات ئەوا لە نازو ڕێزەنی ئاسمان دەکەوێت و ئەوساکەیش بایەتە لەکاربخرێت . لەم پەندەیدا دەرەکەوێت کە (زۆر لەپێش جۆن لۆك پەی بەم ڕاستیە بردووە) گەل مافی ئەوەی هەیە بەرەنگاری بەدڕەفتاری و نارەوایی پاشا

بووەستێت ، ئەم بیروڕایە زۆر گەوارو جێگیر بوو بەشێوەیەکی گشتی لە چیندا .

بەگشتی مەنشیس داوای جۆرێك لە سیاسەتی دەکرد کە زیاتر بەلای گەلدا لابدات وەك بەلای بەرژەوەندیی فەرمانرەوادا ، لەبەرئەوە لە ڕۆژانی خۆیدا گوێ بەبریارەکانی نەدەدرا لەلایەن فەرمانرەواکانەوە ، بەلام دوابەدوا بیرەکانی زۆر ئاشنای زانا کۆنفۆشیەکان و گەلی چین بوو . پلەو پایەی ئەو پیاوە هۆزاکە... بلندتربووەوە پاش دەرکەوتنی کونفۆشیەتی نوێ لەسەدەی یانزە و دوانزەهەمدا .

---

(١) تێبینی وەرگێر .



# جۆن دالّتون...

١٧٦٦ ز - ١٨٤٤ ز

John Dalton

زانای مەزنی بەرتیانیایی دالّتۆن ، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بیردۆزەی گەردیلە Atomic Theory دارشت‌و خستیەروو ، ئەم بیردۆزەی دەرویەکی گەورەی کردەوە لەزانستی کیمیادا لەوروژەوە تائەمرۆ. ئەگەر تیروانین‌و سەرنج‌بدەین بۆمان دەردەکەویت دالّتون یەکەم کەسێك نەبوو ئەو پێشنیارە ئاشکرابکات کەدەڵێت : «مادەکان لە ژمارەیەکی یەجگار زۆر زۆر ووردو درشت پێکهاتوون پێیان دەوترێت گەردیلە» . فەیلەسوفی یۆنانی دیمۆکرتیۆس (٤٦٠ پ ز - ٣٧٠ پ ز) کاتی خۆی ئەم گریمانەی ئاشکرا کرد ، فەیلەسوفێکی

تریش بەناوی (ئەپیکۆر) ئەم گریمانەی لەکاتی خۆیدا دەباند[١] ، هەروەها نووسەری رۆمانیش (لۆکریتۆس) لەیەکی لە چامەکانیدا بەناوی (سروشتی شتەکان Nature of things) باسی کردووە .

بەلاَم بیردۆزەکەی دیمۆکریتۆس کەباش بۆ بابەتەکە دەچوو ئاستنکرا[٢] وهیچ بایەخی پیٚنەئەدرا لەبەرئەوەی کە ناگەوار بوو لای ئەرەستۆ . ئیتر هەر لەسەدەکانی ناوەراستیشەوە هیچ زانایەك وەدەرنەکەوت کە پەیوەندییەك ببینیّتەوە لەنیٚوان تیٚرامانە فەلسەفیەکانی گەردیلەو راستیە رچیاوەکان[٣] لەزانستی کیمیادا .

لیٚرەوە دالْتۆن هاتە نیٚو کۆرەوە ، بیردۆزەیەکی روونو ساکاری خستەروو بەجۆریکی وەها کە بشیٚتو بەکاربهیٚنریٚت لە لیٚدوانی زانستگەریە کیمیاکاندا . ئەو زاراوە زانستانەی کە بەخۆی دایهیٚناو بەکاری دەهیٚنا وەنەبیٚت هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی هەبوبیٚت لەگەلْ ئەو زاراوانەی ئیٚستاماندا . بگرە ژیرانەیش پەی بەچەمکی گەردیلەکانو گەردەکانو توخمو ئاویٚتە کیمیاییەکان دەبردو زۆر بەجوانی یەکالاَی دەکاتەوە ، لەگەلْ ئەوەیشدا روونی دەکاتەوە کە کۆژمارەی گەردیلەکان لەجیهاندا یەجگار زۆرن لەبەرئەوە دەبیٚت جۆرو شیٚوە پیٚکهاتووەکانی ئەم گەردیلانە تارادەیەك بسنوریٚنریٚت ، هەروەك لە پەراوەکەیدا دەریدەخات ناوی ٢٠ توخم دەبات .. کە ئیٚستا پتر لە سەد توخم هەیە . لەگەلْ ئەوەیشدا کە دەیزانی جۆرە جیاوازەکانی گەردیلەکان جیاوازییان هەیە لەکیٚشی گەردیلەیاندا کەچی هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دوو گەردیلەی هەمان جۆر وەك یەکن لە خوکارەسروشتەکانیاندا بەبارستەیشیانەوە .

دالْتۆن لەپەراوەکەیدا خشتەیەکی بۆ توخمەکان نەخشاندووەو

بەرپزیش ناوی توخمەکان دەبات بەکێشی گەردیلەیانەوە . بێگومان ئەم خشتەیە بەیەکەمین خشتەی خولی توخمەکان دادەنرێت ، بووە دەروازەیەکیش بۆ ئەو بیردۆزە گەردیلەییانەی کە لەو سەردەمەدا وەدەرکەوتن . دالتۆن سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەردووگەرد لەهەمان ئاوێتە کیمیاییدا ژمارەیەکی یەکسانیان هەیە لە گەردیلە (بۆ نموونە گەردێك لە ئۆکسیدی نایتریك پێکهاتووە لە دوو گەردیلەی نایتروجین‌و گەردیلەیەك ئۆکسجین $N_2O$) ، هەروەها لە ئاوێتەیەکی کیمیاییدا هەمیشە هەمان توخم‌و هەمان رێژەی کێشەیی هەیە کە ئەمەیش بە (یاسای رێژە جێگیرەکان the low of constant proportion) دەناسرێت و زانای مەزن (جۆزیف لویس پراوست) دۆزییەوە ، دالتۆن زۆر گرنگ و بایەخی بەم یاسایە دەدا لە تاقیگەریەکانیدا .

دالتۆن بیردۆزەکەی بە شێوازێکی وارێکوپێك‌و ژیرانە دارشتبوو کە هەر لەو ۲۰ ساڵەیدا زوربەی زانایان پەسەندیان کردو کەوتنە کارپێکردنی ، زۆر لەکیمیاگەرانیش کەوتبونە سەر ئەو بەرنامەیانەی کە لە پەراوەکەیدا پێشنیاری کردبوو ، لەو زانستگەرییانەی کە بەئەنجامی دا دەرهێنانی کێشی گەردیلە بوو زۆر بەتەواوی ، هەر بەکێشان ئاوێتە کیمیاییەکانی جیا کردەوە و کۆمەڵە رێکخراوەکانی ئەو گەردیلانەی کە هەر گەردێکی پێکهێناوە بە رێکوپێکی دەسنیشان کرد .

دالتون ساڵی ۱۷٦٦ ز لە گوندی (ئێکزفیلد) لە باکووری ئینگلتەرە لەدایك‌بووە ، خوێندنی سەرەتایی لەتەمەنی ۱۱ ساڵیدا تەواوکرد ، هەر بە خۆسەرشتەیی... ئاستی رۆشنبیری و زانستی‌ی لە زانستە جیاوازەکاندا بەرزکردەوە ، لە تەمەنی ۱۲ ساڵیدا بووە ماموستا ، ئیتر بەدرێژایی ژیانی هەر بەپیشەی یاددان‌و بە مامۆستایەکی تایبەتی مایەوە .

لەتەمەنی ١٥ ساڵیدا گوازرایەوە بۆ شاری (کاندالْ) ، پاشان لەتەمەنی ٢٦ ساڵیدا چووە (مانشتەر) ئیتر لەویێ مایەوە تاکو لەساڵی ١٨٤٤ زدا... دواماڵاوایی لەژیان کرد .

سەرانسەری ژیانی هەورا بەرەبەنی[٤] بردهەسەر ، داڵتۆن جگە لەو زانستگەریە مەزنانەی بایەخی تری دەدا بە روانگزانی ی[٥] ، ساڵی ١٧٨٧ زی لەتەمەنی ٢١ ساڵیدا رشتەیەکی سەرکەوتوانەی لەم بارەیەوە نووسی . لەناکاویشدا تووشی رەنگ کویری‌بوو . ئەم نەخۆشییەی زۆر بەگرنگییەوە لیێی دەکۆڵییەوەو بایەخی پیێدەدا . زانستگەرییەکی لەم بارەیەشەوە بەناوی رەنگ کویێری[٦] (Color blindness) وە نووسی‌و بلاوکردەوە کە بە یەکەم تۆژینەوەیەك دادەنریێت لەم بوارەدا .

---

(١) دەباندن : تبق .
(٢) تاستن : پشتگوێ .
(٣) رچیاو : وەستاو ، جامد .
(٤) رەبەنی : سەلَتی .
(٥) روانگزانی ی : زانستی روانگە .
(٦) Daltonism : دیاردەیەکی هاوبەشە لە نیێوان خۆی و براکەی .



# هۆمێرۆس..

لەوانەیە نزیکەی
سەدەی هەشتەم پ ز ژیابێت .

**Homer**

گەلێك بیروباری ناکۆك دەربارەی چامە هۆمێرۆسیەکان سەری هەڵداوە ، ئەو پرسیارانەی کراون ئەوەیە:کەی .. لەکوێ .. چۆن .. ئەلیازە Iliad و ئۆدێسە Odysseus نووسراونەتەوە ؟ ئایا لەدانراوە پێشترەکانیەوە وەرگێراوە ؟ ئایا دانەری ئەلیاز و ئۆدێسە هەمان کەسن ؟ ئەم پرسیارانە هەندێك گریمانان لەبەردەستدا دادەنێت ئەویش ئەوەیە ڕەنگە زەلامێك بەناوی هۆمێرۆسەوە هەر نەبووبێت، ئەم دوو چامە ڕەنگە دەماودەم گۆڕابن و لەسەر زیاد کرابێت یان چەند کەسێك کۆیان کردبێتەوە و بڵاویان کردبێتەوە ئەمجا ئەم چامانە هەڵبژاردەی

جۆرارو جۆری ئەوانەبن . ئەو زانایانەی کە لەم کێشەیەیان کۆڵیوەتەوە لەسەر هیچ گوشادێك پێك نەهاتوون . لەمانەوەرا چەند گریمانێك دەتوانین پێشنیار بکەین . یەکێك لەوانە ئەوەیە یەك دانەر هەبێت بۆ ئەلیاز – کە زۆر نایابە و ڕێی تیّ ناچێت لێژەنەیەك دابنابێت – گەلێك هۆنەر لەکۆندا بەشێوەی کورتە چامە نووسیویانە ، بەلاّم

هۆمێرۆس ئەوچامانەی ڕێك وپێکی کردون و ڕیزی کردون و بۆی زیادکردون ، فووی بلیمەتی و هەلّکەوتوی و بێ هاوتای خۆی پیاکردوە . لەوانەیە هەر هەمان پیاو دانەری ئۆدێسەیش بێت چونکە وێکچوونی ئەم دوو چامەیە هەر زۆر گەورەیە لەگەلّ ئەوەیشدا شتێکی ئەو تۆ لەبارەی هۆمێروس خۆی نازانین تەنها ئەوە نەبێت ئەلّێن گوایە کوێربووە .

ئەم دوو چامە پێکهاتوون لەنزیکەی ٢٨ هەزار دێڕ ، وا دەردەکەوێت لەم دوو چامەیەدا کە کوێری زگماك نەبووبێت بەلّکو ماوەیە لە بەچاوساغی ژیاوە و دووچامەکەی نووسیوە تەوە ئینجا کوێر بووە .

سەربارەت بەناوبانگی هۆمێرۆس لەوانەیە دیسان چەند پرسیارێك بەرەو روومان بێتەوە کە بۆچی ئاستو پلەبەکی وای لەم لیستەدا دراوەتیّ ؟ جگە لەوەی کە مشت ومڕێکی زۆریش هەیە لەنێوان ناوبانگی و کارێگەری لەنێو مەردمدا . هەرچەندە نووسراوەکانی لەخوێندگاردا دەخوێنرین بەلاّم لەگەلّ ئەوەیشدا کەم کەس هەیە بیخوێنێتەوە . گەر بەراووردی بکەین بۆ نموونە لەگەلّ شەکسپیردا دەبینین چامەو شانوگەرییەکانی هێشتا سەرنجی زۆر لەخەلّك و سەیرکەران ڕادەکێشن ، زیاتر لەوەیش کە زۆر لە کۆڕە وێژەییەکان و

هۆنەرکانی ئەم سەردەمە سەودای کارنامەکانی هۆمێرۆسن .
بەپێچەوانەی (شەکسپیر و بنیامین فرانکبین و عومەر خەیام) وە دۆخێکی زۆر مەزنی هەبووە بۆسەر گەلانی یۆنان لەکۆندا بەوەی کە کاریکردوتەسەر زۆر لە هەڵوێستە ئایینیەکان و خورەوشتی مەردوم .
زۆر لە سەرکردەکان حەزیان بەکارنامەکانی هۆمێرۆس کردووە هەتاوەکو دەڵێن گوایە ئەسکەندەری گەورە هەمیشە دووچامەمکەی هۆمێرۆسی پێ بووە لە پەلاماردانەکانیدا. گرنگتر لەمانە .. کاریگەری باڵای هەبووە بۆ سەر زوربەی بوێژانو نووسەرانو شانۆگەرانی وەك سۆفۆکلێس ، یۆرۆبیدس ، ئەرەستۆ .. هەروەها بۆسەرنووسەرانی رۆمانی ، فراجیل کە بەیەکی لە مەزنترین نووسەری رۆمان دادەنرێت نووسراوە نایابو بەپێزەکەی بەناوی (ئینیاز Iniad) دانیاوە لەسەر هەمان شێوازی ئەلیازەیە .



# خاتو ئەلیزابێت شای یەکەم

١٥٣٣ ز - ١٦٠٣ ز

Queen Elizabeth

بە هەڵکەوتووترین دەسەڵاتدار دادەنرێت لە سەرانسەری مێژووی بەرتیانیادا . هەر لەسەردەمی ئەودا (کە نزیکەی ٤٥ ساڵی خایاند) گۆڕانکارییەکی تەواو بەسەر بەرتیانیادا هات ، بایەخ وگرنگی یەکی تەواوی ئەدابە گەشاندنی ئابووری ی و بوژانەوەی زانستی ی و هونەر و وێژە .. وای لە بەریتانیا کرد کە ببێتە بەرزترین و پێشکەوتووترینووڵات لە نێو ووڵاتانی دەریایی لە جیهاندا . خاتو ئەلێزابێت لەم کارە مەزنانەیەوە دەردەکەوێت کە وەکو پاشایانی تر فەرمانڕەوایی نەکردبێت لەبەرئەوەی کە سەردەمی دەناسرێت بە چەرخی زێڕین و بە هەڵگری مەشخەڵی ئەو چەرخە لە بەریتانیا.

سالّی ١٥٣٣ ز له گرینتش – ئینگلتەره لەدایك‌بووه . (هێنری شای هەشتەم) کە باوکی‌بوو توانی خاسکاریيەکی ئایینی ساز بکات له ئینگلتەرەدا دایکیشی کە ناوی (ئان پۆلّین) بوو به فەرمانی باوکی سەربڕا (ئەودەمەیش ئەلیزابێث له تەمەنی ٣ سالّاندا بوو). لەسەر ئەم کارەی ، پەرلەمان کردیه هەراو بڕیاریدا لەسەر ئەوەی کە ئەلیزابێث زۆڵه چونکه وازهێنانی هێنری‌شا بەجیابوونەوە لەژنی یەکەمی بەکارێکی نارەوایان‌زانی . لەو هەموو بارەناهەمواری‌و تەمومژیشدا ئەلّیزابێث زۆر چاك گۆش و پەروەردەکراو ڕۆشنبیرێکی زۆر سەرشتەی لێدەرچوو .

لەتەمەنی ١٣ سالّاندا باوکی مرد ، (ئەدواردی شەشەم) بووه جێ‌نشینی ، دوابەدوای ئەمیش خاتو ماری خوشکی جێ‌ی گرتەوە . ئەمانه هەردووکیان کاثۆلیك‌ڕەو و پاپادۆست بوون ، هەر لەسەردەمی ئەواندا نزیکەی ٣٠٠ پرۆتستانتی کوژران و چەندیشیان چەوساندەوە ، لەسالّی ١٥٥٨ زدا کە خاتو ماری مرد ئەلیزابێث بووه جێ‌نشینی‌و هاتە سەر تەختی پاشایی.

گرنگترین کێشه کە بەرەنگاری ئەلیزابێث وەستابوو و له ڕێگەیدا بووبوه کوسپێکی گەوره فرەبەرەکی ئایینی بوو له ئینگلتەرەدا بەلّام زۆر به سەلارانه ئەو کێشەیەی ڕاگرت و توانی چارەسەری بکات ، پاش ئەوەی ئەو کێشەیەی بۆ یەك‌لابووەوه ڕێبازگەی ئەنجلیکانی کرده ڕێبازی ئایینی‌لەسەرانسەری بەریتانیادا . پرۆتستانته مامناوەندەکانیشی بەم کاره ڕازی‌کرد بەلّام بیوریتانەکان داوایان دەکرد ئەو خاسکاریيه زیاتر ڕادیکالّانه و فراوانتربێت .

پاپا و کاثۆلیك‌ڕەوەکان ئەم کارەیان زۆر لانابەسەندبوو ،

توورەییان گەیشتە ئەو رادەیەی کە پاپا بانگەوازی بێئایینی بداتە پاڵ و فەرمان بدات بەوەی کە ڕوخاندنی ڕەوایە . بەڵام گەلی بەریتانیا بەهەموو توانایانەوە پشتگریان کردو هاتنەسەر ئەو بڕوایەی کە ئیتر ئەو چەرخە نەما پەیڕەوی پاپای تیادا بکەن .

یەکێ لەو کارەمەزنانەی ئەلیزابێث بەهێزکردنی نێروی دەریایی بوو، لەو دەمەیشدا فیلیپ شای ئەسپانیا هەوڵی دامرکانەوەی ئەو بزوتنەوەی دەدا کە لەهۆڵندە بەرپابووبوو لەدژی خاتو ئەلیزابێث یارمەتی هۆڵەندیەکانی داو پشتگیری لێکردن ، چونکە زوربەی هۆڵەندیەکان پرۆتستانتی بوون . ئەم کێشەیە بەرەنگاری خستە نێوان ئینگلتەرەو ئەسپانیاوە .

فیلیپ شا نێرویەکی دەریایی گەورەی ئامادەکرد کە ناوی (ئاماردا) بوو واتە (هێزی نەبەز) . لەو جەنگەدا دەریاوانە ئینگلیزەکان بۆ ئەسپانیاییەکانیان دەرخست کە زۆر بەتواناترو جەربەزەترن جگە لەوەی کە چەکدارترو جەنگاوەرترن ، لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان بەئاسانی توانییان زاڵ بن بەسەریانداو ئاماردا تێکشکێنن . لەم جەنگەدا گرنگی بەریتانیا دەرکەوت بە یەکەم دەوڵەتێکی دەریایی لە ئەوروپادا .

ئەلیزابێث لە ژیانیدا شووی نەکرد و کەسیشی لەدوای خۆی دانەنا جێی بگرێتەوە چونکە ڕکی لەوە دەبووەوەو دەترسایش کە یەکێك دیاری و دەسنیشان بکات و ئینجا لە دواییدا بکەوێتە پیلانگێران لەدژی . لەبەختی ئینگلتەرە خاتو ئەلیزابێث نزیکەی ٧٠ ساڵ ژیا . ئەو دەمە دوورو درێژە بەریتانیای دوورخستبووەوە لە زۆر ئاشوب و کودەتا و ئاژاوە ئاینیەکان . خاتو ئەلیزابێث ئافرەتێکی زۆر سەلارو سیاسی و

ووریابوو . زۆر ڕکی لەجەنگ و خوێن ڕێژیدەبوەوە هەروەکو باوکی هاوسەنگانە ڕەفتاری دەکرد لەگەڵ پەرلەماندا ، زیاتر لەگەڵ پەرلەماندا فەرمانڕانی دەکرد و دژی پەرلەمان نەدەوەستا . حەزی نەدەکرد شوو بکات ، ڕکیشی لە پیاوان نەدەبووەوە بەڵکو حەزی بەدوستایەتیو ڕاوێژیانی دەکرد .

پێش مردنی ڕایسپارد کە (جێمسی شەشەم) پاشای سکوتڵەندە جیٚی بگرێتەوە . ئەم کارە بووە هۆی نزیکبوونەوەو یەکگرتنی ئینگلتەرە و سکوتڵەندە ، بەڵام ئەم هەڵبژاردنەی لەجیٚی خۆیدا نەبوو چونکە بووە مایەی خراپیو ئاژاوە. جێمس و کوڕەکەی (شارڵی یەکەم) زۆر خۆیان دوور خستبووەوە لە ژینگار و نەریتی گەلی ئینگلیزەوە ، حەزیان بەخۆسەپاندن و خۆخۆیی دەکرد . ئەم ڕەفتارانەیان بووە هۆی بەرپاکردنی جەنگی گەلی لەسەردەمی شارڵی یەکەمدا . ئەو جەنگەیش بە کوشتنی شارڵ کوتایی هات .

○



# جۆستنیان

٤٨٣ ز - ٥٦٥ ز

justinian

ناوبانگی ئیمپراتۆر (جۆستنیان)... بەوە دەرکەوت کە لەسەردەمی ئەودا بەسەرپەرشتی خۆی قانونی ڕۆمانی بە ڕێکوپێکی نووسرایەوە. ئەگەر ئەم قانونانە هەڵگیرایەو بخرابایەتە فەرامۆشەوە، ئیدی ڕۆما زرنگ ولێزانی وای لێنەدەکەوتەوە کە بتوانێت یاسادابنێت، سەرەڕای ئەوەیش کەبووە پاڵهێز و بناغەیەك بۆ پەرەپێدانی قانونانی زوربەی وولاتانی ئەوروپایی، هیچ قانونێکیش ئەوەندە بەبایەخ و گرنگ نەبووە لەجیهاندا وەك قانونی جۆستنیان.

جۆستنیان ساڵی ٤٨٣ز لە (تۆریزیۆم) یوگۆسلاڤیای ئێستا

لەدایك‌بووە ، برازای (جۆستینی یەکەم) بووە کە ئەمیش جووتیارێکی بێسەواد بووە ، بەسەرشتەیی و جەربەزەیی و دەسەلاتی بەسەر سوپادا توانی ببێت بەئیمپراتۆری وولاتێکی بەرینی وەك ئیمپراتورێتی رۆمانی خۆرەلات ، جۆستنیانی گوندەکی بەیارمەتی مامی توانی پلەیەکی بالا لەخوێنەواری بەدەست بێنێت و زوو لە کاروباری وولاتدا پایەی بەرزی بدرێتێ ، ئینجا ببێتە شالیاری ئیمپراتۆر ، لە دواییشدا پاش مردنی مامی لەسالی ٥٦٥زدا ببێتە ئیمپراتۆر.

لە سالی ٤٧٦ زدا بەر لە حەوت سالی لەدایك بوونی جۆستنیان ، ئیمپراتۆرێتی خۆرنشین بە دەستی بەربەرەجەرمانیەکان رما. تەنها ئیمپراتورێتی رۆمانی خۆرەلات کە پایەختی (کۆستانتینا) بوو بە ئاسایشی مایەوە . لەبەرئەوە جۆستنیان بریاریدا ئەو زەویانە بگێرێتەوە ژێر دەسەلاتی خۆی کە بەربەرەکان داگیریان کردبوو ، بە ئومێد و نیازی ئەوەی ئیمیراتورێتی رۆمانی یەکگرتوو بگەرێنێتەوە .

ئەم پرۆژە و نەخشەیەی تارادەیەك سەرکەوتوو بوو ، توانی بچێتە ناو ئیتالیا و باکووری ئەفەریقا و بەشێك لە ئەسپانیا و لە چنگی بەربەرەکان دەربهێنێت .

دانانی جۆستنیان لەم لیستەیەدا وەنەبێت لەبەر ئەو کار و هێرشە سەربازیانەی بێت تەنها بەلکو وەك یەکەم پێشکارێك لەنووسینەوەی قانونی رۆمانیدا .

له سه‌ره‌تاكانی ساڵی ٥٢٨ زدا واته ساڵێك پاش ده‌سه‌ڵاتی فه‌رمانی‌دا به‌پێكهێنانی لیژنه‌یه‌ك بۆ ده‌رهێنان‌و سه‌رپه‌رشتی‌كردنی ڕه‌نووسێكی پربه‌پر له قانونه‌كانی ئیمپراتۆریی . یه‌كه‌م كارنامه‌ی ئه‌م لیژنه‌یه له ساڵی ٥٢٩زدا به‌خش‌و بلاوكرایه‌وه . له ساڵی ٥٣٤ز جارێكی‌تر ڕه‌چاوكرایه‌وه و بژاركرایه‌وه و داڕێژراو بووه كۆمه‌ڵه قانونێكی سه‌ره‌كی، هه‌ر له‌هه‌مان كاتیشدا هه‌رچی ده‌ستوورو فه‌رمان‌و قانونه‌كانی تربوو كه قانونه تازه‌كه نه‌یده‌گرته‌وه هه‌مووی لابراو چزێنرا له‌كاروباری ئیمپراتۆرییدا .

ئیتر ئه‌م كۆمه‌ڵه قانونه بووه به‌شێك له (قانونه شارستانیه گشتیه كانی ڕۆمانی) . به‌شی دووه‌م له‌م كۆمه‌ڵه قانونه پی‌ی ده‌ووترا (باندكت) واته هه‌ڵبژارده‌كان كه بریتی‌بوو له پوخته‌ی بیرورا بێژراوه‌كانی یاساسازان و قانون ڕه‌وێنی ڕۆمان . به‌لام به‌شی سێهه‌م كه پێی ده‌وترا (ناوه‌ڕۆك) كورته نووسراوێك بوو بۆ خوێنگای خوێنكارانی قانون، ئینجا له‌داوییدا ئه‌م (به‌ند) انه هه‌مووی كۆكرانه‌وه و له‌لایه‌ن جۆستنیانه‌وه په‌سه‌ندكراو مۆركرا ، به‌ڵام له‌پاش مردنی بڵاوكرایه‌وه .

له‌به‌ر جه‌نجاڵی به‌جه‌نگ‌و ئه‌ركی كاروباری وولاته‌وه نه‌یتوانی گه‌ڵاڵه‌یه‌ك دابنێت بۆ قانونه گشتییه‌كانی یاساندنی مۆلكی. ئه‌م هه‌موو كاروباره‌یه‌ش به‌سه‌رپه‌رشتی قانونسازی زرنگ (تریبۆنیان)ی مه‌زن به‌رێوه ده‌برا .

جۆستنیان ووریایی و چالاكی‌خۆی ته‌رخان‌كردبوو بۆ به‌رهه‌ڵستی

بەدکاری لەمیریدا ، هانی بازرگانیو پیشەسازی دەدا ، دەستیکردە پرۆژەو بەرنامەیەك بۆ دروستکردنی ساختمانە گشتییەکان وەك دروستکردنی قەلاو دیرو کەنشتەکان، هەروەها کەنشتەی (ئاياسوفيا)ی بەناوبانگ لە کۆستانتینا . لەم پرۆژەکاریو جەنگانەیدا باجێکی زۆری کەوتەسەر. ئەمە بووە هەلگیرساندنی چەندشۆرشێکی ناوخۆیی واکەلەوانەبوو تەختی پیێ لێژبکات ، بەلام توانی ئەو شۆرشانە دابمرکێنێتەوەو ... خۆی جێگرتر و پتەوتر بکاتەوە . لەبەرئەوە گەل بەگشتی ئەوەندە لیێ ی بیزار بوو کە مرد لە سالی ٥٦٥زیدا زۆریان پیێخۆش بوو .



# جۆهانس کیپڵەر...

١٥٧١ز - ١٦٣٠ز

**johannes kepler**

جۆهانس کیپڵەر... دۆزەری قانونەکان دەربارەی جوڵانەوەی ستێرەکان ، لە ساڵی ١٥٧١ز لەشاری (وێلدیرشتوت) ی ئەڵەمانیا لەدایك‌بووە ، ئەوساڵە... ڕێکەوتی ٢٨ ساڵ دەکات بەسەر دەرچوونی پەڕاوەکەی کۆپەرنیکۆسدا کە تیایدا بە بیردۆزەکەی خولانەوەی ستێرەکان بە دەوری خۆردا ڕوون‌دەکاتەوە کە ئەمەیش پێچەوانەی چەمکەکانی کونە.

کیپڵەر کە لەزانکۆی تۆبنگن ئەڵەمانیا دەیخوێند ، بیستبووی کە زوربەی زانایان بیردۆزەکەی کۆپەرنیکۆسیان لاپەسەند نیە بەڵام ئەم

پاش لێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوت کە راستەو جیٚی باوەرە، کە بووە ئوستادیش لە ئاکادیمیای گراز... لەساڵی ١٥٩٦ زدا یەکەم پەراوی دەرکرد دەربارەی گەردوون.

زانای ستێرناسی مەزن (تایکۆ براهی) داوای لێکرد بێتە لای تاکو لەروانگەکەیدالە (پوراگ) کاربکات. کیپلەر داواکەی پەسەند کردو لە کانوونی دووەمی ١٦٠٠ زدا خۆی گەیاندە تایکۆی زانا.

لە ساڵی ئایندەدا تایکۆ مرد، ئیتر هەرچی کاروباری روانگەکەبوو کیپلەر گرتە ئەستۆ. تایکۆ بەدوا گەردوونگەرێکی مەزن دادەنرێت بەر لەداهێنانی تەلەسکۆپ، ئەو سەرنجو تیروانینانەی زۆر بایەخو گرنگی پیٚ‌دەدرا لەم بوارەدا.

کیپلەر پاش رەبازو لێکۆڵینەوەیەکی قوڵ توانی پەی بەو هەڵانەی خۆیو کۆپەرنیکۆس و تەنانەت تایکۆبراهیشدا بەرێت. ستێرناسە کلاسیکەکان پێیان وابوو کە خولانەوەی ستێرەکان بەدەوری خۆردا بەشێوەیەکی بازنەییە، بەلاٚم‌لەراستیدا خولانەوەی بەشێوەیەکی هێلەییە (ئەهلیلکی Elliptic form) نەك بازنەیی، جاپاش ئەوەی سەری گرێکەی دۆزییەوە چەندین مانگی بە ژمێرکارییەکی ئاڵۆزو سەخت بردەسەر. لەدواییدا توانی پەراوێك لە ساڵی ١٦٠٩ زدا بلاٚوبکاتەوە بەناوی (ستێرناسیی نویٚ)، تیایدا بەشێوەیەکی رێکوپێك دوو قانونەکەی روونو یەکالاٚبکاتەوە دەربارەی جولانەوەی ستێرەکان.

قانونی یەکەم دەدوێت لەسەر ئەوەی کە ستێرەکان لە خولگەیەکی هێلەییدا Elliptic بەدەوری خۆردا دەسورێنەوە، قانونی دووەمیش دەدوێت لەسەر ئەوەی کەستێرەکان تاکو لە خۆر نزیکتر ببنەوە خێراتر دەجوڵێنەوە، لەپاش سیٚ ساڵ قانونی سێهەمیشی بلاٚوکردەوە کە

دەوێت لەسەر ئەوەی ستێرەکان تاکو لە خۆر دوورترین کاتی زۆرتر پێدەچێت بۆ تەواوکردنی خولانەوەیان بەدەوری خۆردا بە ڕێژەی دووجای کاتی خولان بۆ سێجای دووری لەخۆرەوە .

قانونەکانی کیپلەر زۆربەووردی وراستی خولانەوەی ستێرکان بەدەوری خۆردا روون کردوتەوە . زۆر لەکێشە سەرەکییەکانی زانستی گەردونیشی یەکالاکردوتەوە . کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا نەیتوانی ئەوکێشەیە چارەسەر بکات کە دەڵێت بۆچی ستێرەکان هەر لەو خولگانەدا دەسورێنەوە کە دەسنیشان کراوە . ئەم کێشە هەروا مایەوە تالەدواییەکانی سەدەدا ئیسحاق نیوتنی زانا هاتو توانی یەکالای بکاتەوە.

ئەم قانونانەی کیپلەر نوێشکێکی گرنگو دەروویەکی بژۆبوو بۆ دۆزینەوە مەزنەکانی نیوتن . هەتاکو نیوتن ووتبوی :

(ئەگەر من گەیشتبێتمە ئەوەی کە دوورو دوورتر ببینم زیاتر لە کەسانی تر، ئەوا هۆیەکەی ئەوەیە کە من لەسەرشانی مەزنان وەستاوم) .

بێگومان یەکێ لەو مەزنانەی کە نیوتن مەبەستیەتی... کیپلەری زانایە .

○



# پابلۆ پیکاسۆ..

١٨٨١ز - ١٩٧٣ز

**Pablo Picasso**

نیگارکێشێك هەرچەند بلیمەت و زرنگ و پێزان بێت ناتوانێت وێنەیەك بکێشێت لەوێنەی کامێرا ووردتر و جوانتر بێت.

نیگارکێشەکان بۆ زیاتر لەسەدەیەك بەهەوڵ و تێکوشانێکی زۆر بێووچان دەسپێشکەریان دەکرد لە کارکردندا بەئومێدی برینەوەی سنوری کارو بوارێك لە هونەری وێنەدا، جا ئەو هونەرمەندەی کە بوێرترو زیاتر واڵاکارترو کاراتر بوو وە بەکاریگەر بوو لەم ڕیبازەدا (پابلۆ پیکاسۆ)ی بلیمەت بوو.

خەڵکیو هونەردۆستان زۆر حەزو ئارەزوویان بەهونەری پیکاسۆ هەیە لەبەر ئەو خەیاڵە بەپیتو بڕۆو هەستە ناسکەی بەجیهانی دەرەوە. هونەرمەندێکی سەرەکییە لەدامەزرندنی ڕێبازگەی نیگاری خشتەکیەتی Cubism دا. زۆر ناوبانگ بووە بەبلیمەتی لە زۆر لایەن و توانای هونەریدا هەر هەموویش دانبەوەدا دەنێن کە کەسێکی بڵندو هەڵکەوتوو بووە لە هونەرینوێدا. یەکێکە لەو کەڵە والاکارانەی کە گێتی بە دەگمەن دەیانخاتەوە.

پیکاسۆی هونەرمەند زۆر بەتوانابووە لەکێشانی نیگاری ڕیالیستی، هەرجارێك ئارەزووی لەخۆیدا رابیبنیایە. ئەو تەنانەی کە زۆرجار هەڵیدەبژارد دەیشێواند... ڕووکەشی سروشتیی دەگەڕاندەوە شیرازەی خۆی، هەروەکو جارێك ووتبوی: کاتێك ئارەزوو لەنیگارکردنی کوپێك بکەم، وەهای پیشاندەدەم کەکوپەکە بەخری خۆی بنوێنێت، بەڵام گەر بیشێوێنم و پارچەکانی ڕێکخەمەوە، ئەوا لەوانەیە بتوانم کوپەکە وانیگار بکەمەوە لەبەرچاودا شێوەیەکی چوار گۆشەیی بنوێنێت.

زادگای پابلۆ پیکاسۆ شاری (ملکا)ی سەر بە ئەسپانیا یە لە ساڵی ١٨٨١ز، باوکیشی کاتی خۆی هەر هونەرمەند و ئوستادی هونەر بووە، پیکاسۆ لەسەرەتای تەمەنیدا نیشانەی بەهرەی لێوە دیاربووە. زوربەی ژیانی هەر لەفەرەنسادا گوزەران دەکرد.

پیکاسۆ هونەرمەندێکی فرەبەهرەبوو، بەدرێژای ٧٥ ساڵەی ژیانی

وەك هونەرمەندێك نزیکەی سێ‌چارەکە سەدە زیاتر لە ۲۰ هەزار کاری هونەری بەئەنجامداوە بەشێوە و شێوازێکی ڕێك و جوان واتە پێنج‌کاری هونەری لە هەفتەیەکدا، بەم کارە مەزنانەی بووە کابرایەکی بەسامان و دەوڵەمەند، بەڵام لەساڵی ۱۹۷۳زدا ژیانی زێڕینی لەکاروەستاو لەشاری (موژین)ی فەڕەنسادا کۆچی دوایی کرد.

هەرچەندە نیگارکێشان ناخی کارە هونەریەکانیەتی کەچی زۆر واڵاکاری بەدی‌دەکرێت لە تاشینکاریەکانی سەرەڕای نەخشاندنی چەندین دیمەنی سەمای باڵێ و سیرامیك، ژمارەیەکی زۆر لەتاوێرکۆڵین Lithogeaph و وێنەو چەندین هونەرکاری تر.

بەپێچەوانەی هونەرمەندانی‌ترەوە، پیکاسۆ گرنگی ئەدا بە سیاسەت، ئەو بیرە سیاسیانەی بووبوە ڕەنگدانەوەیەك لە تابلۆکانیادا. یەکێ لەو تابلۆ نەمرانەی کە زۆر بەناوبانگە تابلۆی (جۆرنیکا) یە کە جەنگی ناوخۆیی ئەسپانیا پیشان دەدات هەروەها چەندین وێنەی تریشی کە مەبەست‌و کرۆکی سیاسی تیادا هەیە.

زۆر لە هونەرمەندە بەناوبانگەکان ناسراون بەوەی کە شێوازێکی تاکرەوییان هەیە لەکارەکانیاندا بەڵام ئەمە بەسەر پیکاسۆدا ناچەسپێت لەبەرئەوەی‌کە چەندین شێوازی جیاوازی تیادا بەدی دەکرێت بەچەشنێکی هاژ و سەرسام.

پیکاسۆ بەیەکێ لە واڵاکارانی ڕێبازگەی خشتەکیەتی دادەنرێت لەنیگارکێشاندا. هاوبەشی کردووە لەچاکاری و گۆرانکاری نیگاری نوێدا. ڕەنگە نیگارکێشێکی وانەبێت لە مێژوودا بتوانێت وەك پیکاسۆ واڵاکاریی بەئاستێکی باڵای فرەلا لە شێوازەکانیدا لە کارە هونەریەکانیدا بەئەنجام بدات بەڵام لەوانەیشەبپرسین ئایا نەوەکانی دوارۆژ تۆ بڵێیت هونەردۆستی پیکاسۆ بن و حەز بە کارەمەزنەکانی بکەن و چێژی لێوەبگرن هەروەکی ئێستامان؟ یاخود بەرەبەرە لە دوارۆژێکی نزیکدا کاریگەری بەرەو نەمان بچێت !!!

بێگومان ڕوونو ئاشکرایشە کە زوربەی رەخنەگرە هونەریەکانو هونەرمەندە هاوچەرخەکان لەو باوەڕەدان کە کاریگەری پیکاسۆ هەرگیز نانەوێت لەپاشەڕۆژدا. بەلاّم ئەم باوەڕە... هەرچۆنێك بێت مێژووی دوایین بڕیاری لەسەرئەدا.

○



# ماهاڤێرا....

نزیکەی

٥٩٩پ‌ز - ٥٢٧پ‌ز

Mahavira

ڕێبازگەی (جانی‌ی)[١] کە ئایینێکی هیندی کۆنە لەسەردەمی شەشەمی پ‌ز دا سەری هەڵداوە. ئەم ئایینە پێکهاتووە لە ڕەهاکردنی یەزد لەسەر بنچینەیەکی زانیاری‌و باوەڕو جوان ڕەفتاری‌ی. (ڤاردهامانا)[٢] یش کە دامەزرێنەری ئەم ڕێبازگەیە لای جانییەکان ناسراوە بە ماهاڤێرا واتە (پاڵەوانی مەزن). نزیکەی ساڵی ٥٩٩پ‌ز لە باکووری هیند لەدایك‌بووە هەر ئەو ناوچەیشە کە (گۆتامابوزا)ی تیا لەدایك بووە بەڵام بەر لەڤاردهامانا بەنەوەیەك. لەڕاستیدا تەنانەت وێکچوونی مێژووی ژیانیشیان زۆر سەیر و سەرنج ڕاکێشە.

ڤاردهامانا کوڕە بچوکی یەکێ لەسەردارەکانی هیند بووە، لەوپەڕی بەزم‌وخۆشی‌دا دەژیا ئەمیش هەروەك بوزا برباریدا لەو ژیانە خۆشنوودییە خۆی دووربخاتەوە تەواو خۆی بێبەری بکات. ئەوەبوو لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا ژن و منداڵەکەی بەجێهێشت و سەری خۆی هەڵگرت بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیی پاکی‌یدا لەو ماوەیەدا تووشی بوو بە دەستەبرایەکەوە کە پێیان دەووتن (بارسڤاتا)، کەوتە تەرسایی لەگەڵیاندا.

نزیکەی ١٢ ساڵ وێڵ و سەرگەردان بوو بەبیرکردنەوەیەکی زۆر قووڵ و تێڕامان، زۆر جار خۆی دەخستە پارسایی و خۆراگرتن، ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو گوێی نەدەدایە خۆی تەنانەت کاسەیەکی بچووکی نەبوو ئاوی پێ بخواتەوە یان خێری پێ کۆبکاتەوە. تەنها بە سیپاڵێکەوە دەسووڕایەوە پاش ماوەیەکیش ئەو سیپاڵەی لەبەریادا شڕو وڕ بوو تاوای لێهات کە بەتەواوی ڕووت وقووت‌و پێ‌پەتی بێت... مێش و مەگەز لێی بنیشێت بێ‌ئەوەی جووڵەی بۆ بکات‌و لەخۆی دەربکات.

ئەم کارانەی هەموو بۆیە دەکرد تاکو ئازاری تەواو بەخۆی بدات و گیانی پاك‌وڕەوان بێتەوە. بێگومان بەم دیمەنەی دووچاری ڕسوایی‌و سەنگساری[٣] ولێدانێکی زۆر بوو، بەڵام ئەم هەر کۆڵی نەداو هەردانی بەخۆیدا دەگرت بێ‌ئەوەی هیچ وورتەیەکی لەدەم بێتەدەر یان دەست لەکەس بکاتەوە.

ڤاردهامانا ئابەم چەشنە گوزەرانی دەکرد تاگەیشتە تەمەنی ٤٢ ساڵی، لەو تەمەنەدا کەوتە ئەو باوەڕەوە کە ئیتر لەوپەڕی یەزد ڕۆشەنیدایە. بەو باوەڕەوە خۆی گەیانە خەڵك‌و دەستی کردە

مزگێنی‌دان بەبڵاوکردنەوەی ئامۆژگارییەکان. ئەو ئامۆژگاری‌و پەیڕەوانەیشی تارادەیەك دەچێتەوە سەر ڕێبازگەی بوزایی.

جانییەکان لەو بڕوایەدان کەمەردوم کاتێك دەمرێت یەزدی لەپاش بەجیٚ‌دەمێنێت‌و نامرێت، دەچێتە شێوەو ئادگاری[٤]گیانەوەرێکی‌ترەوە، مەرجیش نیە ئەو گیانەوەرە هەر مرۆڤ بێت. جاباوەڕکردن بە گیان‌ڕەوی Transmigration of soul یەکێکە لەو پەلە سەرەکییانە لەڕێبازگەی جانی‌ی‌دا.

جانییەکان زۆر بڕوایان هەیە بە(کارما)[٥] کە ئاکامی خورەوشتی تەواوی کردارەکانی مەردومەوکار دەکاتە سەر بەختی‌و دەیخاتە ژیانێکی ترەوە، سڕینەوەی ئەو بەدکارییانەی کە لە گیانێکی شەڕانیدا هەیە، خۆپاکردنەوە لەم گیانە شەڕانیەیش یەکێکە لەو ئامانج و ئاواتانەی ئاینی جانی‌ی. هەروەك ماهاڤیرایش دەڵێت: (گیانی بێگەرد چنگ دەکەوێت گەر وازبهێنرێت لە خۆشنوودی و چێژی ژیان).

جانییە ڕەبەنەکان جۆرە خۆڕاگرتنێکی زۆر تایبەت‌و سەیر بەکاردەهێنن لەژیانیاندا کە یەکێکە لەو بڕواو نەریتە دیاردانەی پەیڕەوی دەکەن ئەویش پی‌ی دەڵێن (ئاهێزما) واتە (داهێزی یان ناتوندی). ئەم بڕوایە بریتی‌یە لە بەکارنەهێنانی هێز لەگەڵ گیانەوەرەندا و هەتاوەکو مرۆڤیش، لەمەوە وادەردەکەوێت کە جانییەکان گۆشت خۆرنەبن بەڵکو ڕووەك خۆربن. ئەوانەی کە زۆر توند باوەڕن (پەرگرن) مێروو ناکوژن، لە تاریکاییشدا خۆراك ناخۆن نەوەك مێروویەك بەخۆراکە کەوە بێت‌و پەی پی‌نەبەن بیخۆن و ببێتە هۆی مردنی‌ئەو گیاندارە (واتە مێرووەکە)، لەبەر ئەوە زۆر لەو پەرگرانە ناچارن خەڵك بەکریٚ بگرن و لە کاتی پیاسەیاندا بەسەر ڕی‌و جادەکاندا بەردەمیان گسك بدەن‌و

پاکی بکەنەوە نەوەك مێروویەك بکەوێتە ژێر پێیانەوەو بکوژرێت.

هەرچەندە ئەو هەرێمانەی کە جانییەکان تیایدا دەژین زەنوێر و کشتوکاڵین کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا بەگوێرەی رێبازگەکەیان کشتیاری‌ی لایان ناڕەوایە لەبەر ئەوە هەر خەریکن بەبازرگانییەوە.

رێبازگەی جانی‌ی زۆر کاریگەر بووە بۆسەر رێبازگەی هیندۆکی، ئەمانیش بەهیچ جۆرێك رێنادەن بەسەربڕینی گیانەوەر.

بڕوای ئاهێزما زۆر کاریگەرو بەکاربوو بۆسەر غاندی لە سەربەخۆیی هیندا... ئەو ئامۆژگارییانەی لەیەکێ لە فەیلەسوفە جانییەکانەوە وەردەگرت، دایشی نابوو بە ئوستادێکی گیانی بەگیانی خۆی.

---

(١) جانی‌ی: گیانی‌ی.

(٢)ڤاردهامانا : فەرهاد : خێر هێنەری زۆر

(٣)سەنگساری : بەرد باران

(٤)ئادگار : رواڵەت

(٥)کازما : قەدەر (ووشەیەکی هیندییە)

" وەرگێر "



# نیلزبۆر...

١٨٨٥ ز - ١٩٦٢ ز

Niels Bohr

زانای مەزن (نیلز هێنریك داڤید بۆر) سەرکاری بیردۆزەی پێکهێنانی گەردیلە Atomic Structure، ساڵی ١٨٨٥ ز لەشاری کۆپنهاگن لەدایك بووە. ساڵی ١٩١١ ز دکتۆرانامەی فیزیکی لەزانکۆی کۆپنهاگن دا وەرگرت، پاشان چووە زانکۆی کامبورج تاکو لە ژێر چاودێری زانای ئینگلیزیدا تۆمپسۆن کاربکات... ئەو زانایەی کە ئەلەکترۆنی دۆزییەوە. ئینجا چوو بۆ مانشستەر، لەوێش لەگەڵ ئێرنست ڕازەرفۆردا کەوتەکار کە ئەمیش پێش چەند ساڵێك ناووکی گەردیلەی دۆزییەوە.

رازەرفۆرد بەپێچەوانەی بیروڕای جاران پێشنیاری ئەوەی دەکرد کە گەردیلە ناووکێکی قورسی لەناوەڕاستدا هەیەو ئەلەکترۆنەکانیش لە دەرەوەی ناووکدان. لەم تێڕوانینەوە دەسبەجێ بۆر بیردۆزە نوێکەی هێنایە کایەوە دەربارەی پێکهێنانی گەردیلە.

بۆر دەیگوت: گەردیلە لەبارێکی خنجیلانەدا لە ڕژێمی خۆر دەچێت، ئەلەکترۆنەکان لە خولگەکانیاندا دەسووڕێنەوە بە دەوری ناووکە قورسەکەیدا ...... «هەر وەك خۆر ئاسا» بەڵام لەگەڵ بوونی جیاوازییەکی ساکاردا ئەویش ئەوەیە کە ئەستێرەکان بە قەوارەیەکی جیاواز بە دەوری خۆردا دەسووڕێنەوە بەڵام ئەلەکترۆنەکان بە قەوارەیەکی تایبەت و دیارکراو بەدەوری ناووکدا دەسووڕێنەوە. هەر خولگەیەکیش لەو خولگانەی ئەلەکترۆن ووزەیەکی خۆی هەیە، جا کە ئەلەکترۆنێك باز بدات لە خولگەیەکەوە بۆ خولگەیەکی‌تر ڕۆشناییەکی شەپۆلداری لێوە دەردەپەڕێت کە یەکسانە بە گۆڕان لە ووزەیدا و دابەشکراو بەسەر جێگری پلانکدا.

$$\frac{\text{گۆڕانی ووزە}}{\text{جێگری پلانك}} = \text{شەپۆلی ڕۆشنە دەرپەڕیو.}$$

ئەو بیردۆزەی بۆر دردانێك‌بوو بۆ بیرەفیزیکە کلاسیکەکان. زانایانی وەك ئەنشتاین پێشوازییان لەو بیردۆزەی‌کردو بەدەسکەوتێکی بەرزی زانستیان دانا. هەرچەندە هەندێك لە زانایانی تر گومانیان لەراستی بیردۆزەکەی هەبوو بەڵام لەدواییدا هەر جێی خۆی کردەوەو پەسەندکرا. لەساڵی ١٩٢٢ زیشدا خەڵاتی نۆبڵی لە فیزیکدا پێبەخشرا.

ساڵی ۱۹۲۰ ز لە کۆپنهاگن ئامۆژگای فیزیکی بیردۆزە کرایەوە و بۆر بووە سەرپەرشت‌و بەڕێوەبەری ئەو ئامۆژگایە، لەو ماوەیەدا زۆر لەزانا لاوەکانی لە خۆی گردکردەوە و هەر بەزوویش ئەوئامۆژگایە بووە یەکێ لە مەڵبەندە پێشەنگەکانی زانستگەریی.

بۆر کۆسپێکی تر هاتە ڕێی بیردۆزەکەی ئەویش ئەوەبوو ئەو تاقیکردنەوانەی کەلەسەر گەردیلەی هایدرۆجین بەئەنجامی دا کە یەك ئەلەکترۆنی تێدایە بەسەرمادەی تردا ناگونجێت‌و ئەنجامی تەواو نادات بەدەستەوە. زاناکان چاوەڕێی ئەوەبوون کە بۆر هەستێت بەڕاستکردنەوەی ئەم بیردۆزەیەی بەڵام.... نەیتوانی. ئەو کۆسپە هەروا مایەوە تاکو توانرا لەلایەن زانای مەزنەوە ڤێرنەر هایزنبێرگ چارەسەر بکرێت، جا هایزنبێرگ کە لە کۆپنهاگن بوو توانی سوود لە ئاخاوتنە زانستەکانی بۆر وەربگرێت، بێگومان ئەمیش زۆر پێشوازی لەبیرەتازەکانی هایزنبێرگ کرد و زۆر لای پەسەند بوو.

ساڵی ۱۹۳۰ز زۆر بە زرنگی سەرنجی‌دایە سەر پێکهێنانی ناووك وتوانی لەم بوارەدا بیرکی ناووکی ئاوێنە پەرەپێبدات لە کارلێکە ناووکیەکاندا. بۆر یەکەم کەسێك بوو پێشنیاری ئەوەی کرد کە زرتوخمی[1] یۆرانیۆمی تیشکدەر بریتی‌یە لە ۲۳۵، هەر ئەم زرتوخمەیەیشە کە هەڵدەستێت بە کرداری گەردیلە پەرتێن Atomic Fission، ئەم پێشنیارە مەزنە لەدواییدا بایەخێکی زۆری پێدرا لە دروستکردنی بۆمبای گەردیلەیی.

(۱) زرتوخم: نظير العنصر: Isotope.

## خشتەی یەکەم

### ناودارانی ئەم پەڕاوە لە کوێوە هاتوون

| ناوچە | ژمارەیان | کیشوەر |
| --- | --- | --- |
| بەریتانیای مەزن . | ١٨ | |
| ئەڵەمانیا، نەمسا . | ١٤ | |
| فەرەنسا . | ١١ | |
| ئیتالیا . | ٠٩ | |
| یۆنان . | ٠٥ | |
| ئەسپانیا . | ٠٤ | |
| وولاتانی تری ئەورووپا . | ١٠ | |
| | ٧١ | ئەورووپا |
| وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا | ٠٧ | |
| ئەمەریکای باشوور . | ٠١ | |
| | ٠٨ | ئەمەریکا |
| ئەفریقا . | ٠٣ | ئەفریقا |
| چین . | ٠٧ | |
| هیند . | ٠٢ | |
| مەنگۆلیا . | ٠١ | |
| ئاسیای خۆرنشین . | ٠٧ | |
| | ١٨ | ئاسیا |

## " خشتەی دووەم "

**ناودارانی ئەم پەڕاوە بەگوێرەی دەرکەوتنیان لەمێژوودا**

| سەردەم | ژمارەیان |
| --- | --- |
| ٦٠٠ پ.ز | ٣ |
| لە ٦٠٠ بۆ ٢٠١ پ.ز | ١٣ |
| لە ٢٠٠ پ.ز – ١٤٠٠ز | ١٦ |
| سەدەی پانزەهەمی زایینی | ٠٤ |
| سەدەی شانزەهەمی ز | ٠٨ |
| سەدەی حەڤدەهەمی ز | ١٠ |
| سەدەی هەژدەهەمی ز | ١٢ |
| سەدەی نۆزدەهەمی ز | ١٩ |
| سەدەی بیستەمی ز | ١٥ |
| کۆ ..................... | ١٠٠ |

## " خشتەی سێهەم "

**ناودارانی ئەم پەڕاوە لە بواری کاریگەرییاندا**

| بواری کاریگەرییان | ژمارەیان |
| --- | --- |
| داهێنان و زانستەکان | ٣٧ |

| | |
|---|---|
| سەرکردە سەربازی و سیاسیەکان . | ٣٠ |
| فەیلەسوفە دوور لە ئاینیەکان | ١٤ |
| پێشەوا ئاینیەکان. | ١١ |
| هونەرمەند و نووسەرەکان. | ٠٦ |
| زەمین دۆزەکان . | ٠٢ |
| کۆ ............................ | ١٠٠ |

دکتۆر مایکڵ هارت سەد کەسی تری سەربژێر کردووە بەپێ ئەوەی بایەخ بدات بەشیرازەی کاریگەرییان، بەڵام لەنێویاندا دەکەسی بەڕیز هەڵبژاردووە بەگوێرەی گرنگییان لەمێژوودا .

ناوی ئەو سەد کەسەیش ئەمانەن :-

١. ئیبراهیم (د. خ) .
٢. ئیزۆب .
٣. هیوارد ئیکۆن .
٤. سۆزان ئەنتۆنی .
٥. قەشە تۆما ئەکوینی .
٦. ئەرخەمیدس .
٧. ئەرەستۆ سامۆسی .
٨. نیڵ ئارمسترۆنگ .
٩. شارڵس پاپاج .
١٠. جیرمی پنتام .
١١. ئۆتۆفون پسمارك .
١٢. روبەرت بۆیڵ .
١٣. لویس بروکلی .
١٤. نیکۆلاێ سادی کارنۆت .
١٥. شارلی پینجەم .
١٦. خوفو .
١٧. شو هی سی .
١٨. ونستن چەرچل .

١٩. كارلْ ڤۆن كلاوسفتس .
٢٠. رۆدۆلف كلاوسفتس .
٢١. ماری کۆری .
٢٢. کۆتلیب دملەر .
٢٣. دانتی ئەلیگێری .
٢٤. داریوش یان دارای مەزن .
٢٥. پاشا داود .
٢٦. دیموقریتس .
٢٧. ماری باکار ئیدی .
٢٨. رۆبەرت ئایتینجەر .
٢٩. هێنری فۆرد .
٣٠. جۆرج فۆکس .
٣١. پنجامین فرانکلین .
٣٢. فریدریکی مەزن .
٣٣. پیتی فرایدن .
٣٤. گالین .
٣٥. مهاتما گاندی .
٣٦. کارلْ فریدریك کواس .
٣٧. حامورابی .
٣٨. هان ئۆتی .
٣٩. جۆرج ولیەم فریدریك هیگلْ .
٤٠. هێنری هەشتەم .
٤١. هێنری سەروان – کەشتیەوان –

٤٢. تیۆدۆر هەرتزل .
٤٣. ئەپۆقراتس .
٤٤. تۆماس هۆپس .
٤٥. جێمس هۆتۆن .
٤٦. ئەخناتون .
٤٧. ئەشعەیای پێغەمبەر (د. خ) .
٤٨. جان دارك .
٤٩. جۆزیف مێری جاکورد .
٥٠. عەمانۆیل کانت .
٥١. جۆن ماینرد کینز .
٥٢. هارکۆ بندخورانا .
٥٣. مارتن لۆثەرکینگ .
٥٤. ئەڵفرید کنزی .
٥٥. قوبڵای خان .
٥٦. جۆنفرید ولیەم ڤون لابنتس .
٥٧. ئاینینی لینۆر .
٥٨. لیۆنارد داڤنشی .
٥٩. ئەبرەهام لەنکۆڵن .
٦٠. لیۆبانج (هان کاو تسو) .
٦١. لویسی شانزەم .
٦٢. جێمس مادیسۆن .
٦٣. فرناند ماجلان .
٦٤. ماری ئاڵڤرجینیا .

٦٥. بێجی تینۆ (ئیمپراتۆر میتسۆ هیتۆ .
٦٦. سوڵتان موحەممەدی دووهەم .
٦٧. مونتسکیۆ .
٦٨. ماریا مۆنتۆری .
٦٩. سەمۆئێل مۆرس .
٧٠. وڵفینگ ئامادیۆس مۆزارت .
٧١. معاویەی کوری ئەبوسوفیان .
٧٢. جیرارد ئونێل .
٧٣. پلامی پاسکاڵ .
٧٤. ئیڤان پاڤلۆف .
٧٥. مارکۆپۆلۆ .
٧٦. پەتلیمۆس .
٧٧. فیساغۆرس .
٧٨. رمبراندت .
٧٩. فرانکلین رۆزفلت .
٨٠. سینکارا .
٨١. سەرجۆنی ئەکەدی .
٨٢. ئەرڤین شرۆدینگەر .
٨٣. ولیەم شۆکلی .
٨٤. جۆزیف سمیت .
٨٥. سۆقرات .
٨٦. سۆفۆکلیس .
٨٧. سون یاک سین .

٨٨. ولیەم هێنری فۆکس تاڵبوت .
٨٩. تەیموری لەنگ .
٩٠. تانك تای تسونگ .
٩١. ئەدوارد نیلۆر .
٩٢. هێنری داڤید نۆردی .
٩٣. لیۆ توڵستۆی .
٩٤. چارڵس تونس .
٩٥. هاری ترۆمان .
٩٦. سلێمان وکسمان .
٩٧. جێمس واتسۆن .
٩٨. ماری ڤۆڵستۆ نکرانت .
٩٩. فرانك لۆیدرایت .
١٠٠. ڤلادیمێر زفۆریکین .

## ناوی ئەو دە کەسەی کە هەڵبژێراون لەنێو هەزار کەسدا :-

١. تۆماس ئەکۆنیاس ١٢٢٥ – ١٢٧٤ز مێژخاسێکی دیانی .
٢. ئەرخەمیدس ٢٨٧ – ٢١٢ پ ز بیرکارزانێکی یونانی .
٣. چارلس پاپابینج ١٧٩٢ – ١٨٧١ز کۆمپیوتەرزان، پێش کار بووە لە کۆمپیوتەرزانیدا .
٤. پاشا خۆفۆ لەسەدەی ٢٦ پ ز ژیاوە دروستکەری ئەهرامەکانی میسرە .
٥. ماری کۆری ١٨٦٧ – ١٩٣٤ز دۆزەری ڕادیۆم .
٦. بنجامین فرانکلین ١٧٠٦ – ١٧٩٠ز لەکارەبا وبروسکەدا .
٧. مهاتما گاندی ١٨٦٩ – ١٩٤٨ز سەربەخۆیی هیند .
٨. ئەبرەهام لنکولن ١٨٠٩ – ١٨٦٥ز لە ئازادکردنی کۆیلە .
٩. فرناند ماجەلان ١٤٨٠ – ١٥٢١ز خڕیی زەوی سەلماند بەگەڕان بەدەوریدا .
١٠. لیۆناردۆ داڤنشی ١٤٥٢ – ١٥١٩ز نیگارکێش و فەرهەنگزان[١] .

---

(١) فەرهەنگزان: عالم موسوعي.

## ناوەڕۆك

سوپاس بۆ :
• مامۆستای هونەرمەند کاك ئەنوەر قەرەداغی بۆ وێنەگرتنی ناودارەکان

● مامۆستا هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان (خاوەن پرۆژەی هاوسەر) .
بۆ لە چاپـدان وبـڵاوکـردنـەوەی ئەم کتێبـە (١٠٠ نـاودار) چاپی دووەم
وێنەیان زۆربێت .

## پرۆژەی هاوسەر

بۆ لەچاپدانو بڵاوکردنەوە

خاوەن پرۆژە : (هۆشیار محەممـەدعەزیز قەفتان )ە

سلێمانی ـ شەقامی حەمدی تەلەفۆن ٢١٦٢٥
٢٢٩٦٢

## لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر

١ ـ گەنجینەی دێرین ـ عبدالله کوردی •

٢ ـ بانگەوازێك بۆ ڕووناکبیرانی کورد لـــە پێنــاوی کۆکردنەوەو زیندوکردنەوەی کەلەپوری کوردیدا ـ عبدالرقیب یوسف •

٣ ـ دیوانی عارف عورفي ـ ئومێد کاکە ڕەش •

٤ ـ دیواني حیلمي ـ ئومێد کاکە ڕەش •

٥ ـ ئاوارەکان ـ عومەر حەسەن دەوڵەت •

٦ ـ ناوی کوردی نوێ ـ هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

٧ ـ مفکرة الوطن ١٩٨٧ « عەرەبیو ئینگلیزی » ـ هۆشیار محەممــەد عەزیز قەفتان •

٨ ـ مذکرة الوطن ١٩٨٧ ( کوردیو عەرەبیو ئینگلیزی ) ـ هوشــیار محەممەد عەزیز قەفتان •

٩ ـ ڕۆژژمێری هاوسەر بۆ ساڵی ١٩٨٧ ـ هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

١٠ـ مفكرة الوطن ١٩٨٨ ( عەرەبیو ئینگلیزی ) ـ هوشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

١١ـ ڕۆژژمێری هاوسەر بۆ ساڵی ١٩٨٨ ـ هوشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

١٣ـ وێنەی کچە کوردێك •

١٤ـ وێنەی شاری سلێماني •

١٥ـ وێنەیەکی هاوینە هەواری ( سەرچنار ) •

١٦ـ وێنەیەکی شاری سلێمانی •

١٧ـ وێنەیەکی شاری سلێمانی •

١٨ـ وێنەیەکی کوردستان •

١٩ـ وێنەیەکی شاری سلیمانی ( قەرەداغ ) •

٢٠ـ وێنەیەکی شاری سلێمانی •

٢١ـ لون وارسم والعب ( ژمارە ٥ ) ـ هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

٢٢ـ لون وارسم والعب (ژمارە ٦) ـ هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

٢٣ـ لون وارسم والعب (ژمارە ٧) ـ هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

٢٤ـ لون وارسم والعب (ژمارە ٨) ـ هۆشیار محەممەد عەزیز قەفتان •

٢٥ـ خۆراكو هونەری چێشت لێنان ـ هوشیار قەفتانو عبدالرحمن رؤوف الصراف •

٢٦- مفكرة الوطن ١٩٨٩ ( عەرەبیو ئینگلیزی ) - هۆشیار محەمەد عەزیز قەفتـان .

٢٧- مذكرة الوطن ١٩٨٩ ( کوردیو عەرەبیو ئینگلیزی ) - هوشیار قەفتـــان .

٢٨- رۆژژمێری هاوسەر بۆ ساڵی ١٩٨٩ - هوشیار قەفتان .

٢٩- رۆژژمێری دیوار بۆ ساڵی ١٩١٩ - هوشیار قەفتان .

٣٠- کلغەزی دیاری - ( وێنەی چەند گولێك ) .

٣١- کلغەزی دیاری - ( [illegible]نەی [illegible] غرەفەی ئیسلامی ) .

٣٢- کاغەزی دیاری - ( و[illegible] مر[illegible] ماوس ) .

٣٣- کاغەزی دیاری ( و[illegible]ی تۆ [illegible] بیلی [illegible]ۆژو نوێ ) .

٣٤ ـ دەفتەری (الجیب والکلمات).
٣٥ ـ کاغەزی دیاری (چەند وێنەیەك).
٣٦ ـ کاغەزی دیاری (هەمە چەشن پەپولە).
٣٧ ـ کاغەزی دیاری (هەمەچەشن باڵندە).
٣٨ ـ (دەفتەری تەلەفۆن).
٣٩ ـ مفكرة الوطن ١٩٩٠ (عەرەبیو ئینگلیزی) ـ هۆشیار محەممەد عەزیز.
٤٠ ـ مذكرة الوطن ١٩٩٠ (کوردیو عەرەبیو ئینگلیزی) ـ هۆشیار محەممەد عەزیز.
٤١ ـ رۆژژمێری هاوسەر ١٩٩٠ ـ هۆشیار محەممەد عەزیز.
٤٢ ـ دیوانی سەلام (چاپی دووەم) ١٩٩٠ ـ ئومێد کاکە رەش.
٤٣ ـ تقويم الوطن ١٩٩٠ ـ هۆشیار محمد عزيز.
٤٤ ـ لون وإرسم والعب ٩ ـ هۆشیار محمد عزيز.
٤٥ ـ لون وإرسم والعب ١٠ ـ هۆشیار محمد عزيز.
٤٦ ـ لون وإرسم والعب ١١ ـ هۆشیار محمد عزيز.
٤٧ ـ لون وإرسم والعب ١٢ ـ هۆشیار محمد عزيز.
٤٨ ـ (١٠٠ ناودار) ـ ئەسعەد قەرەداغي.

**کورتەیەك لەژیانی دانەر**

* دکتۆر مایکل هارت ئەمەریکی نەژادە و هەر لەوێش لە دایك بووە .
* ساڵی ١٩٥٢ز لە زانکۆی کۆرنێل لیسانسی لەبیرکاریدا وەرگرتووە .
* ساڵی ١٩٥٨ز لە زانکۆی نیویۆرك لیسانسی لە قانون دا وەرگرتووە .
* ساڵی ١٩٦٩ز لە زانکۆی ئەدیلفی پلەی ماجستێری لەزانستەکاندا وەرگرتووە .
* ساڵی ١٩٧٢ز لە زانکۆی برینستۆن پلەی دکتۆرای لە گەردوونناسی دا وەرگرتووە .
* لە مەڵبەندی زانستگەریەکانی ئاسمانی دا لە شاری (گرین بێلت - مێریلاند) دا کاری کردووە، هەروەهایش لە مەڵبەندی نیشتمانی لەزانستگەری چینەکانی کەش دا کاری کردووە .
* لەگەورەترین ڕوانگەی گەردوونناسی دا (ڕوانگەی هێل) لە شاری پاسادینا - کالیفورنیا دا کاری کردووە .
* یەکێکە لە زانا باوەڕپێکراوەکان لەبواری فیزیکسی کارپێکردندا .
* ئەندامە لە چفاتی گەردوونناسی دا، بەلقەکانیەوە لە بواری هەسارەناسی دا (علم الكواكب) .
* ژنی هێناوە و دوو زارۆڵەیشی هەیە .

لە بڵاوکراوەکانی نووسەر کە ئامادەیە بۆ چاپ

*** توخمەکان**

پەراوێکی مێژوویی و ڕۆشنبیری و زانستییە دەربارەی توخمەکانی سروشت

*** زاراوەکانی هونەری مۆسیقا**

لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر (٤٨)

سلێمانی - شەقامی حەمدی

نرخی (...) دینارە   رقم الأيداع في المكتبة الوطنية ٨٥٧/١٩٨٧

چاپخانەی (الأديب البغدادية)